میلان کۆندێرا

# ئاهەنگی ماڵئاوایی

رۆمان

وەرگێڕانی لە فارسییەوە

رەووف بێگەرد

سلێمانی 2003

**زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**
**کتێبی سەردەم ژمارە** (209)

**سەرپەرشتیاری گشتی**

**ئازاد بەرزنجی**

# ئـــــاهەنگی مـــاڵئــــــاوایی

**نووسینی: میلان کۆندێرا**

**وەرگێڕانی: ڕەووف بێگەرد**

**بابەت: ڕۆمان**

**دەرهێنانی هونەری: شیروان تۆفیق**

**مۆنتاژی کۆمپیوتەری : سەیران عەبدولرەحمان**

**هەڵەچنی چاپ : مهاباد ڕەحیم**

**تیراژ: 500 دانە**

**ژمارەی سپاردن : 537 ی 2002**

www.sardam.net

# پێشەکی

میلان کۆندێرا لە ڕۆماننووسە هەرە ناودارەکانی ئەمڕۆی دنیایە، ساڵی 1929 لە شاری برنۆی چیکۆسلۆڤاکیا لەدایکبووە. باوکی (لودڤێك کۆندێرا) پیانۆژەن و لە مۆسیقازانە ناودارەکانی ئەو سەردەمە بووە. کۆندێرای لاویش مۆسیقای خوێندووە، لە ئەکادیمیای مۆسیقاو هونەرە درامییەکانی پراگ خوێندنی تەواو کردووەو هەر لەوێدا بووە بە مامۆستای فیلمسان، بەڵام وردە وردە ڕووی لە نووسینی شیعر و کورتە چیرۆك، شانۆنامەو ڕۆمان کردووە. یەکەمین دیوانە شیعری بەناوی (**مرۆڤ- باخچەیەکی بەرین**-1953)و یەکەمین شانۆنامەی بەناوی (کلیلدارەکان- 1962)و یەکەمین ڕۆمانیشی (**گاڵتە** 1967) بڵاوکردۆتەوە، کۆندێرا لە ماوەی ساڵانی 1948-1970دا دووجار بۆتە ئەندامی پارتی کۆمۆنیستی چیك و هەردووجارەکە دەرکراوە، لەدوای ساڵی 1968 ەوە کە سۆڤیەت وڵاتەکەی داگیرکردو ڕژێمی ستالینی دەسەڵاتی سەربازی و ئایدیۆلۆژی بەسەر چیکۆسلۆڤاکیادا سەپاند کۆندێرا سەر سەختانە بەرەنگاری کردن، ڕەخنەی لەو حیزب و گروپانە گرت کە بە هەر بیانوویەکەوە یارمەتی هاتنی ئەو لەشکرەی داوە یان بانگەشە بۆ مانەوەی دەکات.

ئیتر بەرهەمەکانی بەتەواوی قەدەغەکراو خۆیشیان لەسەرکار لابرد. ساڵی 1975 لەگەڵ (ڤیرا)ی هاوسەریدا بەیەکجاری وڵاتی جێهێشت و ڕووی لە پاریس کرد، لە زانکۆی رینس تا ساڵی 1978 وانەی وتەوەو تائێستایش هەر لە فەرەنسادا دەژی. لە ڕۆمانە هەرە ناودارەکانی کۆندێرا: (**ژیان لە شوێنێکی ترە** 1969) ساڵی 1973 خەڵاتی باشترین ڕۆمانی دەرەوەی لە فەرەنسادا وەرگرت. **ئاهەنگی ماڵئاوایی** 1972 ساڵی 1978 خەڵاتی (**پرمیۆ موندیلۆ**)ی ئیتاڵی وەرگرت. **سووکەڵەیی بەرگە نەگیراوی بوون** 1984. پێکەنین و لەبیرچوونەوە 1981 خەڵاتی (**کومونویس ئوارد**)ی وەرگرت.

ساڵی 1983 پلەی دکتۆرای فەخری زانکۆی میشیگانی درایە.

کارەکانی میلان کۆندێرا تۆنێکی ئیروتیزمی گاڵتە جاڕیان تیایە و تەنیا لە دیدی سیاسی و مێژووییەوە تەماشا ناکرێن، بەڵکو دەتوانین لە ڕوانگەی قەیرانی ڕۆحی مرۆڤی ئەم سەردەمەوە -بەتایبەتی مرۆڤی ئەوروپایی– لێی بڕوانین، کاتێك کە مرۆڤ بێجگە لە خۆپەرستی و هۆکارە تاك ڕەهەندییە تایبەتی و حاڵەتە دەروونی و بۆچوونە چرکەساتیەکان زیاتر چیتر نابینێت و، تەنیا بیر لە ژیان و مانەوەی خۆی و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی دەکاتەوە. ئەمە ئەوکاتەیە کە خۆشەویستی و سۆزە ئینسانییەکانی لە مەترسی و کەم بوونەوە و لەناوچووندان و، ئەو جۆرە کاراکتەرانەیش پراکتیزەی دەکەن کە دەشێت بەخۆیان نەزانن. کاری کۆندێرا لەم ڕۆمانەدا لەسەر تاکەکان وەك کاری پزیشکێکی توێکارەوایە، ئەو نە وەك فەیلەسوف و نە وەك مێژوونووس کارناکات، تەنیا ڕۆماننووسێکە کە بوون و دەروونی مرۆڤەکانی شیدەکاتەوەو دژایەتییەکانیان دەردەخات و بە قووڵی سۆراخی پەناو پەسێوەکانی دەکات، هێند ڕووتیان دەکاتەوە تا ڕادەی شەرم لە خۆنەکردن و بێ دەربەستیان. تەنانەت لەسەر ئاستی مەسەلە هەرە گرنگەکانی ژیان کە پەیوەندییان بە

هەڵوێستی سەخت و ئاکاری ئەو کاراکتەرانەوە هەیە لەناو گێژەنی ڕووداوو تراژیدییە هەرە حەساسەکاندا.

لەم ڕۆمانەدا، کۆندێرا بە پێچەوانەی هەردوو ڕۆمانی **گاڵتە و ژیان لە شوێنێکی تردا** کە باس لە دەوری ستالین و بەهاری پراگ و داگیرکردنی وڵاتەکەی دەکات لەلایەن شۆرەوییەوە، دەست ناخاتە سەر سیستمێکی سیاسی دیاریکراو ئەوەندەی دەست لەسەر تراژیدیا ئینسانییەکان دادەنێت و تاکەکان هەڵدەوەشێنێت. هەموو دیاردە و چالاکیەکان دەخاتە ژێر پرسیارەوە، گومان لەو کردانەی ڕواڵەتیان درەوشاوەو ناوەوەیان پۆخڵە، کاراکتەرەکان لە دنیایەکی دوالیزمیدا سەرگەردانن، چەندە مرۆڤ دۆستن ئەوەندەیش شەڕئەنگێزن، چەندە ئیرۆسین ئەوەندەیش بکوژن، نە گریانیان تا سەرەو نە پێکەنین، ڕێکەوت و گۆڕانە دژ بە یەکەکانیش وەك کاری تەکنیکی هێندە خێران کە مایەی سەرسووڕمانی خوێنەرە لە بەهرەی نووسەرەکەی. خوێنەر لەبەردەم ئەو پرسیارانەدا هەمیشە لە ڕاچەنین و سەرسامیدایە. چونکە هەندێك لەو دیاردانە کە سروشتی مرۆڤەکانی بەرهەمی دێنێت دوورە لە لۆژیکی ژیان و تەنیا لۆژیکی هونەر توانای قەناعەت پێکردنیانی پێیە. کۆندێرا لە چاوی ڕێژە گەراییەوە لە هەموو ئاکارو هەڵوێستەکانی مرۆڤ دەڕوانێت و مامەڵە کردنیش لە گەڵیاندا هەر بەو ئاقارەیە، ئەو نایەوێت هیچ بسەلمێنێت و ڕایەکی بنەبڕی لەسەر بدات. بەڵکو دەیداتە دەست ئەو ئەنگێزانەی کە مەیل و ئارەزووە تایبەتییەکانی مرۆڤ دەیانجوڵێنێت و ڕێکەوتە نەگونجاوەکان بەیەکتر دەگەیەنێت، کە زۆربەیان لە خۆیانەوە دێن و لە ناوەندی بەسەرهاتدا قوت دەبنەوە.

شوێنی ڕووداوەکانی نێو ئەم ڕۆمانە شارۆچکەیەکی دوورە کە ئاوی کانزایی تیایەو نەخۆش بۆ چارەسەرکردن ڕووی تێدەکات. زۆربەی

نەخۆشەکان ژنی نەزۆکن و هەندێك پیاویش کە نەخۆشیی دڵیان هەیە. تەوەری کارەکەیش هەوڵێکە بۆ پاراستنی ڕەگەزو نەوەخستنەوە، ئەم تەوەرە لە ڕێگای کارەکتەرەکانەوە لەبەردەم کێشەی قبووڵکردن و ڕەتکردنەوەدایە.

دکتۆر سکریتای پزیشکی ژنان مەبەستیەتی دریژە -**بەهاو مانەندیی**- بدات و ژیان لە ڕێرەوە ئاساییەکەی خۆی نەکەوێت. بۆیە لە شێوازێکی پزیشکیانەی پڕ لە فانتازیادا توانای منداڵبوون بە ژنە نەخۆشەکان دەبەخشێت کە نەزۆکی زۆربەیان لە پیاوەکانیانەوەیە، ئەو منداڵانەیش کە لەو ژنانە دەبن لە خودی دکتۆر دەچن، چونکە بەلای ئەوەوە سەدەی بیست نەوەیەکی هاوچەشنی گەرەکە تا هەست بە ئارامیی و ئاسوودەیی بکەن. واتا لە سەری دکتۆردا گیانێکی دنیا گۆڕین هەیە، بەڵام بەپێی بۆچوونێك کە مەرج نییە هەموو کەسێك بەڕاستی بزانێت.

لەم لایشەوە یاکوب هەیە کە بڕوای بەو بەها باوانە نەماوە و تا سەر ئێسقان نائومێدو نەهلیستیە. ئەم کەسە لە ئەنجامی تێکشکانێکی ئایدیۆلۆژییەوە کە ماوەیەکی زۆر ژیانی خۆی بۆ تەرخان کردووەو لە پێناویا گەیشتۆتە کەناری مردن، تووشی ڕەشبینی هاتووەو هەموو ئاواتێکی لە خۆدزینەوەی ئەرك و دەربازبوونی لە وڵاتەکەیدا دەبینێت. بێ ئەوەی هیچ شوێنەوارێك لەدوای خۆیەوە بەجێبهێڵێت. یاکوب بە چاوی سووك لە چالاکییە مرۆڤییەکان دەڕوانێت، بە پێچەوانەی دکتۆر سکریتاوە بڕوای بە نەوە خستنەوە نییە، وا بیردەکاتەوە کە منداڵ لەناو کۆمەڵدا تەنیا گەوجی و دەبەنگی بەدەست دێنێت. خۆ ئەگەر شتێکی لەوە باشتر بێت ئەوە مل لە چەقۆ دانەو ئەنجامەکەی یان زیندانە یان مەرگ یان ڕسوایی.

یاکوب هەڵوێستێکی یەك لاکەرەوەی لەسەر کۆمەڵگا هەیەو بەو مێگەلەی دادەنێت کە بەرهەمهێنی شەڕو پیاوکوژانە، کەچی لە ئەنجامدا، بێ ئەوەی بە

خۆی بزانێت ئەویش دەڕواتەوە ناو مێگەلەکەو دەبێتە یەکێك لە بکوژەکان، بێ ئەوەی هیچ هۆیەکی سیاسی یان ئابووری یان مەبەستێکی تایبەتی لە دوای کارەکەیەوە هەبێت. ئەو خۆی وای لێکدەداتەوە (**کە یارییەکی بێ ئەنجامە وەك ژیانی خۆی لە وڵاتەکەیدا**) ئەمەیش کرۆکی بیرە پووچگەرایەتیەکەیەتی.

یاکوب هێدمە سیاسییەکەی هێند کاریگەر و بەهێزە تەنانەت نکۆڵی لە بەها ئاکارییەکانیشە و، بێ دەربەستانە پێشێلیان دەکات. (ئۆلگا) کچی هاوڕێیەکیەتی کە لە لایەن ڕژێمەوە لە سێدارە دراوەو ئەم ئۆڵگای وەك کچی خۆی بەخێوکردووە و دەستی باوکانەی بە سەریدا هێناوە، لە دواشەوی سەفەرەکەیدا کە بۆ بەیانیەکەی وڵاتەکەی بەجێ دێڵێت و ڕوو لە هەندەران دەکات، وەك ژن و مێرد پرۆسەی سێکسی لەگەڵدا ئەنجام دەدات و بەیەکێك لە چرکەساتە خۆشەکانی ژیانی خۆی دادەنێت. یاکوب بەم کارانە ڕابووردو لە بیری خۆی دەباتەوە، لە خۆی و لە مێژووەکەی هەڵدێت، ئەمە بەشێکە لەو میراتیە ڕۆژهەڵاتیەیش کە بەردەوام داوێنگیری سیاسیە شکست خواردووەکان دێت و، لەگەڕان بە دوای ئەڵتەرناتیفدا یان خۆیان لە سێکسدا نقوم دەکەن یان لە بێ هودەییدا هەموو بەهاجوانەکان لە ژێر پێ دەنێن.

(کلیما)ی مۆسیقار لە کەسایەتیە گرنگەکانی ناو ڕۆمانەکەیە، ئەمیش ئەگەرچی هونەرمەندێکی ناوادارە و بە حساب پەروەردەی ناودنیایەکی پاکیزەیە و هەموویش خۆشیان دەوێت، بەڵام لە بەرانبەر هەڵوێستە ئینسانیەکاندا کە لەگەڵ بەرژەوەندیەکی تایبەتی خۆیدا باش نەکەوێتەوە بە چۆکدا دێت و بەها جوانەکان دەدۆڕێنێت. کلیما ژنێکی زۆر جوانی هەیە گەلێك ئەمی خۆش دەوێت و ئەمیش پەرۆشیەتی، شەوێك لە ڕێکەوتێکدا کلیما لەگەڵ کچێکدا بە ناوی ڕۆزینا جووت دەبێت و سکی پڕدەکات. ڕۆزینا دەیەوێت مۆسیقارەکە بیهێنێت تا منداڵەکەی سکی هەر بە ناوی ئەوەوە، واتا

وەك بـاوكی ڕاسـتەقینەی نـاوزەد بكرێـت و ئـەویش لـە كێشـەی ڕسـوابوون ڕزگاری بێت. بەڵام كلیما بە هیچ جۆرێك ناچێتە ژێر بارو تەنانەت نكوڵی لەوە دەكات ئەوە منداڵی ئەوبێت، چەندان ڕێگای پڕ لە فڕوفێڵ و درۆو تەفرەدان لە بەردەگرێت تا قەناعەت بە كچەكە بكات سكەكەی لەباربەرێت. تەنانەت بە درۆ بەڵێنی ئەوەیشی دەداتێ دوای لە باربردنی منداڵەكە بیخوازێت و ببێتە ژنی. كە ڕۆژینا لەو سەرو بەندەدا لەناو دەبرێت ئەو هونەرمەندە گەورەیە! یان ئەو بۆڕیە ژەنـە (وەك كاراكتـەرێك نـاوی لێدەنێـت) دەسـتی ئۆخـەی بەسـەر دڵیـا دێنێت و ئەو ڕۆژە بە خۆشترین ڕۆژی ژیانی خۆی دەداتە قەڵەم.

**لەم ڕۆمانەدا پاساوێكی قەناعەتكەر نە بـۆ قوربانیـەكان هەیـەو نـە بـۆ جـەلادەكان، نازانیت كامیان تاوانبارە و كامیان بی گوناهە. زۆر جار ئەو دووانە لە تەرازووی یەكسانیدا وەك یەك دەوەستن، تەنانەت ئەوانەی دەبنە قوربانی هیچ لەوانە باشـترنین كـە ئـەوانیان كردۆتـە قوربـانی، وەك یـاكوبیش لـە شـوێنێكدا دەڵێـت كـە تاوانبـار و قوربـانی هیـچ جیاوازییەكیان لەبەینا نەما، ئیتر ئەوە دۆزەخێكە بۆ خۆی.**

لـە هـەموو ڕۆمانـەكانی كۆندێـرادا -ئاهـەنگی ماڵئـاوایی- لـە نـەزمدا خێراترینیانە، ئەم ڕۆمانە خۆشترین و سەرنج ڕاكێشترین بەرهەمی پەخشانی ئەوە، كۆندێرا گوزارەی ئەو ڕۆمانە لەوەدا ئەبینێ كە بەشێوەیەكی سووك و ئاسـانی دەربڕیـن، بـە زمـانێكی سـادەو شـەفاف، سـەبارەت بـە بابەتـە هـەرە گرنگەكان قسە دەكرێت.

**"ئایا ئادەمیزاد مافی ئەوەی هەیە خاوەنی سروشت بێت؟ ئایا باشـتر نییـە هەسـارەی زەوی "لە چنگی ئادەمیزاد" ڕزگار بكرێت؟"**

هـەندێك جار دەربڕینـەكان دەگاتـە ئاسـتی گاڵتەیـەكی نـەگونجاو و قسـەی هەرە ئاسایی، بـەڵام سـووكەڵەیی شێوەی دەربڕین هـەر دۆزی تـەكنیك نییـە، بەڵكو ئەنجامی پەیبردنە بەوەی كە مرۆڤی ئەم سەردەمە مافی تراجیدیای لە

دەستداوە، ئیدی دراماکەی لەسەر شانۆی گەورەی مێژوو بنوێنرێت یان لەسەر ئاستی شانۆی بچووکی تایبەت. کە ئەمانە دەربڕی بێ مانایيەکی غەم ئەنگێز و سامبەخشن.

لە بارەی وەرگێڕانەکەوە پێم خۆشە سەرنجی خوێنەری ئازیز بۆ ئەوە ڕابکێشم کە دوای خوێندنەوەی ڕۆمانەکە بە زمانی فارسی و عەرەبی و بڕیاردانم لەسەر وەرگێڕانی دەقە فارسییەکە، هەستم کرد هەندێك لە وێنەو دیمەنە سێکسییەکان لە فارسیەکەدا لابراون و لە عەرەبییەکەدا وەك خۆیان ماونەتەوە. زانیم ئەمەیان کاری سانسۆرە و دەشێت نکۆڵی لە وەرگێڕەکەوە نەبێت، بۆیە ئەمانەت و پیرۆزی دەق وا دەخوازێت کە من ئەو دیمەنانە نەبوێرم و خوێنەری کوردیش لەو شێوازە بەدگومان نەکەم کە کۆندێرا لە کارەکانی تریدا پەیڕەویی لێکردوون و بەشێکە لە پێناسەی بەرهەمەکانی. وەك لە کۆتایی پێشەکی ڕۆمانی "زۆربا"یشدا نووسیومە وا لێرەدا دووبارەی دەکەمەوە: "**بێگومانم کەم و کورتی لە وەرگێڕانەکەمدا هەیە، پێشەکی سوپاسم بۆ ئەو بەڕێزانەی ئاگاداری ئەو بۆشاییانەم دەکەن و بەچاوی دڵسۆزییەوە حەز بە کامڵ بوونی هەرکارێکی داهێنەرانە دەکەن**"

**ڕەووف بێگەرد**

**کانوونی یەکەم 2002**

–1–

سەرەتای پاییز بوو، لە نێو دەربەندە قەشەنگەکەوە، درەختەکان ڕەنگی زەردو سوورو قاوەییان گرتبوو، وا دەهاتە بەرچاو مەڵبەندی تەندروستیی شارۆچکەکە بە بڵێسەی ئاگر گەمارۆ درابێت. ژنان بەژێر ڕیزێك ستوونی ئاوە کانزاییەکاندا (گەڕاو)[1] پیاسەیان دەکرد و جارجارەیش بۆ تەماشاکردنی کانیاوە بە کوڵ هاتووەکان دەوەستان. ئەمانە ئەو ژنە نەزۆکانە بوون کە بە هیوای چاکبوونەوە ڕوویان لەو گەڕاوانە کردبوو.

لەناو نەخۆشەکاندا چەند پیاوێکیش هەبوون، چونکە پێدەچوو کانییەکان بێجگە لە موجیزەکانی نەخۆشیی ژنانە، بۆ نەخۆشیی دڵیش کەڵکیان هەبێت. لەگەڵ ئەمەیشدا، ڕێژەی ژمارەی ژنان نۆ ژن بوو بەرانبەر بە پیاوێك. ئەم ڕێژەیە، بۆ کچە سستەرێکی گەنجی وەك ڕۆزینا[2]، کە هەموو ڕۆژەکە لە خزمەتکردنی ژنانی نەزۆکدا بوو، تاڕادەیەك مایەی بێزاری بوو.

ڕۆزینا هەر لەو شارۆچکەیەدا کە شوێنی حەسانەوەی نەخۆشبوو لەدایك ببوو، باوك و دایکیشی هەر لەوێ دەژیان، نەیدەزانی ئاخۆ ڕۆژێك دێت بتوانێت لەو هێلانە پڕ لە ژنەدا هەڵبێت!

عەسری ڕۆژی دووشەممە و نزیکی کۆتایی نۆبەت گرتنەکەی بوو، هەر ئەوەندەی مابوو هەندێك لە ژنە قەڵەوەکان بە چەرچەف داپۆشێت، بیانخەوێنێتو بە دەمیانەوە بسکەی بێت.

هاوکارەکانی ڕۆزینا، بۆئەوەی بیجوڵێنن پێیان وت: "ئەو تەلەفۆنەی دەبوو بیکەیت چی بەسەرهات؟" یەکێك لەوانە ژنێکی بەخۆوەی تەمەن سی و پێنج ساڵو ئەوی تریان لەو گەنجتر و لاوازتر بوو.

ڕۆزینا وەڵامی دانەوە: "بێگومان تەلەفۆن دەکەم، هیچ هۆیەك نییە بۆ نەکردنی"

ژنە سستەرێکی بە تەمەنتر کە ڕۆزینای بەرەو پشتەوەی ژووری خۆگۆڕین کە دۆڵاب و مێزو تەلەفۆنی کارمەندانی تیابوو دەبرد. غیرەتی دایەو پێی وت: "هەق نییە بترسیت".

سستەرە لاوازەکە بە مەرامێکی پیسەوە وتی: "دەبێت ئەو کاتە تەلەفۆنی لەگەڵدا بکەیت کە لەماڵەوە بێت"

هەرسێکیشیان دایانە قاقای پێکەنین.

کە پێکەنینەکەیان دامرکا، ڕۆزینا وتی: "من ژمارەی تەلەفۆنی ئەو هۆڵی سەمایە دەزانم کە پرۆڤەی تیا ئەکات، تەلەفۆن بۆ ئەویٚ ئەکەم".

-2-

گفتوگۆیەکی ترسناك بوو، هەر کە دەنگی ڕۆزینای ناسی ترسی لیٚ نیشت.

ئەو هەمیشە لە ژن دەترسا، بەڵام کە ئەم ڕاستیەی پیٚ دەوتن بڕوایان پیٚ نەدەکرد، ئەوان ئەم دان پیانانەیان بە گاڵتەو دەم و دووی شەرمنانە وەردەگرت.

لە ڕۆزینای پرسی: "چۆنیت؟"

"زۆر باش نیم"

"چی بووە؟"

ڕۆزینا بە دەنگێکی زۆر خەمبارانەوە وتی: "دەبێت لەو بارەیەوە قسەت لەگەڵدا بکەم"

ساڵانێك بوو بە ترسەوە چاوەڕێی دەنگێکی وا کاریگەر بوو.

بە بێزاریەوە وتی: "چۆن؟"

ڕۆزینا دووبارەی کردەوە: "بەڕاستی دەبێت لەو بارەیەوە لەگەڵت بدوێم"

"چی ڕوویداوە؟"

"لە یەکەم پێکگەیشتنمانەوە شتێك ڕوویداوە"

زۆر بە ئەستەم دەیتوانی قسە بکات؛ دوای کەمێك وەستان لە سەرخۆ وتی: "مەبەستت چییە؟"

"شەش هەفتەی بەسەردا تێپەڕیوە"

ویستی خۆی بگرێت: "شتی وا پێش دێت، هەندێك جار کەمێك دوا دەکەوێت، هیچ نییە"

"نا، ئەمجارەیان بە تەواویی ڕاستە"

"نابێت، هەرگیز شتی وا نابێت، بەهەرحاڵ، دڵنیام کە لە منەوە نییە"

ڕۆزینا زۆر بە تووڕەییەوە وتی: "جەناب، بۆ تۆ من بە چ جۆرە ژنێك دەزانیت!"

پیاوەکە لێی دەترسا، دەترسا تووڕە بێت. "بە هەڵە تێمەگە، مەبەستم سووکایەتی پێکردن نەبوو، بۆ دەبێت سووکایەتیت پێ بکەم؟ ئەمەوێت بڵێم ئەو مەسەلەیە دەستی منی تیا نییە، تۆ لەوە نیگەران مەبە، چونکە هەرگیز ناشێت کاری وا لە من بوەشێتەوە، ئەمە لە باری فیزیۆلۆژیشەوە هەرگیز نابێت"

ڕۆزینا بە ساردییەوە وتی: "کەواتە هەمووشتێك ئاساییە، داوای لێبوردنت لێ ئەکەم کە زەحمەتم دایت"

لە ترسی ئەوەی نەکا ڕۆزینا تەلەفۆنەکە دابخات خێرا وتی: "نا، داوای لێبوردن ئەکەم، کارێکی چاکت کرد کە تەلەفۆنت بۆ کردم، بێگومان خۆشحاڵ ئەبم بەوەی هاوکاریت بکەم، هەڵبەت ئەم جۆرە شتانە چارەسەر دەکرێن"

"مەبەستت لە چارەسەرکردن چییە؟"

پیاوەکە گێژ ببوو، نەیدەوێرا ناوی ڕاستیی کارەکە بهێنێت.

"باشە، دەزانیت ، ئیدی مەبەستم لە چارەسەرکردنە"

"ئەزانم چ بیرێکت لەژێر سەردایە، بەلاّم وا چاکە هەر لە ئێستاوە ئەوە لەسەری خۆت دەربکەیت، مەحاڵە من کاری وابکەم، مەگەر بەسەر تەرمەکەمدا تێپەڕن"

جارێکی تریش ترس هەموو گیانی داگرت، بەلاّم دژی هێرشەکە وەستا:

"ئەگەر ڕای منت ناوێت بۆ ئەرکی تەلەفۆن لەگەڵ کردنم دەکێشیت؟ تۆ دەتەوێت پێکەوە قسەی لەسەربکەین یان بڕیاری بنبڕیی خۆت داوە؟"

"دەمەوێت لەوبارەیەوە لەگەڵتا قسە بکەم"

"باشە، کەواتە سەرت لێ ئەدەم"

"کەی؟"

"هەواڵت لێ ئەگێڕمەوە"

"زۆر چاکە"

"تۆ ئەم ماوەیە ئاگات لە خۆت بێت"

"تۆیش هەروا"

تەلەفۆنەکەی داناو گەڕایەوە سەر شانۆکە، تیپەکەی چاوەڕێی پرۆڤەی تر بوون، پێی وتن: "بەڕێزان پرۆڤە تەواو"

—3—

ڕۆزینا تەلەفۆنەکەی دانا، لە ڕقا دەموچاوی ئاگری لێ دەباری، کاردانەوەکەی کلیما[3] بەرانبەر هەواڵەکەی ئەم سووکایەتی پێکردن بوو، لە ڕاستیا تاماوەیەك ڕۆزینا هەر ڕەنجاوو تووڕە بوو.

ئەوان دوو مانگ لەوەوبەر، کە ترومپییت ژەنە ناودارەکە لەگەڵ تیپەکەیدا بۆ سەرگەرم کردنی نەخۆشەکان چووبوونە ئەو گەڕاوانە یەکدیان ناسی بوو، دوای کونسێرتەکە ئاهەنگێك لەسەر شەرەفی مۆسیقارەکان سازکرابوو، ڕۆزینایش هاتبوو، ترومپییت ژەنەکە لەناو هەموو ژنەکاندا ئەوی هەڵبژاردو شەوی لەگەڵدا گوزەراند. لەوە بەدواوە ڕۆزینا هیچ هەواڵێکی ئەوی نەبوو، دووکارتی بۆ پۆست کرد کە سڵاوی خۆشەویستانەی تیابوو، بەڵام ئەو وەڵامی نەدایەوە، جارێك کە ڕۆزینا چووبوو بۆ پایتەخت و تەلەفۆنی بۆ ئەو هۆڵە کردبوو کە کلیما پرۆڤەی تیا ئەکات، پیاوێك وەڵامی تەلەفۆنەکەی دابوەوەو لەناوی ڕۆزینای پرسیبوو. پێی وتبوو دەچێت بەدوای کلیمادا، دوای چەند دەقیقەیەك گەڕابوەوە و پێی وتبوو پرۆڤە تەواو بووەو جەنابی ترومپییت ژەن هۆڵەکەی بەجێهێشتووە.

ڕۆزینا زانی کلیما خۆی لێ دەدزێتەوە، دڵ ڕەنجانەکەی لەو، پێبەپێی گومانی سك پڕییەکەی تادەهات لە زیادیدا بوو.

"دەڵێت لە ڕووی فیزیکیەوە ئەمە هەرگیز ڕوونادات، تۆ بیری لێ بکەوە، لە ڕووی فیزیکیەوە هەرگیز ڕوونادات، نازانم کە سەرو سەکوتی مناڵەکە دەرکەوت ئەو ئەڵێ چی؟"

هەردوو هاوڕێکەی ڕۆزینا سەری هاوپشتی کردنیان بۆ ڕاوەشاند، ئەو شەوە کەم وێنەیەی کە لەگەڵ ترومپییتە ژەنە بەناوبانگەکەدای بەسەربردبوو، بۆ بەیانیەکەی، لەناو ژووره هەڵماویەکەدا، وەك خۆی ڕووداوەکەی بۆ هاوڕێکانی گێڕابوەوەو هەرایەکی دروست کردبوو، لەوە بەدوا، ترومپییت ژەنەکە بوو بە موڵکی هاوبەشی هەموو سستەرەکان. وێنەیان بەدیواری ژووری کارمەندەکاندا هەڵواسیو، کە ناویشی دەهات تێکڕا هێند لە دڵەوە پێدەکەنین دەتگوت هاوڕێیەکی زۆر خۆشەویستیانە. کە بەسك پڕبوونی

ڕۆزینایشیان زانی زۆر دڵشاد بوون. چونکە ترومپیت ژەنەکە ئیدی بەوتۆوەی کە لە سکی ڕۆزینادا وشاندبووی پەیوەندییەکی دیارو پایەداری لەگەڵیاندا بەستبوو.

سستەرە بەتەمەنەکە دەستی بە شانی ڕۆزینادا داو وتی:

"ئازیزم، ئارامبە، دەمەوێت شتێکت پیشان بدەم"

ژنەکە بە پەلە کەوتە لاپەڕە هەڵدانەوەی گۆڤارێکی وێنەداری کۆن و وتی: "تەماشای ئێرە بکە" لاپەڕەکە وێنەی ژنێکی سەوزەی جوان و قەشەنگی پێوە بوو، لەسەرشانۆ بە میکرۆفۆنێکەوە وەستابوو.

ڕۆزینا کە دەیویست چارەنووسی خۆی بەسەر ئەو کاغەزە شێوە لاکێشەیەوە بخوێنێتەوە لە وێنەکە ڕاما، بەدوو دڵیەوە وتی: "نەمدەزانی ئەوەندە گەنجە"

هاوڕێ تەمەن نێوەندەکەی پێکەنی و وتی: "قسەی هیچ مەکە! ئەمە وێنەی دەساڵ لەمەوبەرە، ئەزانیت هەردووکیان یەك تەمەنن، بەڵام لەگەڵ تۆدا بەراورد ناکرێت".

-4-

لەو سەروبەندی بە تەلەفۆن قسەکردنەی لەگەڵ ڕۆزینادا کلیما هەستی کرد ئەو دەنگە، هەمان ئەو قەدەرە شوومەیە کە ساڵانێکە لێی دەترسا، نەك لەبەر ئەوەی ئەم دڵنیابێت لەو شەوە شوومەدا سکی ڕۆزینای پڕکردبێت. (بەپێچەوانەوە، ئەم دڵنیابوو کە تۆمەت بارکردنەکەی ئەو درۆیە) بەڵام دەمێك بوو، لە ساڵانێکی پێش بینینی ڕۆزیناوە، چاوەڕێی هەواڵێکی وابوو.

تەمەنی بیست و یەك ساڵ بوو کە کچێکی قژ زەرد حەزی لێکردو، بۆ ئەوەی لەسەر هێنان ناچاری بکات وای دەرخست کە سکی لێی هەیە. چەند

هەفتەیەکی سامناکی بەسەربرد، سەرئەنجام ماسوولکەکانی گەدەی گرژبوون و لەسەر جێ کەوت. لەوەو دوا تێگەیشت کە سکپڕکردن ڕەشەبایەکە لە هەمووکات و شوێنێکدا دەتوانێت بیهەژێنێت، هەورە بروسکەیەکە هیچ شتێك ناتوانێت ڕێی پێبگرێت. ئەو دەنگە خەمبارەی ناو تەلەفۆنەکە هەواڵی زریانێکی دەگەیاند (بەڵێ، ئەوسایش، لەلایەن ئەو کچە قژ زەردەوە، هەر بە تەلەفۆن، هەواڵە ناخۆشەکەی پێگەیشتبوو)

دوای ئەو ئەزموونی لاویەتیە هەرچەندە پەیوەندی لەگەڵ ژندا هەرهەبوو، بەڵام خاڵی نەبوو لە ترس و دوو دڵیو، هەمیشە چاوەڕێی ئەنجامی خراپی دەکرد، لە باری لۆژیکیەوە، دڵی خۆی بەوە دەدایەوە لەبەر خۆپارێزیەك کە تاڕادەیەك لێی ببوە نەخۆشی، شیمانەی ڕوودانی ئەو کارەساتە لە هەزاردا یەکێك بوو ، بەڵام هێشتا کە وێنای ئەو شیمانە- ئیحتمال-ە زۆر لاوازەیشی دەکرد ترسێکی تێدەگەڕا.

جارێك لە شەوێکی ئازادیی خۆیدا، تەلەفۆنی بۆ کچێك کرد کە دوو مانگ بوو نەیدیبوو. کچە هەرکە گوێی لە دەنگی بوو بەسەر سووڕماویەوە وتی: "خۆشەویستەکەم، ئەوە تۆیت؟ لە خوام دەویست قسەم لەگەڵدا بکەیت. بەڕاستیی گەلێکم پێویست پێتە" کچە هێند بە پەرۆش و بێ تاویەوە دەدوا ئەمی پەشۆکاند، خەم و ئازارێکی زۆری تێگەڕاو، لە ناخەوە هەستی بەوە کرد تووشی بەدبەختیەك هاتووە. بۆ ئەوەیش کە خێرا پەی بە ڕاستیەکە بەرێت زوو گەزارەی لێکێشا: "تۆ بۆ بەو کەساسیەوە قسە دەکەیت؟"

کچە وەڵامی دایەوە: "ئاخر دوێنێ دایکم مرد"

هەناسەیەکی ئاسوودەیی تێگەڕا، وەڵێ ئەوەی دەزانی کە دوور یان نزیك، بێگومان پێشهاتێکی زۆر ناخۆش هەرووەگیری دێنێت.

-5-

"زۆر باشه، تەواوی دەکەین! چ بووە؟" پرسیاری سەرومڕی تەپڵ لێدەرەکە سەر ئەنجام کلیمای هێنایەوە سەرخۆی، تەماشای ڕووی نیگەرانی مۆسیقاژەنەکانی خۆی کردو ڕووداوەکەی بۆ باسکردن، لاوەکان ئامێرە مۆسیقاییەکانیان لاخست و دەوری ڕابەرەکەی خۆیاندا.

یەکەمین پێشنیاز لەلایەن گیتارژەنە تەمەن هەژدە ساڵانەکەوە بوو کە زۆر توندڕەوانە قسەکانی کرد: دەبێت ئەم جۆرە ژنانە لە شوێنی خۆیاندا ڕابگیرێن. "پێی بڵێ بڕوات بەپەی کاری خۆیەوە، منالْ هی تۆ نییە، هیچ گوێیش بەو مەسەلەیە نادەیت، وێڕای ئەوەی کە تاقیکردنەوەی خوێن زۆر زوو ئەوە دەردەخات کێ ئاوسی کردووە"

کلیما وەڵامی دایەوە کە تاقیکردنەوەی خوێن لە هیچ ڕوویەکەوە ئەوە دەرناخات و، لە ئەنجامدا تۆمەتی ژنەکە هەر بەهێزی خۆیەوە دەمێنێتەوە.

گیتار ژەنەکە وەڵامێکی تووڕەی دایەوە کە ئەسڵەن پێویست بە تاقیکردنەوەی خوێنیش ناکات: کە لەگەڵ کچێکی وادا بە توندی ڕەفتار بکرێت، زیاتر ناچار دەبێت خۆی لە دەردی سەری دوور بگرێت، هەر ئەوەندەی بزانێت تۆ پیاوێکی لاوازو ترسنۆك نیت ناچار دەبێت لەسەر ئەرکی خۆی چارەسەری منداڵەکە بکات. "بەهەرحاڵ، ئەگەر هەر وەك خۆی مایەوەو منداڵەکەی بوو، ئێمە یەکەیەکە سوێند دەخۆین کە پەیوەندیمان لەگەڵیدا هەبووەو منداڵەکە لە ئێمەیە، جا با ئەو وەختە بزانێت باوکی ڕاستەقینەی منداڵەکە کێیە!"

کلیما وتی: "من ئەزانم ئێوە هەمووشتێکم بۆ ئەکەن، بەڵام تا ئەوکاتە ترس و دوودڵی دەمکوژێت. من لەم پێشهاتانەدا ترسنۆکترین کەسی دنیام، بۆیە تا زووتر دڵنیابم درەنگە"

هەموویان سەری ڕەزامەندییان بۆ لەقاند، پێشنیازی گیتارژەنەکە لەڕاستیا ماقووڵ بوو، بەڵام لای هەموو کەسێك نا، نە بۆ پیاوێك دەستی ئەدا کە دەماری لاوازبێت و نە دەوڵەمەندێکی بەناوبانگ کە ژنان لە پێناویدا خۆیان تووشی مەترسیەکی گەلۆرانە بکەن. لەبەر ئەمانە تیپەکە بڕوای پێشووی خۆی گۆڕی و بڕیارێکی عاقڵانەتریدا، لەباتی ئەوەی ڕەپ و ڕاست مەسەلەکە بداتە دواوە، هانی کچەکە بدەن کە بڕیاری لە باربردنی تۆلەکەی بدات. وەلێ دەبێت چ پاساوێکیان بۆ ئەو مەبەستە هەبێت؟ هەر خۆیان پێشنیازی سێ بەرنامەی سەرەکیان کرد:

ڕێگای یەکەم بە هەندگرتنی سۆز و بەزەیی کچەکە بوو، بە پێی ئەو نەخشەیە، دەبوو کلیما وەك خۆشەویستترین هاوڕێی خۆی ڕەفتار لەگەڵ کچەکەدا بکات، نهێنییەکانی دڵی خۆی بۆ بکاتەوەو ڕاستگۆیانە ئەو مەبەستەی لابدرکێنێت کە ژنەکەی زۆر نەخۆشەو ئەگەر بەوە بزانێت مێردەکەی لە ژنێکیتر منداڵی هەیە بێگومان دەمرێت. کلیما، کە لە باری ئەخلاقی یا ڕەوانیەوە بەرگەی کارەساتێکی وا ناگرێت، داوای بەزەیی لە سستەرەکە دەکات.

بەهەرحاڵ، ئەم بەرنامەیە ڕووبەڕووی بەرهەڵستییەکی گەورە دێت، بینای بەرنامەیەك لەسەر شتێکی نادیار کە تاقی نەکرابێتەوە و تەنیا پشت بە گریمانەی دڵسۆزی و نەرمیی سستەرەکە ببەسترێت کارێکی گەمژانەیە، چونکە ئەگەر وا ڕێکەوت کچەکە خاوەنی ئەو دڵە میهرەبان و نەرمیە نەبوو، ئەوا هەر بەو چەکە دژایەتی ئەم دەکاتەوە، هەر بەو بیانووەوە کە ئەو باوکەی ئەم بۆ منداڵەکەی سکی هەڵبژاردووە بەرگری لە ژنێکیتر ئەکات، کچەکە هەست بە سووکایەتی پێکردن دەکات و، زۆر بێ بەزەییانەتر دەست بەکار دەبێت.

ڕێگای دووەم هەستی کچەکەی لەبەرچاو دەگرت: دەبێت کلیما هەوڵی ڕوونکردنەوەی ئەوەی بۆ بدات کە بەڕاستی لەوە دڵنیا نییە ئەو منداڵە لەو بێت، ئەم دوو دڵیەیشی هەر لە بیردا دەمێنێت و ناگاتە ڕاستی. هەرچۆنێك بێت، ئەو شەوێك لەگەڵ سستەرەکەدا نووستووەو ئیدی هیچی تری لە بارەوە نازانێت. لەوەیش زۆر بێ ئاگایە کە ڕۆزینا هاوڕێی تری پیاوی هەبێت، نا، کلیما ناتوانێت ڕۆزینا بە فێڵبازێکی هوشیار لە قەڵەم بدات، بەڵام ڕۆزیناش ناتوانێت بڕوا بەم بهێنێت کە بێجگە لەم پیاوی تر لە ژیانیا نەبووە، خۆ ئەگەر هەر سوور بێت لەسەری، کلیما لەکوێ دەتوانێت ئەوەندە دڵنیا بێت کە بیری ئاسوودە بێت، ئەی ئەوە چ عەقڵێکە منداڵێك بەبار بێنیت کە هەمیشە باوکی لە باوکایەتیەکەی خۆی بەدگومان بێت؟ ئەی چاوەڕێی ئەوە لە کلیما دەکرێت لەبەر خاتری منداڵێك کە لەوە دڵنیا نییە منداڵی خۆی بێت واز لە ژنەکەی بێنێت؟ ئەی ڕۆزینا لەخۆی ڕادەبێت منداڵێك گەورەبکات کە بزانێت هەرگیز باوکی نابینێت.

ئەم پلانەیش کێشەو گرفتی خۆی هەبوو. کونتەر باس لێدەرەکە (کە بە تەمەنترین کەسی گروپەکە بوو) سەرنجی بۆ ئەوە ڕاکێشان پشت بەستن بە عەقڵ و هەستی کچێك لە بەهەند وەرگرتنی بەزەیی و میهرەبانیەکەی زۆر گەلۆرانەترە. بێگومان لۆژیکی گفتوگۆ بە هیچ ئەنجامێك ناگات، لە کاتێکدا کە بێ بڕوایی حەتمەن دڵی کچەکە لە دڵدارەکەی دەڕەنجێنێت، ئەم کارە تەنیا لەسەر سەختی ئەو کچە زیاد دەکات و بەرەو بڕیاری بێ بەزەییانە تری دەبات.

ڕێگای سێیەم ئەوەبوو: کلیما کچەکە لەوە دڵنیا بکات کە ئەوسا و ئێستایش هەر خۆشی ویستووە، بێ ئەوەی تۆمەتی فێڵ و تەڵەکەبازی بداتە پاڵ کچەکە، خۆشەویستی و ئومێدێکی زۆری بداتێ، تەنانەت بەڵێنی

ئەوەیشی پێبدات بەم زووانە لە ژنەکەی جیا دەبێتەوەو، ئیتر بۆ هەتا هەتایە پێکەوە ژیانێکی زۆر خۆش بەسەر دەبەن، داوای ئەوەیشی لێ بکات بۆ بەدیهاتنی ئایندەیەکی لەوجۆرە منداڵەکە لەبار خۆی بەرێت. بەچاکی ئەوەی بۆ روون بکاتەوە کە ئێستا کاتی منداڵداریان نیەو، بوونە باوك و دایك لە پێش کاتی گونجاوی خۆیدا، لە خۆشی و جوانی ژیانی ساڵانی بەرایی هاوسەریەتیان کەم دەکاتەوە.

ئەم پاساوە، لەباری تایبەتمەندییەوە کەمتری لە پاساوەکانی دی دەهێنا کە ئەویش لۆژیکە. ئەگەر کلیما هێند شێت و شەیدای سستەرەکە بووە بۆ لەماوەی دوومانگی رابوردوودا هەر لێی نەپرسیوەتەوە؟ بەڵام کونتەر باس لێدەرەکە بڕوای وابوو لۆژیك و عەشق دردۆنگی یەکترین و کلیما بە دڵنیاییەوە دەتوانێت قەناعەتی پێبکات، پاشان هەموو لەسەر ئەوە پێکهاتن ئەم رێگای سێیەمە لە هەموو ئەوانی دی لە باروچاکترە، چونکە لە تێکرای مەسەلەکە کەڵك لە تاقە شتێك وەردەگیرێت، ئەویش عەشقی کچەکەیە.

—6—

کە لە تەلارەکە هاتنەدەرێ ئەندامانی تیپەکە لە یەکدی جیابوونەوە، وەلێ گیتار ژەنەکە کلیمای تا ماڵەوە رەوانە کرد، ئەو تاقە کەسێك بوو وای هەست دەکرد پلانەکە لە شان و شکۆی سەرۆکی تیپەکەیان، کە لای ئەم زۆر گەورەبوو، کەم دەکاتەوە، بۆیە پێچەوانەی بریارەکە بوو. گیتار ژەنەکە قسەیەکی نیچەی[4] وەبیر کلیما هێنایەوە کە خۆی بێجگە لەوە هیچ قسەیەکی تری ئەو فەیلەسوفەی نەدەزانی: "کە دەرۆیتە دیداری ژنێك، قامچیەکەت لە بیرنەکەیت"

کلیما هەناسەی هەڵکێشاو وتی: "هاوڕێی خۆشەویستم، بەداخەوە ئەوکەسەی ئێستا قامچی بەدەستەوەیە ئەو خانمەیە، نەك من" ئەوسا گیتار ژەنەکە پێشنیازی ئەوەی بۆ کلیما کرد کە لە گەڵیا بچێتە گەڕاوەکان، سستەرەکە لاس بدەن تا دەیگەیەننە سەر شەقامی گەورەو بیکەن بە ژێر ماشێنەوە. وتی: "کەس ناتوانێت بیسەلمێنێت کە ئەمە ڕێکەوت نەبووە"

گیتارژەنەکە لە هەموو ئەندامانی تیپەکە گەنجتربوو، زۆری کلیما خۆشدەویست و، قسەکانی هەستیان ڕاگرت، کلیما پێی وت: "تۆ مرۆڤێکی زۆر ناسکیت"

گیتارژەنەکە بە پەرۆشەوە باسی لە پلانەکەی دەکرد، ڕوومەتی سوور داگەڕابوو.

کلیما پێی وت: "تۆ زۆر مرۆڤێکی چاکیت، بەڵام ئەمە ناکرێت.

-بۆ دوودڵیت، ئەو ژنە، سۆزانیە.

-نا، تۆ زۆر مرۆڤێکی چاکیت، سوپاست دەکەم، بەڵام ئەمە کاری کردە نییە" ئەمەی وت و خواحافیزی لەگیتارژەن کرد.(*)

-7-

کە کلیما بە تەنیا مایەوە بیری لە نەخشەی کوڕە لاوەکە و بەڵگەکانی ڕەتکردنەوەکەی خۆی کردەوە. ئەو لە گیتارژەنەکە پاکیزەتر نەبوو، بەڵام ترسنۆکتر بوو، چەندە لەوە دەترسا کە ببێتە باوك ئەوەندەیش لەوە دەترسا تاوانی کوشتنی بدرێتە پاڵ. ئەوەی هێنایە بەرچاوی کە ئۆتۆمبێلێك ڕۆزینا دەکات بە ژێرەوە، لاشەیەکی خوێناوی دەکەوێتە سەرجادە، بەم دیمەنە بۆ چرکە ساتێك خۆشی و ئارامی تێگەڕا، وەڵێ هەستی کرد خۆ دڵخۆشکردن بەم

جۆرە خەیاڵانە کارێکی بێ هوودەیە. بە هەرحاڵ، ئێستا لەسەرووبەندی کارێکی پەلەی تردایە: سبەینێ ڕۆژی لەدایکبوونی ژنەکەیەتی.

چەند دەقیقەیەکی مابوو بۆ سەعات شەش و فرۆشگاکان لە داخستنا بوون. بەپەلە خۆی گەیاندە فرۆشگایەکی گوڵ فرۆشتن و چەپکێك گوڵەباخی گەورەی کڕی، بیری کردەوە کە بێگومان بەیانی ڕۆژی سەرئێشە و ئازاریەتی. چونکە بە ناچاری دەبێت خۆی وا پیشان بدات کە بە جەستەو ڕۆح لەگەڵ ژنەکەیدایە، ناچارە بە دەوریدا بێت و سەرگەرمی بکات، بە دەمیەوە پێ بکەنێت و، لە ڕاستیشدا تەواوی هۆش و گۆشی لای سکێکی بەرزەوەبووی بێگانەیەکی دوور لێرەدایە، بە خۆشیەوە قسەی زۆری بۆ دەکات، بەڵام بیری لە شوێنێکی دوور،کۆیلەی گۆشەیەکی پەنهان و تاریکی لەشی ژنێکیترە.

بیری کردەوە کە هەرگیز ناتوانێت ڕۆژی لەدایك بوونی ژنەکەی لەماڵەوە بەسەر بەرێت، بۆیە بڕیاریدا بینینی ڕۆزینا لەوە زیاتر دوا نەخات. هەرچەندە دیمەنی سەفەرێکی وای هێند لا خۆش نەبوو. بیری ئاوەکانزاییە پەرت و دوورەکان لە گەڕەی بیابان دەچوو، لەوێ کەسی نەدەناسی، بێجگە لە ئەمریکاییەکی دەوڵەمەند کە دەوری موڵکدارێکی گیرخواردووی لە ژووری ناوچەیەکدا دەبینی ، ئەوە، ئەو ئەمریکاییە بوو کە دوای کۆنسێرتە شوومەکەی کلیما، هەموو تیپە مۆسیقاییەکەی بانگهێشتی ئاپارتمانەکەی کرد، لە خواردن و خواردنەوەی زۆر باش مری کردن و سستەرە جوانەکانیشی پێ ناساندن، لەبەر ئەوە، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بووە هۆی پەیوەندی نێوان کلیما و ڕۆزینا، ئاه، خۆزگایەکی، ئەو ئەمریکاییەی بەگەرمی و خۆشەویستیەکی زۆرەوە لەگەڵ ئەمدا ڕەفتاری کرد ئێستایش هەر لەوێ بێت! کلیما وا بەو خەیاڵەوە چەسپی دەتوت ڕزگاربوونی خۆی تیا ئەبینێتەوە، لەم

جـۆرە گیرخواردنانـەدا کـە کلیمـای تێکـەوتووە، هیـچ شـتێك بـە ڕادەی ئـەوە دڵنیایی و ئاسوودەیت پێ نابەخشێت کە کەسێکی دی هاودەردیت بکات.

کلیمــا گەڕایــەوە هۆڵــی پــەراوەکردن و، داوای لــە دەرگاوانەکــە کــرد پەیوەندییەکی تەلەفۆنی ڕێگا دوورەکەی ڕۆزینای بۆ فەراهەم بێنێت. زۆری نەبرد دەنگی ڕۆزینای لە گوێ هات، پێی وت بەیانی دەچێت بۆلای، لە بارەی مەسـەلەکەی تـرەوە کـە پێشـان ڕۆزینـا باسیکردبوو وشـەیەکی نـەدرکاند، وای لەگـەڵدا دووا دەتوت  بێخـەمترین دووعاشـقی سـەر ئـەم زەویـەن. هـەروا لابـەلایش لێـی پرسـی: "بەڕاسـت ئەمریکاییـە دەوڵەمەندەکـە هـەر لەوێیـە؟" ڕۆزینا وتی: "بەڵێ، هێشتا لێرەیە".

خۆشیەکی تێگەڕاو جـارێکی دی بـە شۆڕوشـەوقێکی زیـاترەوە وتـی زۆر شەیدای بینینیەتی. پرسی: "پێم بڵێ ئێستا چیت لەبەردایە؟"

"چۆن؟"

ئەمەیش یەکێك لەو فێڵانەی کلیما بوو کە لە تەلەفۆندا دەیکردو، ساڵانێك بوو بەسەرکەوتوویی کەڵکی لێ وەردەگرت:

"ئەمـەوێت بـزانم چ جـۆرە بـەرگێکت پۆشـیوە، حـەز دەکـەم لـە زەینمـدا وێنایەکت هەبێت".

"بەرگی سوورم لەبەردایە"

"بێگومانم کە ڕەنگی سوورت لێ دێت"

"منیش وا ئەزانم"

"ئەی ژێر کراسەکەت؟"

ڕۆزینا پێکەنی.

"ڕەنگی دەرپێکەت؟"

"ئەویش هەر سوورە"

"هیوادارم هەر بەو جۆرە بتبینم"

کلیما تەلەفۆنەکەی داناو ڕۆیشت، بیری کردەوە به تەواویی ئەو زمانەی دۆزیوەتەوە کە دەبێت لەگەڵیا پێی بدوێت و بۆ چەند دەقیقەیەك هەستی بە ئاسوودەیی کرد.

بەڵام ئەمە چەند دەقیقەیەکی خایاند، پاشان لەوە گەیشت کە ناتوانێت مەسەلەی ڕۆزینا لە بیرخۆی بەرێتەوەو، دەبێت هەوڵی ئەوە بدات کە قسە لەگەڵ ژنەکەیدا زۆر کورت و پوخت بێت. لە بەردەم پەنجەرەی بلیت بڕینی سینەمایەکدا وەستاو، دوو بلیتی بۆ فیلمێکی ویسترنی ئەمریکی بڕی.

-8-

هەرچەندە خانمی کلیما زۆر لەوە جوانتر بوو کە بە نەخۆشیەکەی بزانرێت، لەگەڵ ئەوەیشدا نەخۆشبوو، هەر ئەو لەش بە بارییەیش وای لێکرد، کە لە پێش چەند ساڵەوە، بەناچاری واز لە پیشەی گۆرانی وتن بهێنێت، ئەو پیشەیەی خستیە ئامێزی پیاوێکەوە کە ئێستا مێردیەتی.

ئەو ژنە گەنج وجوانەی کە جێگای سەرنج وپیاهەڵدانی خەڵکی بوو، دوای ئەوەی تووشی نەخۆشی هات، لە پڕا خۆی لە دنیایەکی بێگیاندا بینیەوە کە بۆنی دەرمان و نەخۆشخانەی لێ دەهات، دنیایەك کە جیاوازیەکەی لەگەڵ ئەو دنیا درەوشاوەیەی سەردەمانێك خۆی و مێردەکەی تیایدا بوون جیاوازی نێوان زەوی و ئاسمان بوو.

کلیما هاودەردیی دەکرد، کە دەموچاوە غەمگینەکەی دەبینی دڵی پێ دەسووتا، لە دنیا پڕ لە خرۆش و سیحراویەکەوە (ئەودیو ئۆقیانووسەکانی خەیاڵ) دەستی هاودەردیی بۆ درێژ دەکرد، خانمی کلیما دوای ماوەیەکی کەم

هەستی بەوە كرد كە لـە خـەم و ئازارەكانیـا هـێزێكی ئاشـكرا هەیـە سـەرنج ڕاكێش و هەست بزوێنە. كلیما دەجولێنێت و چاوی پڕ لـە فرمێسك دەكات، بۆیە شتێكی سەیر نەبوو كە خانمی كلیما (ڕەنگە لە بێ ئاگاییەوە بووبێت، بەلاّم بەزۆریی) كەلّك ئاوەژوو (سوء استفادە)ی لەو تایبەتمەندییە بەڕێكەوت زانـراوەی وەرگرتبێـت. چونكەكـە مێردەكـەی دەبینـی چـۆن لـە دەموچـاوە ئازاراویەكـەی ڕادەمێنێـت، گومـانی نـەدەما مێردەكـەی بـیر لـە ژنێكـی تـر ناكاتەوە.

ئەم خانمە جوانە لە ژنان دەترساو لە هەموو شوێنێكدا دەیبینین، هەرگیز یەكێكیانی لە كیس نەدەدا، لە ئاوازی سلاّوكردنی كلیما لەبەردەرگای مالّداو تەنانەت لە بۆنی جلەكانیشیدا هەستی بـە بوونـی ژن دەكـرد. لـەو دواییـەدا پارچە ڕۆژنامەیەكی دڕاوی لەسەر مێزی نووسینەكەی دۆزیبووەوە كە بە خەتی كلیمـا مێـژووی ڕۆژێكـی لێ نووسـرابوو، دەشـێت ئـەوە مێـژووی ڕۆژێكـی ڕاهێنـانی كۆنسێرت یـان بینینی بەڕێوەبەری كارەكە بێت، بـەلاّم یـەك مـانگی تەواو بیری لە ناسینی ژنێك كردەوە كە قەرارە لەو ڕۆژەدا كلیما ببینێت و، یەك مانگی ڕێك شەوێك خەو نەچووە چاوی و تەنیا بیری لای ئەو ژنە بوو.

ئایا ئـەو كـە ئـەوەندە لـە دنیـای بەدگومانبینی ژن دەترسا نـەیدەتوانی لـە دنیای پیاودا ئاسوودە بێت؟

بەگران ئیرەیی پرشنگێكی زۆر باریك دەخاتە سەر پیاوێكو، هەر لەوكاتەدا هەموو پیاوەكانی دی لە گێژەنێكی تاریك و غەمگینا ڕادەگرێت. ئەم پرشنگە ڕووناكە ئازار هێنە خانمی كلیمای كردبووە هیپنوتیزم و چاوی هیچ پیاوێكی دنیای نەدەبینی بێجگە لە تاقە پیاوێك: مێردەكەی.

دەنگی سووڕانی كلیلـی نـاو قفلّەكـەی بیسـت و، پیاوەكـەی بـە چـەپكێك گولّەباخەوە لەبەردەرگادا وەستابوو.

لە پێشدا دڵخۆش بوو، بەڵام گومان و دوودڵی یەکسەر بەرکیان گرت: ئەم سبەینێ ڕۆژی لەدایك بوونیەتی، ئەی بۆ ئەمڕۆ گوڵی بۆ هێناوە؟ چی بووە؟
پێشوازی لێکردو پێی وت: "سبەی لێرە نیت؟"

-9-

گوڵباخ هێنانی کلیما لە شەوی لەدایك بوونی ژنەکەیدا، بێگومان، بەومانایە نەبوو کە سبەی لەماڵ نابێت، بەڵام ئانتینی هەمیشە هوشیارو هەمیشە ئیرەیی بەری ئەو، دەیتوانی هەر زوو نەخشە شاراوەکانی مێردەکەی ئاشکرا بکات و پێی بزانێت. هەر کات کلیما هەستی بەوە بکردایە کە ئەو ئانتینە سامناکە لەسەر ئەو دانراوە، بەسەر سەریەوە وەستاوەو ڕووتی دەکاتەوە، ئیدی هێزی لێ دەبڕاو نەخۆش دەکەوت، نەفرەتی لەو ئانتینانە دەکردو، لەوە بێگومان بوو ئەگەر شتێك هەبێت ژیانی ژن و مێردایەتی لێ تێك بدات ئەوا هەمان ئەو ئانتینەیە. هەمیشە (بە ویژدانێکی پاکی شەڕ ئەنگێزیەوە) لەوە دڵنیابوو هەر فرتوفێڵێك کە دەشێت لەگەڵ ژنەکەیدا کردبێتی تەنیا بۆ ئەوەبووە کە بیپارێزێت و لە نائومێدی دووری بخاتەوە، لەوەیش دڵنیابوو کە خەم و ئازاری ژنەکەی تەنیا لە کارو گومانەکانی خودی ژنەکە خۆیەوەیەتی.

لە دەموچاوی ژنەکەی ڕاماو گومان و خەفەت و بەدخوڵقی تیا خوێندەوە. دەیویست چەپکە گوڵەکە فڕێداتە سەرزەویەکە، بەڵام خۆی گرت، دەیزانی خۆ گرتنەکەی لە چەند ڕۆژی ئایندەدا دەبێت زیاتر بێت، چونکە ڕووبەڕووی هەڵوێستی سەخت و گرانتر دەبێتەوە.

کلیما وتی: "لەبەر ئەوەی کەمێك زووتر گوڵم بۆ هێناویت زویر توویت؟"

ژنەکەی لە دەنگیا هەستی بە ئازارێك کرد، سەری بە نیشانەی نەخێر لەقاند و کەوتە ئاودانی ئینجانەی گوڵەکان، کلیما وتی: "ئەم سۆسیالزمە نەفرەتیە"

"مەبەستت چیە؟"

"هەمووی سەرئێشەیە، دەیانەوێت هەروا بەخۆڕایی و بەلاش، بۆ هیچ، کۆنسێرتیان بۆ بگێڕین، هەر ڕۆژەو بۆنەیەکی تازە دادەهێنن. ڕۆژێك بە بۆنەی بەرەنگاری لەگەڵ ئیمپریالیزمدا، ڕۆژێکی دی بە بۆنەی ساڵیادی شۆڕشەوە، جارێکی تر ئاهەنگی لەدایك بوونی فلانە نازانم کێیە، ئەگەر مانەوەی تیپەکەم مەبەست بێت دەبێت هەمووی قبوول بکەم، نازانیت ئەمڕۆ چیتریان داهێناوە؟"

خانمی کلیما بێ دەربەستانە وتی: "ئەمەیان چیە؟"

"لە کاتی ڕاهێناندا سەروسەکوتی ژنێك دەرکەوت کە لە ئەنجومەنی مەڵبەندەوە هاتبوو، کەوتە باسی ئەوەی دەبێت چی بژەنین و چی نەژەنین، دواییش پێشنیازی ئاهەنگێکی مۆسیقای لێ کردین بۆ ئەنجومەنی لاوان، هێشتا ئەمەیان هەر باشە، دەبێت بەیانی، هەموو ڕۆژەکە، لە کۆنفرانسێکی هیچا بەسەربەرم کە دەربارەی دەوری مۆسیقایە لەناو سستمی سوسیالزمدا. ڕۆژێکی تەواو لە ناو دۆزەخدا، دیارە ناچاریش بوون ڕۆژی لەدایك بوونی تۆ هەڵبژێرن!"

"باوەڕناکەم هەموو شەوەکەی بتهێڵنەوە!"

دەستی گرت و پێی وت: "نا، منیش وا ئەزانم، وەلێ دەتوانیت ئەوە بهێنیتە بەرچاوت کە دەگەڕێمەوەماڵەوە لە چ حاڵێکی ناخۆشدام، لەبەر ئەوە ویستم ئەمشەو کەمێك پێکەوە دڵخۆش بین"

خانمی کلیما وتی: "تۆ ئینسانی چاکیت" کلیما بە دەنگی کامیلادا لەوە گەیشت. کە لە بارەی چیرۆکی کۆنفرانسی بەیانیەوە بڕوای بە تاقە وشەیەکی نەکردووە. نەیویستووە ڕاستەوخۆ ئەمە بڵێت، چونکە دەیزانی بەدگومانیەکەی کلیما تووڕە دەکات، دەمێك بوو کلیما بڕوای بە زوو باوەڕکردنی ڕواڵەتیی ژنەکەی نەدەکرد، ڕاستی بوتایە یان درۆ بەردەوام دەیزانی ژنەکەی گومانی لێ دەکات، ئەمە بڕابووەوە، بەڵام ئەم قسەکانی وادەکرد کە لەو باوەڕەدایە ژنەکەی بڕوای پێ ئەکات. ژنەکەی (بەڕوویەکی خەمباری ڕەنگ پەڕیوەوە) چەند پرسیارێکی دەربارەی کۆنفرانسی سبەی کرد تا وای پیشان بدات کە گومانی لەڕاستیی قسەکانی نیە.

بۆ ئامادەکردنی شێو چووە چێشتخانەکەوە، زۆری خوێ لە چێشتەکە کرد،، حەزی لە چێشت لێنان و دەست ڕەنگینیش بوو تیایدا (ژیان نە توانیبووی کەیبانوویەتیەکەی لێ تێك بدات و نە لەڕێی لابدات) کلیما دەیزانی تاقە هۆی ناخۆشیی خواردنەکەی خەمباریەکەیەتی، بە چاوی زەین ئەوەی بینی کە چۆن هاوسەرەکەی بە دەمارگیری و تووڕەییەوە خوێی لە چێشتەکە کردووەو، بەمەیش ئێش کەوتە دڵی، وا پێدەچوو لە هەر تیکەیەکدا تامی فرمێسکێکی ژنەکەی و گوناهێکی خۆی بچێژێت. دەیزانی کامیلا[5] ئیرەیی ئازاری دەداتێ و ناتوانێت ئەمشەو بخەوێت. دەیویست ماچی بکات، بیلاوێنێت و هێوری بکاتەوە، وەلێ دەیزانی بێ سوودە، چونکە ئانتینی ژنەکەی وای دەردەخست کە ئەوانە لەبەر خۆشەویستی ئەونین بەڵکو بۆ ویژدانە گوناهکارەکەی ئەمن.

لە دواییدا بۆ سینەما چوون، کلیما تەماشای پاڵەوانی فیلمەکەی کرد کە چۆن بە پشت بەستن بە خۆی بەسەر گەلێك داوو پیلانی سامناکدا سەرکەوتو ڕزگاری بوو، ئەمیش غیرەت گرتی، خۆی خستە شوێنی پاڵەوانەکە، وای لێك

دایەوە کە هەڵنانی ڕۆزینا بۆ لەباربردنی سکەکەی کارێکی نەك گرانە بگرە زۆر سووکەو، بەهۆی بەخت و جازبیەتی خۆیەوە دەتوانێت بە ئاسانی سەربکەوێت.

پاشان لە تەنیشت یەکەوە لەسەر قەرەوێڵەیەکی گەورە پاڵ کەوتن. کلیما تەماشای کرد، کامیلا لەسەرپشت نوستبوو، سەری نوقمی سەرینەکە کردبوو، چەناگەی کەمێك بەرز و چاوی لە بنمیچەکە بڕیبوو، لەشە کرژەکەی (هەمیشە هاوسەرەکەی ژێیەکی کرژی وەبیردەهێنایەوەو جارێکیش ئەم پێی وتبوو کە گیانێکی ڤیلۆنی هەیە) لە پڕا کلیما تەواوی جەوهەری کامیلای لە چرکە ساتێکدا بینی، بەڵێ، هەندێکجار ئەمەی بەسەر دەهات (ئەمانە چرکەساتی موجیزە ئاسابوون) جووڵەیەك یان ئاماژەیەکی ژنەکە لە ناکاوێکدا پەردەی لەسەر هەموو جەستەو ڕۆحی لادەبرد، ئەو چرکەساتانە، چرکەساتگەلی جۆرێك لە بینینی ڕەهاو کارتێکردنی ڕەهان. ئەم ژنە کاتێك عاشقی ببوو کە کلیما هێشتا نەببوو بە هیچ، هەمیشە ژنەکە ئامادەی خۆفیداکردن بوو لە پێناویدا، زەینی دەخوێندەوەو دەرکی بە هەموو بیرێکی دەکرد، بە جۆرێك کە ئەم دەیتوانی لەبارەی ئارمسترانگ[6] یان ئوستراڤینکی[7] قسەی بۆ بکات، هەموو مەسەلەیەکی لەگەڵدا باس بکات، ئیتر مەسەلەیەکی گرنگ بێت یان کەم بایەخ، ئەم ژنە، لەسەر ئەم زەمینەدا لە هەموو کەسێکی دی زیاتر لەمەوە نزیك بوو، پاشان ئەوەی هێنایە بەرچاوی خۆی کە ئەم لەشەجوانەی دەیپەرستێت و، ئەم دەموچاوە دلۆڤانە نەمێنێت، بێگومان دوای مەرگی ئەم ژنە تاقە ڕۆژێك ئەم ناتوانێت بژی، ئەم بەوەی دەزانی کە تا دوا هەناسە ئامادەی پاراستنیەتی، دەتوانێت خۆی بۆ بکاتە قوربانی.

بەڵام ئەم جۆشی خۆشەویستیە بێ سنوورە تێپەڕیبوو، چونکە بیری لێوان لێوبوو لە ترس و دڵەڕاوکێ. لە پاڵ کامیلادا ڕاکشا، لەوە بێگومان بوو کە

خۆشەویستیەکەی بێ سنوورە، بەڵام دڵ و مێشکی لای خۆی نەبوو، دەستی نازی بەسەروچاویا هێنا، وەلی هەستی وابوو کە سەدان و سەدان میل دوورە.

* * *

(*)ئەو دیالۆگانەی خەتیان بەژێردا هاتووە لە دەقە فارسییەکەدا نین و لەبەر عەرەبییەکەوە کراون بەکوردی، لە شوێنی تری لەمەودای ڕۆمانەکەیشدا چەند جارێکیتر دووبارە دەبنەوە. (وەرگێڕ)

(1)Colonnades
(2)Rozena
(3)Klima
(4)Nietzche
(5)Kamila

(6)لویس ئارمسترانگ: ترومپیت ژەنی ڕەش پێستی ناوداری سالآنی (50-60)ی ئەمەریکا.

(7)ئیگور ستراوینسکی: مۆسیقارو ئاهەنگسازی خاوەن قوتابخانەی نوێی ڕوس ڕەچەڵەك و ئەمریکایی.

**-1-**

**سەعات نزیك نۆی سەرلەبەیانی بوو که ماشێنێکی سپی جوان لە پارکی پاڵ ئاوەکانزاییەکاندا وەستا (قەدەغە بوو ماشێن بچێتە ناو سنووری ئاوەکانزاییەکانەوە).**

**لەخوار سەنتەری شەقامە سەرەکیەکەوە باخچەیەکی درێژکۆلەو چەند درەختێك، ڕێڕەوی لم، شوێن دانیشتنی رەنگاورەنگ هەبوون. هەردوو بەری شەقامە فراوانەکە ساختمان بوو، یەکێك لەوانە ساختمانی کارل مارکس بوو کە روزینای سستەر لە ژوورێکی بچووکیا دەژیا، جارێك، ترومپیت ژەنەکە، دووسەعاتی نەگبەتی لەو ژوورەدا بەسەر بردبوو، بەرانبەر ساختمانەکەی کارل مارکس، لەوبەری شەقامەکەدا، جوانترین بینای ئاوەکانزاییەکان هەبوو، بە شێوازی بیناسازی نوێی دوا ساڵانی سەدەکە دروست کرابوو. بە نەخش و نیگاری گەچین رازابوەوەو شوێنی هاتنە ژوورەوەیش بە کاشی ورد وردی شێوە جیاواز خۆی دەنواند، ئەمە تاقە ساختمان بوو کە بەڕاستی ناوە ئەسڵیەکەی خۆی پاراستبوو، ساختمانی ریچموند.**

**کلیما لە دەرگاوانەکەی پرسی: "جەنابی بارتلیف[1] هێشتا هەرلێرەیە؟" دەرگاوانەکە بە بەڵێ وەڵامی دایەوەو ئەویش خێرا بەو پلیکانانەدا کە فەرشی سووریان لەسەر داخرابوو بەرەو قاتی دووەم سەرکەوت، لە دەرگایدا.**

**بارتلیف بە بیجامەوە پێشوازی لێکرد، کلیما بە شەرمەوە داوای پۆزشی لەم دیدەنیە کوت و پڕو بێ پێشینەیەی خۆی کرد، بەڵام بارتلیف قسەی پێ بڕی:**

**"هاوڕێی ئازیزم، پێویست بە پۆزش هێنانەوە ناکات، لەم بەیانیە زووەدا ناتوانم هیچ شادمانییەکم لە دووبارە بینینەوەی تۆ پێ خۆشتربێت"**

تەوقەی لەگەڵ کلیمادا کردو لەسەر قسەکانی رۆیشت:

"خەڵکی ئەم وڵاتە رێزی بەیانیان ناگرن، زەنگی سەعات وەك تەور خەوەکەیان دەبرێتو، گورج لەناوجێ رادەپەڕنو یەکسەر بەرەو کارە ناخۆشەکانیان دەکشێن. پێم ناڵێیت ئەم سەرەتا ناخۆشە چ رۆژێکی خۆشی لێ دەکەوێتەوە! چی لەو کەسانە چاوەڕێ دەکرێت کە هەموو رۆژێکی ژیانیان بە لێدانی رۆحیان دەست پێ بکات ئەویش بە زەنگی سەعاتێکی قورمیش، بەڕاستیی ناوەکەی پڕ بە پێستیەتی کە پێی دەڵێن سەعاتی قورمیش.

هەموو رۆژێك کۆمەڵێك کەس لەگەڵ توندو تیژیدا رادێن و خۆشیو بەختەوەری لەیاد دەکەن، باوەڕبکە بەیانیان خوڵقو خووی مرۆڤ دەست نیشان ئەکات"

بارتلیف دەستی خستە سەرشانی کلیماو بەرەو لای قەنەفەکەی برد، دەستی کردەوە بە قسە کردن: "من عاشقی ئەو سەعاتە خاوو خلیچکانەی بەیانیم کە لە پردێکی جوانی نەخش لەسەرکراو دەچێتو، من هێدی هێدی بەسەریا شەو بەڕۆژو خەون بە واقیع دەگەیەنم. بەدرێژایی ئەو سەعاتانە چەندە چاوەڕوانی موجیزەیەکم، موجیزەیەکی گچکە، تووشهاتێك قەناعەتی ئەوەم پێ بکات بە گەیشتنی بەیانی خەونەکانی شەوم کۆتاییان نەهاتووەو، لەنێوان ئەو شتانەی لەخەودا ڕوو دەدەنو ئەوەی بەڕۆژو لەکاتی بێداریدا ڕوودەدات هیچ بۆشاییەك نیە".

ترومپیت ژەنەکە تەماشای بارتلیفی دەکرد کە چۆن بەناو ژووری سەرەوەو خوارەوەدا هاتوچۆی دەکردو، دەستی بە قژە ماشو برنجەکەیدا دەهێنا، گوێیشی بۆ دەنگە خۆش ئاوازەکەی رادێرابوو کە بە زاراوەیەکی هێشتا زیندووی ئەمریکایی ئەدوا. لە هەڵبژاردنی وشەکانیشدا تایبەتمەندییەکی مۆد بەسەرچووی سەرنج راکێش هەبوو زۆر زوو ئەوەی پیشان دەدا کە

بارتلیف هەرگیز ماوەی زۆری لە وڵاتی باووباپیرانیدا بەسەر نەبردووە و نەژیاوەو، زمانی دایکیی هەر لە باوك و دایکیەوە فێربووە.

بارتلیف زەردەخەنەیەکی خۆش نیەتانەی بۆ کلیما کردو بەسەریا دانەوی. کەوتەوە قسە بۆکردنی:

"هاورێ، ئایا بڕوا ئەکەیت، لە هەموو ئەم ناوچەیەدا، هیچ کات، کەسێك نەبووە لەگەڵما سەروساختێك پەیدا بکات؟ کە دەمەوێت سستەرەکان بەرچاییەکم بە خۆشیەوە لەگەڵدا بخۆن، تەنانەت ئەوانیش کە بە حساب لە شوێنی تردا زۆر میهرەبانن، خراپ تەماشام دەکەن، بۆیە ناچارم هەموو وادەو بەڵێنەکانم بخەمە شەو، ئەو کاتەی کەمێکیش ماندووم".

بە دەم ڕۆیشتنەوە بەرەولای تەلەفۆنەکە کە لە سەرمێزێکی بچووك دانرا بوو پرسی: "کەی هاتی؟"

کلیما وتی: "ئەم بەیانیە، بە ئۆتۆمبیل هاتم"

بارتلیف وتی: "بێگومان برسیتە" تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و دوو جێ نانی بەیانیی داواکرد "چوار هێلکەی کوڵاو، پەنیر، کەرە، نان، شیر، ژامبون، چا"

لەوکاتەدا، کلیما چاوی بە ژوورەکەدا گێڕا، مێزێکی خڕی گەورە، چەند کورسیەك، قەنەفەیەکی قووڵ، ئاوێنە، دوو قەنەفە، دەرگایەك لەسەر حەمام و دەرگایەکی تر دەچووەوە سەر ژوورێکی تەنیشت -ئەوەندەی لەبیری مابێت- بە ژوورێکی بچووکی نووستن کۆتایی دەهات، لێرەدا، لەم ئاپارتمانە قەشەنگەدا بوو هەموو شتێك ڕوویدا، کاتێك کە ئەم ئەمریکاییە دەوڵەمەندە ئاهەنگێکی بۆ مۆسیقارەکان و سستەرەکان سازکرد، لەگەڵ هاوڕێ مۆسیقارە مەستەکانیدا لێرەدا دانیشتبوو.

بارتلیف وتی: "تابلۆکەی بەرانبەرتان تازەیە و پاش دوا هاتنی ئەو جارەتان دامناوە"

تـابلۆ تازەکـە سـەرنجی ترومپیـت ژەنەکـەی ڕاکێشـا، پیـاوێکی ڕیشـن، شەبەنگێکی شینی کاڵ بە پشت سەریەوە خەرمانـەیدابوو، قەڵـەم مووچێك و ڕەنگدانێکی بە دەستەوە بوو، واپێدەچوو پیشـەکار نـەبێت، بـەلاّم ترومپیـت ژەنەکە دەیزانی گەلێك لەو تابلۆیانـەی جوان نایەنە بەرچاو لە ڕاستیا کاری هونەرمەندانی بەناوبانگن.

"ئەم تابلۆیە کێ دروستی کردووە؟"

بارتلیف وتی: "خۆم"

کلیما وتی: "هیچ نەمدەزانی شێوەکاریت"

"حەزم لێیەتی"

کلیما جەسارەتی کردو پرسی: "ئەی ئەو پیاوە کێیە؟"

"سانت لازاروس"[2]

"بەلاّم سانت لازاروس شێوەکار نەبووە"

"ئەمە لازاروسی کتێبی پیرۆز نییە، ئەم سانت لازاروسە ڕاهیبێکی سـەدەی نۆیە کە لە قوستەنتەیەدا ژیاوە، قەشەیەکی ڕابەرمە".

ترومپیت ژەنەکە وتی: "تێگەیشتم"

"قەشـەیەکی زۆر سـەیر بـوو، ئـەو لەسـەر بڕوابـوون بـە مەسـیح بەدەسـتی کافرەکـان شـەهید نـەبوو، بەڵکو بـەهۆی ئەوەوە کـە عاشـقی وێنەکێشـان بـوو مەسیحیە پۆخڵـەکان شەهیدیان کرد، وەك دەزانیـت لـە سـەدەکانی هەشـت و نۆدا، ڕێ و ڕەسمێکی ریـازەت کێشـان. ڕێوڕەسمێـك بەتـەواوی دژی لـەزەتی دنیـایی بـوو، دەسـتی بەسـەر کڵێسـای ئەرتودۆکسـیدا گرتبـوو، وێنەکێشـان و پەیکەرسازی بەوە دادەنران کە لـەزەت بـەخش و کاری نائـەخلاقین. ئیمپراتۆر تیوفیلـوس[3] هـەزاران تـابلۆی جوانـی لـەناوبردو وێنەکێشـانی لـە لازاروسـی خۆشەویستم قەدەغەکرد، وەلێ لازاروس دەیزانی نەقاشیەکەی خواپەرسـتیە،

بۆیە خۆی بە دەستەوە نەدا، تیوفیلوس خستیە زیندانەوەو کەوتە ئازاردانی، بۆ ئەوەی ناچاری بکات قەڵەم مووچ لابخات و دەستبەرداری بێت، بەڵام خوای پڕ لە بەزەیی ئەوەندەی توانا بە لازاروس بەخشی کە بەرگەی ناخۆشترین ئازار بگرێت.

ترومپیت ژەنەکە بە ئەدەبەوە وتی: "چیرۆکێکی جوانە"

"بەڵێ، بەڵام من دڵنیام کە تۆ بۆ تەماشاکردنی شتێکی لە تابلۆکەم گرنگتر بۆلای من هاتوویت"!

لەوکاتەدا لە دەرگادرا و پێش خزمەتێك کە سینیەکی گەورەی پێبوو هاتە ژوورەوە، سینیەکەی نایە سەر مێزەکەو بۆ کەوتە ئامادەکردنی خوان بۆ دوو مرۆکە.

بارتلیف ترومپیت ژەنی داوەتی سەرمێزەکە کردو وتی: "ئەمە خواردنێکی هێند بەرچاوگیر نییە کە لە گفتوگۆمان بخات، پێم بڵێ بیر لە چی دەکەنەوە!"

بەم جۆرە، ترومپیت ژەنەکە، لەمیانەی نان خواردنەکەدا باسە ناخۆشەکەی بۆ گێڕایەوە، بارتلیفیش ناو ناوە بەپرسیاری ورد قسەکانی پێ ئەبڕی.

–2–

بارتلیف پێش هەرشتێك سەیری بەوە هات کە بۆ کلیما بەرانبەر بە ڕۆزینا ئەوەندە کەمتەرخەم بووە: بۆ هەموو کارتە پۆستکراوەکانی پشتگوێ خستووە، کە ڕۆزینا تەلەفۆنی بۆ کردووە بۆ وتوویەتی لەوێ نییە، بۆ نەیتوانیوە ئاماژەیەکی دۆستانە بەوشەوە کورتەی عەشقەیان بدات کە دەشیا کەمێك کاریگەرییەکی ئاسوودە بەخشی بەوکچە بگەیاندایە؟

کلیما دانی بەوەدا نا کە کارەکانی ناپەسەند و بێعەقڵانەبوون، وەلێ ئەوەیشی وت کە نەیتوانیوە هیچ کارێکیتر بکات، لەوەترساوە هەر پەیوەندییەکی تر لەگەڵ ڕۆزینادا بکات.

ئەم قسانە قەناعەتیان بە بارتلیف نەکرد "هەموو دەبەنگێك ئەتوانێت کچێك لە خشتە بەرێت، ئەمە کارێکی ئاسانە، بەڵام پیاوی عاقڵ ئەو کەسەیە کە بزانێت چۆن خۆی دەرباز بکات"

ترومپیت ژەنەکە بە خەمبارییەوە ڕاستیی قسەکانی دەسەلماند، "تۆڕاست ئەکەیت، بەڵام بێزارییەکەم، ئەو لەعنەتەی لێم نابێتەوە لە نیازپاکییەکەم بەهێزتر"

بارتلیف بەسەر سووڕماویەوە وتی: "ناشێ لەو پیاوانە بیت کە لە ژن بێزارن؟"

"وام پێ دەڵێن"

"بەڵام تۆ وەك ئەوانە نایەیتە بەرچاو!"

کلیما بە دەنگێکی خەم بارانەوە وتی:"ڕاست ئەکەیت. من کێشەیەکی زۆر لەوە خراپترم هەیە، من شەیدای ژنەکەی خۆمم، ئەمە نهێنی ئیروسیەتی منە کە زۆربەی کەس تێی ناگات"

ئەم پێ لێنانەی کلیما هێندە کاریگەربوو کە هەردووکیان کڕبوون، دوای چەند چرکەساتێك ترومپیت ژەنەکە کەوتەوە قسەکردن. "هیچ کەس لەمە ناگات و، لە هەموو کەس کەمتریش ژنەکەم، ئەو وابیر دەکاتەوە خۆشەویستی پیاو لەوەدا گەورەیە پەیوەندی بە ژنی ترەوە نەبێت، وەلێ ئەمە قسەیەکی بێ مانایە. هەمیشە شتێك ئێمە بەرەو لای ژنێکی دی دەبات، بەڵام هەر ئەوەندەی پێی گەیشتم، هێزێك کە خەسڵەتی سپرنگی هەیە جارێکیتر بەرەو لای کامیلام هەڵدەدات، هەندێك جار وا هەست ئەکەم تەنیا لەبەر تازەکردنەوەی

ئەوپەیوەندییەیە، ئەو فڕینە شکۆمەندەی گەڕانەوەیە (کە لێوان لێوە لە خۆشەویستی، لە شەوق و ئارەزوو، لە خاکیەتی) بۆ لای ژنەکەم کە لەگەڵ هەر بێوەفاییەکی تازەدا زیاتر خۆشم دەوێت و، هەر لەبەر ئەمەیشە بە دووی ژنی دی دەکەوم"

"بەم پێیە پەیوەندیت بە ڕۆژینـاوە تەنیا بۆ سووربوونە لەسەر ئەو عەشقەی کە بۆ هاوسەرەکەتت هەیە"

ترومپیت ژەنەکە وتی: "تەواو وایە، ئەمە داوەریەکی زۆر دڵگیرە، ڕۆژینا لە یەکەمین نیگادا بەڕاستی ڕاتدەکێشێت، بەڵام ڕاکێشانێکی دوو سەعاتی و پاشان بە تەواویی کۆتایی دێت، ئەمەیش ئەو سوودەی هەیە کە پیاو لە دوو دڵیەکی زۆردا ناهێڵێتەوەو، هەر بەو فڕینە جوان و شکۆمەندەوە بەرەو ماڵی خۆی دەباتەوە"

"هاوڕێی خۆشەویستم، زێدەڕۆیی لە خۆشەویستیا تاوانێکە، تۆ ڕاستگۆترین کەسی ئەو جۆرە خۆشەویستیەیت"

"وامدەزانی خۆشویستنی ژنەکەم تاقە خەڵاتێکی خواییە کە ئازادی بە ژیانم دەبەخشێت"

"تۆ هەڵەیت، ئەو خۆشەویستیە لە ڕادە بەدەرەی تۆ بۆ هاوسەرەکەت بەڵگەی ئەوە نییە تۆ بەرانبەر بە کەسانی دی بێ هەست و سۆزبیت، بەڵکو ئەوە سەرچاوەکەیەتی، چونکە بەلای تۆوە ژنەکەت هەموو شتێکە، هەموو ژنەکانی تر هیچن، وەلێ ئەمە کفرێکی گەورەیە، بە سووکی ڕوانینە لە بەندەی خوا. هاوڕێی ئازیزم، ئەمە عەشقێکی نادروستە"

–3–

بارتلیف فنجانە خاڵیەکەی خۆیلادا، لەسەر مێزەکە هەستاو چووە حەمام، کلیما گوێی لە دەنگی ئاوو پاشان لە دەنگی بارتلیف بوو:

"بەڕای ئێوە خەڵك هەقی ئەوەی هەیە منداڵێك بکوژێت کە هێشتا لەدایك نەبووە؟"

کلیما پێش ئەوە لە تابلۆی قەشە ڕیشنە شەبەنگاویەکە سەری سووڕ مابوو، بارتلیفی وەك مرۆیەکی خۆش و ژیان دۆست هاتبووە بەرچاو، هەرگیز بیری بۆ ئەوە نەچووبوو کە بشێت ئەمریکاییەك بڕوای ئایینی هەبێت، ئیدی کلیما دڵی گیرا، چونکە لەوە دەترسا بارتلیف بکەوێتە وەعزو ئامۆژگاری و، بەو جۆرە تاقە ڕوناکایی ئومێدی لەم بیابانە شوومەدا بۆ ببێتە تراویلکە. بەدەنگێکی خەمگینەوە پرسی: "ئایا تۆ لەو کەسانەیت کە لە باربردنی منداڵ بە تاوانی کوشتن ئەزانیت؟"

بارتلیف زۆر بێدەنگ بوو، دوایی لە حەمام هاتەدەرێ، بەرگی تەواوی لەبەرداو قژی جوان شانە کردبوو. وتی:

"تاوانی کوشتن، وشەیەکە زۆر بۆنی پەتیسێدارەی جەلادی لێدێت. من بیر لە شتێکی تر ئەکەمەوە، ئەزانیت، من بڕوام وایە دەبێت ژیان وەك خۆی وەربگرین، ئەمە یەکەمین فەرمانەو لە پێش دە فەرمانەکەی ترەوەیە، ئەوەی ئەمڕۆ ڕوو ئەدات لە دەستی خوادایە، لە بارەی بەیانیەوە هیچ نازانین، ئەمەوێت بڵێم قبووڵ کردنی ژیان وەك خۆی مانای قبووڵکردنی ئەو شتانەیە کە پێشبینی ناکرێن، منداڵیش گەوهەرو بنەمای شتە پێشبینی نەکراوەکانە. منداڵ خودی پێشبینی نەکردنە، تۆ نازانیت منداڵ دەبێتە چی، چ ماناو چەمکێك لای تۆ وەرئەگرێت، بۆیە دەبێت پێشوازیی لێ بکەیت. بێ لەمە، تۆ مرۆڤێکی نیوە زیندوویت، لەو مەلەوانە ناشیانە دەچیت لە شوێنە

تەنکاوەکانی کەنار دەریادا یاری بە ئاو دەکەن. لە کاتێکدا کە لە ڕاستیا دەریا لە شوێنە قووڵەکەوە دەست پێدەکات"

ترومپیت ژەنەکە ڕەتی دایەوە کە منداڵەکە لەو نییە.

بارتلیف وتی: "هیچ نازانم چۆن تا ئەم ڕادەیە لەوە دڵنیایت، هەر بۆ بەردەوام بوون لەسەر قسە گریمان تۆ ڕاست ئەکەیت. بەڵام لەم حاڵەدا تۆ ئەبێت ڕاستگۆیانە دان بەوەدا بنێیت کە ئەگەر بتزانیایە منداڵەکە لە تۆیە هەر بە هەمان شێوەی ئێستا هەوڵت دەداو ڕۆژینات هەڵدەنا بۆ لەباربردنی، تۆ ئەم کارە لە بەرخاتری ژنەکەت و لەبەر عەشقی زێدەڕۆو گوناهباری هاوسەریەتی دەکەیت"

ترومپیت ژەنەکە وتی: "ڕاستە، من دان بەمەدا دەنێم، جەختم لە ڕۆژینا دەکرد کە بە هەر نرخێك هەیە دەبێت سکەکەی لەباربەرێت"

بارتلیف شانی بە چوارچێوەی حەمامەکەوە داو زەردەخەنەیەکی بۆ کرد: "تێت دەگەم و هەوڵیش نادەم بڕیارەکەت پێ‌بگۆڕم، زۆر لەوە پیرترم کاری چاك کردنی دنیا لە ئەستۆ بگرم، باوەڕی خۆمم پێ وتیت و هەر ئەوەیشە، ئەگەر بە قسەیشم نەکەیت هەر هاوڕێتم، تەنانەت کە لە گەڵیشتا نەبم کۆمەکت دەکەم".

ترومپیت ژەنەکە لە بارتلیفی ڕوانی کە وشەکانی دوایی بە ئاوازێکی شیرینی‌ی پەیامبەرێکی عاقڵ و میهرەبانەوە وت، شتێکی ناوازەی تیا بوو، کلیما وای هاتە بەرچاو کە هەموو قسەکانی بارتلیف دەشێت بکرێنە پەندو ئامۆژگاری و فەسڵێکی نوێی ئینجیل، دەیویست لە بەرانبەریا سەر دانەوێنێت (لە بیرمان نەچێت کە ئەو مرۆیەکی عاتیفی و لە ئاماژەو جووڵەیشدا زێدەڕۆ بوو)

دیسان بارتلیف وتیەوە: "بە هەموو توانامەوە هاوکاریت دەکەم، دوای چەند دەقیقەیەکی‌تر سەر لە دکتۆر سکریتای[4] هاوڕێم ئەدەین کە لایەنە پزیشکیەت بۆ کارئاسانی بکات. بەڵام پێم بڵێ چۆن ئەتوانیت ڕۆزینا ڕازی بکەیت کە بێگومانم دژ بەڕای تۆیە"

—4—

ئەمە سێیەم باس بوو کە پێکەوە لەسەری بدوێن، دوای ئەوەی ترومپیت ژەنەکە نەخشەکەی خۆی بۆ باسکرد، بارتلیف وتی: "ئەم ڕووداوە شتێك وەبیر من دێنێتەوە کە لە کاتی هەرزەکاریدا بۆم پێش هات. ئەوسا کرێکارێکی بارهەڵگر بووم، کچێك قاوەی بۆ دەهێنایین، کچێکی هێند میهرەبان کە لەگەڵ کەسدا وشەی -نا-ی نەبوو، پیاوانیش، بەداخەوە، لەگەڵ دڵێکی وا بەسۆزو (لەشێکی وایشدا) لە باتی سوپاس و قەدرزانی زیاتر بەشێوەیەکی ناشیرین و دڵڕەقانە ڕەفتاردەکەن. تاقە کەسێك کە بە ئەدەب و ڕێزلێنانەوە لەگەڵ کچەدا مامەڵەی دەکرد من بووم، ئەگەرچی تەنیا منیش بووم کە لەگەڵیا نەنوستبووم، خۆشەویستیەکەم وایکرد کچە حەزم لێبکات و عاشقم بێت و، ئەگەر لەگەڵیا نەخەوم بە سووکایەتی پێکردنێکی زۆری بداتە قەڵەم، لەبەر ئەوە ئەو کارەم کرد. تەنیا یەك جاریش، پاشان ئەوەیشم بۆ ڕوونکردەوە کە من هەمیشە خۆشەویستیەکی ڕۆحیم بۆ ئەو هەیەو، لەوەودوا هەرگیز لەشمان لەیەکدی نزیك نابێتەوە، کچە دایەگریان و هەڵات. کە لە ڕێگاوبان بەلامدا تێدەپەڕی ڕووی لێوەردەگێرام و، وایشی پیشان دەدا لەگەڵ پیاوانی تردا زیاتر دەست بەکارە. دوومانگ تێپەڕی و خەبەری لێ گێڕامەوە کە دوو گیانە"

"کەواتە ئەوەی تۆیش تەواو وەك ئەمەی من وایە"

بارتلیف وتی: "هاورێ، ئەوە نازانیت کە چیرۆکەکەت ئەزموونی هەموو پیاوانی دنیایە؟"

"تۆ چیت کرد؟"

"ئەوکارەم کرد کە تۆ بەتەمایت بیکەیت. لەگەڵ تاقە جیاوازییەکدا. پلانەکەی تۆ وایە خۆت وا پیشان بدەیت ڕۆژینات خۆش دەوێت. بەڵام من بەڕاستیی عاشقی ئەو کچە ببووم، کچێکی هەژاری مەینەت بار هەموو لەگەڵیا ڕایان دەبواردو سووکایەتیان پێ دەکرد، مرۆڤێکی بەدبەخت کە بێجگە لە من کەسێك نەیلاواندبوو، بۆیە نەیدەویست لە دەستی بچم، تاقە ڕێگایش هەر ئەو ڕەوشە ناجۆرو سادەیە بوو کە بیری لێ کردبووەوە.. من لەو کارە بە تەنگ نەهاتم، چونکە دەمزانی خۆشی دەوێم. پێم وت: "من زۆر باش ئەزانم پیاوێکی دی سکی پڕکردوویت، وەلێ ئەوەیش دەزانم تۆ خۆشت دەوێم بۆیە دەتەوێت ئەو تەڵەیە بە من بتەقێنیت، بەڵام من وەڵامی خۆشەویستیەکەت بەخۆشەویستی دەدەمەوە. لام گرنگ نییە باوکی منداڵەکەی ناوسکت کێیە، گەر پێت خۆشە دەتهێنم"

"ئەمە شێتیە!"

"دەشێت. بەڵام ڕەنگە زۆر لەو ستراتیژیەی ئێوە لەبەرچاوتان گرتووە کاریگەرتربووبێت، من هەمیشە ئەوکچەم لەوە دڵنیا دەکرد زۆر خۆشم دەوێت و سوورم لەسەر هێنانی و منداڵ و هەموو شتێکی. سەر ئەنجام خۆی نەگرت و دایە پرمەی گریان، دانی بەوەدا نا کە درۆی لەگەڵدا کردووم، وتی دڵسۆزی من وای کردووە هەست بەوە بکات کە ئەو شایانی هاوشانی کردنی من نییەو هەرگیز ناتوانێت پەیوەندی هاوسەریم لەگەڵدا ببەستێت"

ترومپێت ژەنەکە نوقمی بێدەنگی بوو، بارتلیف لەسەری ڕۆیشت: "هیوادارم کەڵکتان لەم چیرۆکە وەرگرتبێت، نابێت تەنیا بەڕواڵەت وا خۆت

پیشانی ڕۆزینا بدەیت کە خۆشت دەوێت، لەباتی ئەوە، هەوڵ بدە پەیوەندییەکی ڕاستەقینەی لەگەڵدا دروست بکەیت و خۆشت بوێت. هەست بەوە بکات کە تۆ هاوخەم و دەردی ئەویت، تەنانەت ئەگەر فریویشت بدات، هەوڵدە فریودانەکەی لە ئەنجامی خۆش ویستنیەوە تەماشابکەیت، بێگومانم ناتوانێت بەرانبەر خۆشەویستیەکەتان بەرگە بگرێت و، خۆی، بۆئەوەی ئازارتان نەدات، هەنگاوی خۆ لێ دوورخستنەوەتان بۆ دەنێت"

قسەکانی بارتلیف زۆریان کار لە ترومپیت ژەنەکە کرد، وەلێ هەر ئەوەندەی باشتر ڕۆزینای هێنایەوە بیری خۆی، لەوە گەیشت ئەو ڕێگای عەشقەی بارتلیف بۆی دیاری کردبوو بۆ ئەو گەلێك ناهەمواربوو، ئەوە ڕێگای قەدیسەکان بوو نەك ڕێگای مرۆڤی ئاسایی.

—5—

ڕۆزینا لە پشت مێزێکی زوورە گەورەکەی دەرمانەوە دانیشتبوو، ئەو ژنانەی بە شێوەی جۆراوجۆر چارەسەر دەکران، لەسەر ئەو قەرەوێڵانەی لە پاڵ دیوارەکەدا ڕیزکرابوون لە حەسانەوەدا بوون. ڕۆزینا خەریکی دروست کردنی کارتی دوو نەخۆشی تازە بوو، مێژووی ڕۆژەکەی لەسەر نووسین، کلیلی دۆلاب، خاولی و چەرچەفی سپی درێژی دانێ، ئەوسا تەماشای سەعاتەکەی کردو بەرەو حەوزی پشت ڕاڕەوەکە چوو (تەنیا بەروانکەی پێوەبوو، چونکە ڕاڕەوە کاشیڕێژەکان گەرم و هەڵماویبوون) نزیکەی بیست ژن لەو ئاوە بەناو شفا بەخشەی حەوزەکەدا شڵپە شڵپیان بوو، بەناوبانگی لە سیانیان کرد کە کاتی مەلەکردنیان تەواو بووە، خانمەکان لێبڕاوانە لە حەوز دەرکەوتن و، بەدەم هەڵتەك هەڵتەکی مەمکە زلەکانیانەوە کە ئاویان لێ دەچۆڕا بەرەو ژووری دەرمان دوای ڕۆزینا کەوتن، لەوێ لەسەر قەرەوێڵە خاڵیەکان

ڕاكشان و بەنۆرە ڕۆزینا كەوتە چاودێرییان، چەرچەفی بەسەریاندا كێشا، بۆ وشككردنەوەی چاوی نەخۆشەكان سوودی لە سووچێكی چەرچەفەكان وەرگرت و پەتۆیەكی گەرمیشی پیادان، نەخۆشەكان زەردەخەنەیان بەڕوویەوە كردو ڕۆزینا وەڵامی نەدانەوە.

لەدایك بوون لە شارۆچكەیەكدا كە ساڵانە دەهەزار ژن هێرشی بۆ بكات و بە دەگمەن كوڕێكی گەنج ڕێی تێبكەوێت شتێكی ناخۆشە، ئەگەر ژنێك نیازی ئەوەی هەبێت بە بەردەوامی لەوێدا بژی، لە تەمەنی پانزە ساڵیدا بە تەواویی لە هەموو ئەو شیمانە (احتمال)ە ئیرۆسیانە شارەزا دەبێت كە دەشێت لە هەموو ژیانیدا پێی بگات. لەبارەی كۆچكردنیشەوە بۆ جێگایەكیتر، ئەو گەڕاوانەی ڕۆزینا كاری تیا ئەكردن مۆڵەت تیا وەرگرتنیان كارێكی زۆر زەحمەت بوو، دایك و باوكی ڕۆزینایش زۆر لەوە بە تەنگ دەهاتن كە سووسەیان بكردایە ڕۆزینا نیازێكی وای هەیە، بۆیە ئاسایی بوو ڕۆزینا كە زۆر بەرپرسیارانە هەموو كارەكانی خۆی ئەنجام دەدا لەگەڵ نەخۆشەكانیدا زۆر سۆزدار نەبێت، لێگەڕێن ئەمە بگێڕینەوە بۆ سێ هۆ:

ئیرەیی: ژنەكان لە ئامێزی مێردەكانیانەوە دەهاتنە ئەو مەڵبەندە تەندروستیە، لە دنیایەكی پڕ لە شەوق و زەوقەوە كە بە بۆچوونی ڕۆزینا هەزاران دەرفەتی تیا دەپشكوێت و ئەم هەرگیز نایگاتێ، ئەگەرچی ئەم لە زۆربەی نەخۆشەكانی خۆی لەش و لار زراف و ڕووجوانتر بوو.

بێجگە لە ئیرەیی پێ بردن، بێ ئارامی: ئەو ژنانەی دەهاتنە ئەوێ بەسەر گورشتەی ڕەنگاوڕەنگەوە دەهاتن، لەكاتێكدا كە ئەم هیچ سەرگورشتەیەكی نەبوو، ساڵ دوای ساڵ چ گۆڕانێك بەسەر چارەنووسیا نەدەهات، لە تەمەن بە باچوونی لەو شارەچكۆلەیەدا. شوێنێك كە هیچ تیا ڕووی نەدەدا ترسی

لێنیشتبوو، ئەگەرچی هێشتا گەنج بوو، هەمیشە وای بیردەكردەو پێش ئەوەی دەرفەتێك بۆ دەستپێكی ژیان بە دەست بێنێت تەمەنی دەگاتە كۆتایی.

هـۆی سـێیەم: ژنـەكان زۆر بـوون و ئەمـەیش لـە نرخـی كەمدەكردنـەوەو نەفرەتێكی غەریزیی لە ڕۆزینادا دروست دەكرد، ئەو بە خەمێكی زۆری ئەو هەموو سنگ و مەمكانە گەمارۆدرابوو كە سنگ و مەمكە جوانەكەی خۆیشی لەبەر چاو دەخست.

ڕۆزینا تازە بەدەم و چاوی گرژەوە، لـە پێچانـەوەی دواكەسـی سێ ژنەكە ببوەوە كە هاوكارە لاوازەكەی سـەری هێنایـە ژووری و هـاواری لـە ڕۆزینا كرد كە تەلەفۆن بانگی دەكات.

هاوكارەكەی هێند پەرۆشبوو كە ڕۆزینـا دەم و دەسـت زانـی كـێ لەسـەر تەلەفۆنە، لەكاتی هەڵگرتنی تەلەفۆنەكەدا ڕەنگی سوور داگەڕا.

كلیما سلاوی لێكردو لێی پرسـی كـەی كارەكـەی تـەواو ئـەبێت، ڕۆزینـا وەلامی دایەوە: "سەعات سێ لە كاردەبمەوەو نزیكی سـەعات چوار دەتوانین یەكتری ببینین".

پاشان باسیان لە باشترین جێگا كرد یەكتری تیا ببینـن، ڕۆزینا پێشنیازی گـەورەترین ڕێسـتورانی شـاری كـرد كـە بـە درێژایـی ڕۆژ كراوەیـە، هـاوڕێ لاوازەكـەی، كـە بـە ڕۆزینـاوە چەسـپی بـوو، چـاوی لـە لێـوی ڕۆزینـا كەلانەدەخست، سەری قایل بوونی بۆ ڕاوەشاند. ترومپیت ژەنەكە وتی وای پـێ باشە لـە شـوێنێكی تـردا ڕۆزینا ببینێـت، جێگایـەك بێـت بتوانـن پێكـەوە تەنیابن، پێشنیازی كرد بە ئۆتۆمبیلەكەی برۆنە دەوروبەری شار.

ڕۆزینا پرسی: "یەعنی چی؟ بچینە كوێ؟"

"هیچ نەبێت پێكەوە بە تەنیا ئەبین"

ڕۆزینا وتی: "ئەگەر پێت شەرمە لەگەڵ مندا بیت واچاکتربوو هەر لە ماڵەوە بویتایە"

هاوڕێکەی سەری ڕەزامەندی بۆ ڕاوەشاند.

کلیما وتی: "چ مەبەستێکم نەبوو، با وابێت، کەواتە سەعات چوار لە بەردەم ڕێستورانەکەدا چاوەڕێتم"

دوای ئەوەی ڕۆزینا تەلەفۆنەکەی دانا سستەرە لاوازەکە پێی وت: "زۆرچاکە، ئەو دەیەوێت لە کونێکی تەنگ و تاریکەوە بتبینێت، بەڵام دەبێت تۆ لەوە دڵنیابیت کە تا زۆرترین کەس پێکەوە بتانبینێت چاکترە"

ڕۆزینا بەهۆی دیدارەکەوە تووڕەو پەشۆکاو بوو. نەیدەتوانی شتێکی کلیما بێنێتەوە بەرچاوی، شێوەی، پێکەنینی، بەڕێگادا ڕۆیشتنی چۆن بووە؟ لەو یەکەمو دوا پێکگەیشتنەی لەگەڵیا تەنیا یادوەریەکی نادیاری لە زەینا ماوە. هاوڕێکانی بەپەرۆشەوە لەبارەی ترومپیت ژەنە بەناوبانگەکەوە لێیان دەپرسی، دەیانویست هەمووشتێکی دەربارە بزانن: چی وت، چۆن بوو، بە ڕووتی چۆن بوو، چۆن کردی. بەڵام ڕۆزینا نەیدەتوانی هیچ شتێکی دیارکراویان پێ بڵێت، بەردەوام ئەوەی دووپات دەکردەوە کە ڕووداوەکە "وەك خەون وابوو"

ئەمە تەنیا دووبارەکردنەوەی قسەیەك نەبوو، ئەو پیاوەی کە دوو سەعات لە باخەڵیا بووە، لە وێنەی پۆستەرێك دەچوو لە پڕا گیانی بە بەردا کرابێت و سێ ڕەهەندی بۆپەیدا بووبێت. گەرمایی‌و کێشی هەبێت. تەنیا بۆ ئەوەی کە دیسانەوە ببێتەوە بە وێنەیەکی بێ قەبارەو ڕەنگ کە هەزاران دانەی لێ چاپ بووبێت، بۆیە ئەبستراکتر و ناواقیعی تر بووبێت.

بەڵێ، ئەوی لە بیریا نەمابوو، ئەو ڕاستیە نادیارەی لابوو بە وێنەیەك کە ڕۆزینا بە هەستێکی ئازاراویەوە بەرجەستەی دەکرد، نەیدەتوانی

وردەکارییەك کە سەروبن بکات و لە خۆی نزیکتری بخاتەوە. کە کلیما دووربوو، ڕۆزینا پڕبوو لە ئیرادە، بەڵام کە ئێستا چاوەڕێی نزیك بوونەوەیەتی هەست بە بێ ورەیی دەکات.

سستەرە لاوازەکە وتی: "سەرکەوتووبیت، دوعات بۆ دەکەم"

—6—

دوای ئەوەی کلیما گفتوگۆ تەلەفۆنییەکەی لەگەڵ ڕۆزینادا تەواو کرد، بارتلیف دەستی گرت و بردی بۆ ساختمانەکەی مارکس کە عیادەو تەلارەکەی دکتۆر سکریتای لێ بوو، چەند ژنێك لە ژووری چاوەڕوانیدا بوون، وەلێ بارتلیف بێ وەستان بەرەو لای ژوورەکە چوو چوار جار لەسەرخۆ لە دەرگاکەیدا، دوای چەند چرکە ساتێك پیاوێکی بالا بەرز بە بەروانکەیەکی سپییەوە هاتە دەرەوە، چاویلکەکەی بەسەر لووتە زۆر زلەکەیەوە بوو، بەو ژنانەی وت کە لە ژووری چاوەنواڕیدا دانیشتبوون: "بەیارمەتیتان بۆ کەمەکێك" و هەردووکیانی بە پلیکانەکاندا بۆ تەلارەکەی سەرخست کە لە قاتی دووەمدا بوو.

کە هەرسێکیان دانیشتن، لەگەل ترومپیت ژەنەکەدا چاك و چۆنی کرد و پێی وت: "مامۆستا حاڵتان چۆنە؟ کەی کۆنسێرتێکی ترمان بۆ سازدەکەیت؟"

کلیما وەڵامی دایەوە: "هەتا ماوم کۆنسێرت لێرە ناکەم، ئێرە بۆ من بەدبەختیە"

دوای ئەوەی بارتلیف گرفتاریەکەی ترومپیت ژەنی بۆ دکتۆر گێڕایەوە، کلیما وتی: "لە هاوکاریتان گەلێك سوپاس گوزارم، دەمەوێت پێشان لەوە دڵنیابم کە بەڕاستی ڕۆزینا دووگیانە، دەشێت کەمێك سوورەکەی دوا

کەوتبێت، یان ڕەنگە بۆی دروست کردبم، جارێکی تریش ئەمەم بەسەر هاتووە، ئەوسایش هەر قژزەردێك بوو"

دکتۆر سکریتا وتی: "دەبێت لە قژ زەردەکان بترسیت"

کلیما ڕاکەی پەسەندکردو وتی: "ڕاست ئەکەیت، ئەم قژزەردانە من لەناو ئەبەن، دکتۆر سکریتا، نازانیت چ کابوسێك بوو، بەردەوام لێی دەپاڕامەوە خۆی پیشانی پزیشك بدات، بەڵام لە قۆناغی سەرەتایی سك پڕبووندا تاقیکردنەوەی پزیشکیش هیچ دەرناخات، حەزم دەکرد تاقیکردنەوەکە ئەنجام بدرێت، میزەکەی بکرێتە لەشی مشکێکەوە"

دکتۆر سکریتا بۆی تەواو کرد: "ئەوسا ئەگەر منداڵدانی مشکەکە گەورە بوو، مانای وایە ژنەکە سکی هەیە".

"خانم هەندێك لە میزی بەیانی خۆی کردە شووشەیەکی چکولەوە و هەڵیگرت، منیش لەگەڵیا چووم، کە گەیشتینە بەر عیادەکە شووشەکەی کێشا بە سەر شۆستەکەدا، وا پەلاماری ئەو پارچە شووشانەمدا دەتوت پارچەکانی جامی پیرۆزن(**) دەمویست هەرچۆنێك بێت چەند دڵۆپێکی بەنرخیم دەست بکەوێت، ئەو هەر بەدەستی ئانقەست ئەمەی کرد، چونکە چاك دەیزانی سکی نیەو تەنیا مەبەستی ئەوە بوو چەند بتوانێت ئازارم بدات"

دکتۆر سکریتا بە ساردییەکەوە وتی: "ئەمە ڕەفتاری هەموو قژ زەردەکانە"

بارتلیف کە دیاربوو لەسەر زانیارییەکانی سکریتا دەربارەی ژن شتێکی نەبێت وتی: "تۆ بڕوات وایە ڕەفتاری قژ زەردەکان لە ڕەفتاری گەنم ڕەنگەکان جیاوازبێت؟"

دکتۆر سکریتا وەڵامی دایەوە: "بێگومان، ڕووناك و تاریك دوو تەوەری تایبەتمەندییەکانی مرۆڤایەتین، قژی ڕەش توانای لەش، جوامێریی، بوێری و

کارداهێنان دەردەخات. لە کاتێکدا کە قژی زەرد ڕەمزی ژنایەتی، ناسکی و هەڵچوونە، ژنی مووزەرد لە ڕاستیا دوو بەرانبەری ژنی ترە، هەر لە بەر ئەوەیە کە دەبێت شازادەخانم مووی زەرد بێت، بۆیە ژنان– بۆ ئەوەی چەند بتوانن ژن بن– قژیان زەرد دەکەن و هەرگیز ڕەشی ناکەن".

بارتلیف وتی: "لە سووسەی ئەوەدام بزانم ڕەنگ چ کاریگەرییەکی لەسەر ڕۆحی مرۆڤ هەیە"

"مەسەلەکە ڕەنگ نییە، ژنی مووزەرد، چ هەر خۆی مووی زەردبێت یان ڕەنگی زەردی کردبێت، بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت خۆی لەگەڵ ڕەنگی مووەکەیدا دەگونجێنێت، هەوڵ ئەدات خۆی وەك بوونەوەرێکی بەنازو نوك، وەك بووکە شووشەیەك، وەك شازادە خانمێك دەربخات، دڵنەوایی و ڕێز، نزاکەت و ئافەرینی لێت دەوێت، کارەکانی بە باشی ناکات، دەرەوەی هەموو جوانی و شیرینیە و ناوەوەی هەموو بەدکارییە. ئەگەر مووی ڕەش بکرێتە مۆد، هەموو دنیا خۆش و دڵگیردەبێت، ئەمە بە سوودترین خەباتە لە باری چاکەی کۆمەڵایەتیەوە"

کلیما، کە دەیویست بە زۆر ئومێدێك بە قسەکانی سکریتا پەیدا بکات وتی: "کەواتە تۆ وای بۆ دەچیت، ڕەنگە ڕۆزینا بیەوێت یاریم لەگەڵدا بکات"

دکتۆر سکریتا وەڵامی دایەوە: "نا، پێرێ تێم ڕوانی، سکی هەیە، بێگومانم"

ڕەنگی پەڕیوی ترومپیت ژەنەکە سەرنجی بارتلیفی ڕاکێشاو وتی: "دکتۆر، وائەزانم تۆ سەرۆکی لیژنەیەکیت مۆڵەتی لەباربردن ئەدەن، وانیە؟"

دکتۆر سکریتا وتی: "ڕاستە، ئەم هەینییەیە کۆبوونەوەمان هەیە"

بارتلیف وتی: "زۆر چاکە، پێویستە زۆر زوو، پێش ئەوەی هاوڕێکەمان لێرەدا لەسەر خۆی بچێت کارێك بکەین، ئەزانم لەم وڵاتەدا منداڵ لەباربردن یاسایی نییەو مەسەلەیەکی حەساسە"

دکتۆر سکریتا هاوڕای بوو "بێ ئەندازە حەساسە، دوو پیرێژن لە لیژنەکەماندایە گوایە نوێنەری خەڵکین، تا بڵێیی ناشیرینن و ڕقیان لە هەموو ئەو ژنانەیە کە دێنە لامان، ئەزانیت گەورەترین دوژمنی ژن لەم دنیایەدا کێیە؟ خودی ژنە! نەك پیاو، نەك تەنانەت جەنابی کلیمایش کە تائێستا دووجار مۆری باوکایەتیان پێوە ناوە، من ئەڵێم، هیچ پیاوێك، بە ئەندازەی ژنێك لە هاوڕەگەزەکەی خۆی ڕقی نابێتەوە، بەڕای تۆ بۆ ژن دوای ئێمەی پیاو دەکەوێت؟ تەنیا لەبەر ئەوەیە کە خوشکەکانیان بریندار و سووك بکەن، خوا لەدڵی ژندا ڕقی ژنی تری دانا، بۆ ئەوەی ڕەگەزی مرۆڤ هەر لە زیاد بووندا بێت"

بارتلیف وتی: "لە قسەکانت دەبوورم، بەڵام لەبەر ئەوەی کات بە بەریەوە نییەو هاوڕێکەمان پێویستی بە یارمەتیە، ئەوەی من بیزانم لەناو لیژنەکەدا دوا قسە هی تۆیەو، ئەو دوو مریشکە پیرەیش گوێت لێ دەگرن"

سکریتا وتی: "ڕاست ئەکەیت، دوا قسە هی منە، بەهەرحاڵ، دەمێکە دەمەوێت دەستبەرداری ئەم کارەبم، کات بە فیڕۆدانەو من تاقە دینارێکم لێ دەست ناکەوێت، مامۆستای مۆسیقار، پێم بڵێ چەندت لە ئاهەنگێکی مۆسیقا دەست دەکەوێت؟"

ئەو بڕە پارەیەی کە کلیما وتی سکریتای سەرسام کرد.

"زۆرجار لەخۆم دەپرسم کە بڵێی نەتوانم وەك مۆسیقارێك نیوە خەرجیەکی مانگانەم بە دەست بێنم؟ ئەزانیت، تا ڕادەیەك تەپڵ لێدەرێکی باشم"

کلیما زۆر بە پەرۆشەوە لێی پرسی: "تۆ تەپڵ لێدەریت؟"

"بەڵێ، لە تەلاری کۆبوونەوەکانماندا پیانۆیەك و چەند تەپڵێکمان هەیە، کە دەستم بەتاڵ دەبێت دەکەومە پرۆڤە"

ترومپیت ژەنەکە لەو دەرفەتە خۆشحاڵ بوو کە بۆ پیاهەڵدانی دکتۆر بۆی رەخسابوو، بۆیە بەسەر سوورماوییەوە وتی: "مەحشەرە!"

"گرفتەکە لەوەدایە کە ئەم ناوە کەسی وای تیا نیە بتوانین تیپێکی مۆسیقای لێ دروست بکەین، تەنیا دەرمانسازەکەیە تارادەیەك پیانۆیەکی باش لێ دەدات، یەك دوو جار پێکەوە هەوڵمانداوە، بڕوانە شتێکم بە بیرداهات"

کەمێك وەستا. "ئەو رۆژەی رۆزینا دێت بۆلای لیژنەکە.."

کلیما هەناسەی هەڵکێشا. "هیوادارم ئامادەبێت!"

دکتۆر سکریتا دەستی راوەشاند: "مەترسە، هەموویان دەردەکەون، وەلێ لیژنەکە داوای باوکی منداڵەکەیش دەکات. بۆیە ناچاریت لەگەڵیا بێیت، لەبەر ئەوەیش کە پێویست ناکات تەنیا لەبەر خاتری ئەم کارە بێ مانایە بۆ ئێرە بێیت، من پێشنیازی ئەوە دەکەم رۆژێك پێشتر -کە دەکاتە رۆژی پێنج شەممەی ئەم هەفتەیە- بێیت و پێکەوە کۆنسێرتێك بۆ ئەو شەوە سازبکەین. ترومپیت، پیانۆ، تەپڵ Tres Faciunt orkestrum کە ناوی تۆیش بەسەر پۆستەرەکەوە بێت، ئیتر هۆڵەکە لێوان لێو دەبێت، ئەڵێی چی؟"

هەمیشە کلیما بەرێوە چوونی کاری هونەری خۆی زۆر بە هەند وەردەگرت و، تا دوێنێیش قەشمەری بەم جۆرە پێشنیازانەی دکتۆر دەهات. ئەمرۆ، بەهەرحاڵ، بێجگە لە جەستەی سستەرێك هیچی تری لە بیرنەبوو، بۆیە زۆر بە ئەدەبەوە وەڵامی دکتۆری دایەوە: "مەحشەرە!"

"بەڕاست؟ پێت باشە؟"

"زۆریش"

سکریتا ڕووی لە بارتلیف کرد و وتی: "ئەی تۆ ئەڵێی چی؟"

"بە بڕوای من بەرنامەیەکی زۆرچاکە، تەنیا ترسی وەختەکەیم هەیە، بە دوو ڕۆژ کارەکانتان پێك دێت؟"

سکریتا لە باتی وەڵام، لە جێگاکەی هەستاو چوو بەلای تەلەفۆنەکەوە، ژمارەیەکی لێدا، بەڵام وەڵام نەبوو، وتی: "کاری یەکەممان دروستکردنی پۆستەرە، دەبێت هەر لە ئێستاوە دەست بەکاربین، وەلێ پێ دەچێت سکرتێرەکەمان بۆ نیوەڕۆژە خواردن چووبێتە دەرێ. لە بارەی هۆڵیشەوە هیچ کێشەیەکمان نییە، ئەنجومەنی پەروەردە و فێرکردن هەموو پێنج شەموانێك لەبارەی ئەلکولەوە وتاربێژی تیا سازدەکات، بۆ ئەو شەوە وابڕیارە هاوڕێیەکم کۆڕی تیا بگێرێت، بەڵام بە بیانووی نەخۆشیەوە زۆری پێ خۆشە کۆڕەکەی نەگرێت، هەڵبەتە، دەبێت لە دەوروبەری نیوەڕۆدا لێرەبیت تا دەرفەتێکی کورتمان بۆ پرۆڤەکردن گیر بکەوێت، یان بە لاتەوە پێویست ناکات؟"

کلیما وەڵامی دایەوە: "بە پێچەوانەوە، بیرێکی زۆرچاکە، دەبێت کەمێك لەگەڵ یەکتردا خۆمان ئامادە بکەین"

دکتۆر سکریتا وتی: "منیش هەروا دەزانم، باچەند ئاهەنگێکی سەرنج ڕاکێش لە بابەتی "سانت لویز بلوز" و "ئەو کاتەی کە قەدیسەکان.." یان پێشکەش بکەین، من هەندێك تاك ژەندنی ئامادەم هەیە، زۆرم مەبەستە بزانم ئایا پێتان باشە؟ بەڕاست، ئەم دوای نیوەڕۆیە چی ئەکەیت؟ ڕەنگە بتوانین سوود لەو دەرفەتە بکەین و کارەکەمان خێراتر بەرێخەین"

"بەداخەوە دەبێت ئەم پاش نیوەڕۆیە لەگەڵ ڕۆزینادا دابنیشم و بیخەمە سەر کەڵکەڵەی منداڵ لە باربردنەکە"

سکریتا دەستی ڕاوەشاند "قیروسیا، ئەو بێ هیچ ئەملاو ئەولایەك قایل دەبێت"

کلیما وەك بپاڕێتەوە پێی وت: "دکتۆر سکریتا، هەرچۆنێکە، ئەگەر ناڕەحەت نابیت با ئەم بەرنامەیە بخەینە ڕۆژی پێنج شەممە"

بارتلیف پشتی کلیمای گرت و وتی: "منیش پێنج شەممەم پێ چاکترە، پێ ناچێت ئەمڕۆ هاوڕێکەمان بتوانێت مۆسیقا لێ بدات، لەو باوەڕەشدا نیم هەر ئامێرەکەی هێنابێت".

سکریتا قایل بوو "ڕاست دەکەن" و هەردووکیانی بەرەو ڕێستورانێکی ئەوبەر شەقامەکە برد، بەڵام ئەو سستەرەی لای سکریتا کاری دەکرد گەیشتە لایان، زۆری جەخت لە دکتۆرکرد بگەڕێتەوە عیادەکەی، دکتۆر سکریتا داوای لێ بوردنی لێکردن و لەگەڵ سستەرەکەدا گەڕایەوە لای نەخۆشە نەزۆکەکانی.

—7—

نزیکەی شەش مانگ دەبوو ڕۆزینا ژوورێکی لە ساختمانەکەی کارل مارکسدا بۆخۆی گرتبوو، پێشان، لەگەڵ دایك و باوکیدا لە گوندێکی نزیکدا دەژیا. بە درێژایی ئەم شەش مانگە لەوە گەیشت کە ئازادی، ئەو سەرکێشی و دڵنیاییەی بۆ فەراهەم نەهێنابوو کە خۆی خەونی پێوە دەدی، ئێستا، کە لەسەرکارەوە گەڕایەوە ماڵێ و، باوکی لەسەر قەنەفەی پاڵ ژوورەکەیدا بینی غافڵگیربوو، دیدارێکی زۆر ناجۆر، چونکە ئەو پێی خۆشبوو چەند بتوانێت ئارایشتی خۆی بکات، قژی دابێنێ و بەرگی هەڵبژاردە بپۆشێت.

بە تووڕەییەوە پێی وت: "چی ئەکەیت لێرە؟" ڕقی لە دەرگاوانەکەیش هەستابوو کە لەگەڵ باوکیدا بە میهرەبانی هەڵسوکەوتی دەکردو کە ئەم لەوێ نەبوایە دەرگای هاتنە ژوورەوەی بۆ دەخستە سەر پشت.

باوکی وتی: "ئەمڕۆ پرۆڤەمان هەیە، مۆڵەتێکی کەمم وەرگرتووە"

باوکی ئەندامی "سەندیکای میللی" بوو، کادرە پزیشکیەکانی گەڕاوەکە گاڵتەیان بەم جەنگاوەرە تەمەن شەست حەفتا ساڵانە دەهات کە: پارچەیەکیان بە قۆڵیانەوە دەبەست و بە فیزێکەوە شەقامەکانیان دەپێوا، ڕۆزینا بەم کارەی باوکی تەریق دەبووەوە.

بە بێزارییەوە بە باوکی وت: "پێم سەیرە خۆت بە کارێکی وا بێ ماناوە سەرقاڵ کردووە"

"دەبێت شانازی بە باوکتەوە بکەیت کە لە هەموو ژیانیدا تەنانەت ڕۆژێکیش تەمەڵی نەکردووەو نایشی کات، ئێمەی کۆن ئێستایش دەتوانین دەرسی ئێوەی منداڵ دابدەین"

ڕۆزینا بڕیاریدا لێی بگەڕێ تا قسەی خۆی بکات و ئەم بیری بخاتە سەر هەڵبژاردنی جلەکانی، دەرگای کۆمیدیەکەی کردەوە.

"چۆن؟ دەتوانن چی بکەن؟"

"بە لاتەوە سەیرە، ئێستا هەر تەماشای ئەم گەڕاوە بکە، ئێرە شوێنێکە لە هەموو دنیادا بەناوبانگە، وێستگەیە، بەڵام بزانە چەندە پیس و پۆخڵە! منالآن بێ ترس بەناو باخەکانیا ڕاکە ڕاکەیانە.

ڕۆزینا بەدەم سەروژێرکردنی کراسەکانیەوە کە هیچیشیانی بە دڵ نەبوو وتی:

"جا چییە؟"

"نەک تەنیا توولەکان، سەگەکانیش! یاسایەکی ئەنجومەنی شارەوانی دەڵێت پێویستە سەگ ببەسترێتەوە وڕست بکرێت، بەڵام کەس ئەمە ناکات، هەموویان دڵیان چی بوێت ئەوە دەکەن، تۆ تەماشایەکی وردی باخی گشتی بکە، ئابڕوو چوونە!"

ڕۆزینا کراسێکی دەرهێناو لەپشت دەرگا نیوەکراوەکەی کومێدیەکەوە کەوتە خۆ گۆڕین.

"هەمووی پڕە لە گەنوگو، تەنانەت سەرلمی یاریگاکە، ئەوە بێنە بەرچاوت کە منداڵێك لەو ناولمەدا یاری بکات و شیرینیەکەی لە دەست بکەوێتە ناو ئەو گەنوگوەوە، سەیرنیە کە دەوروبەرمان ئەم هەموو نەخۆشیەی تیا بێت! وەرە ئێرەوە!" باوکی ڕۆزینا ئەولای پەنجەرەکەی پیشاندا "بڕوانە، هەر ئێستا دەتوانم چوارسەگ بژمێرم کە بەناو باخەکەدا هاتوچۆیانە"

ڕۆزینا جلی لەبەرکردو بەرەو لای ئەو ئاوێنەیە چوو کە بە دیوارەکەوە هەڵواسرا بوو، ئاوێنەکە هێند بچووك بوو.. بە زەحمەت دەیتوانی تا ناوقەدی خۆی ببینێت.

باوکی وتی: "وا دەزانم گوێ لە قسەکانم ناگریت"

ڕۆزینا کە لەسەر نووکی پێی لە ئاوێنەکە دوور دەکەوتەوە بۆ ئەوەی جوانی کراسەکەی بەسەر قاچیەوە ببینێت، بە باوکی وت: "بۆ، گوێم لێتە، باوکە تکات لێ ئەکەم لێم تووڕە مەبە، چونکە پەلەمەو تا چەند دەقیقەیەکی تر دەبێت یەکێك ببینم"

باوکی وتی: "ئەوەی پەیوەندی بە منەوە هەیە ئەو سەگانەی ڕێگایان پێدراوە، سەگی پۆلیس و سەگی ڕاون، ئیتر من لەوە ناگەم بۆ خەڵکی لە ماڵەکانیاندا سەگ بەخێوئەکەن، ماوەیەکی تر ژنان دەستبەرداری منداڵ بوون دەبن و پاڵ بە گالیسکەی پڕ لە توولە سەگەوە دەنێن"

ڕۆزینا لە ئاوێنەکەدا خۆشیی لەخۆی نەهات. دیسان بەرەو کۆمیدیەکە ڕۆیشت و بەدوای کراسی تردا گەڕا.

"بڕیارماندراوە نابێت کەس سەگ لە ئاپارتمانەکاندا ڕاگرێت ئەگەر کرێ گرتەکان قایل نەبن، هەروەها داوایشمان کردووە باجی سەگداری زیاد بکرێت"

ڕۆزینا وتی: "خۆزگا منیش خەمەکانی ئێوەم هەبوایە" ڕۆزینا بیری کردەوە چەند خۆشە کە ئیدی ناچار نییە لەگەڵ دایك وباوکیا بژی، لە هەموو سەردەمی منداڵیدا، هەمیشە باوکی بە ئامۆژگاری و قسە بێ کۆتاییەکانی تووڕەی دەکرد، ئەم حەزی بە دنیایەك بوو خەڵکەکەی بە زمانێکی تر بپەیڤن.

"پێویست بە پێچ و پەنا ناکات، کێشەی سەگ کێشەیەکی گرنگە، ئەمە تەنیا بڕوای من نیە، بڕوای هەندێك لە دەسەڵاتدارە گەورەکانیشە، من وای بۆ ئەچم ئەوان لە بیریان چووبێت بزانن تۆ چ بڕوایەکی گرنگت هەیە"

لە کاتێکدا سەرنجی دابوە کچەکەی کە دیسانەوە بۆ گۆڕینی جلەکانی چووبوە پشت کۆمیدیەکەوە، لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

"بێگومان، پێت دەوتن گرنگترین شتی دنیا هەڵبژاردنی بەرگێکی گونجاوە"

ڕۆزینا لە حاڵێکدا کە جارێکیتر لەبەردەم ئاوێنەکەدا لە کەش و هەوای خۆیدا بوو، بە پرکێشیەوە وتی: "بێگومان جلی من زۆر لە سەگی ئێوە گرنگترە" ئەمجارەیشیان خۆشیی لە قەڵافەتی خۆی نەهات، بەڵام وردە وردە ئەو خۆش لێ نەهاتنەی ڕووی لەسەرپێچی کرد. بیری ئەوەی کە ترومپێت ژەنەکە خۆشی بێ و ترشی بێ، دەبێت ئەو بە بەرگی هەرزان و ناشیرینەوە ببینێت، ئاسوودەییەکی پێ بەخشی.

باوکی لەسەر قسەکانی ڕۆشت: "مەسەلەیەکی تەندروستیە، تا ئەوکاتەی شۆستەکانمان پڕە لە گووی سەگ، شارەکەمان لەمە پاکژتر نابێت، ئەمە

مەسەلەیەکی ئەخلاقیشە، پێویست ناکات خەڵکی لەبەر چەند دێڵە سەگێکی خوێڕی بە تەنگ بێن"

دەبوو شتێك ڕووبدات کە ڕۆزینا دەرکی نەدەکرد: وردە وردە سەرپێچی کردنەکەی، لە شێوەیەکی نهێنیدا لەگەڵ تووڕەیی باوکیدا تێکەڵ بوون، ئیدی هەستی بە نەفرەتی زۆر بەرانبەر بە باوکی نەدەکرد، بە پێچەوانەوە، بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت، وەك سەرچاوەیەکی توانا پێبەخشین سوودی لە ڕقەکەی باوکی وەرگرت.

باوکی وتی: "ئێمە هەرگیز لەماڵی خۆماندا سەگمان نەبووە، هەستیشمان نەکردووە جێی سەگمان خاڵی بێت"

ڕۆزینا لە ئاوێنەکەدا لە خۆی ڕاماو هەستی کرد سکەکەی توانایەکی تازەی تیا دروست دەکات. چییە ئەگەر جوان خۆی نەیەتە بەرچاو؟ ئەمە ڕاستە ترومپیت ژەنەکە بۆ بینینی ئەو هاتووەو خاکیانە داوای لێکردووە چاوی پێبکەوێت، لە ڕاستیا (تەماشای سەعاتەکەی کرد) ڕەنگە ئێستا چاوەڕێی بێت.

باوکی پێکەنی "هەموو شتێك ڕێکوپێك دەکەین، تەنیا پەلە مەکەو ببینە"

ڕۆزینا بە میهرەبانی و نیمچە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دایەوە:

"هیوادارم، بەڵام باوکە دەبێت ئێستا بڕۆم"

پێکەوە لە پلیکانەکان هاتنە خوارێو لە بەردەم ئاپارتمانەکەی کارل مارکسدا خواحافیزییان لە یەکدی کرد، ڕۆزینا لەسەرخۆ بەرەو ڕێستورانەکە بەڕێکەوت.

-8-

کلیما هەرگیز نەیتوانیبوو بە تەواوی دەوری هونەرمەندێکی ناودارو خۆشەویست ببینێت، وا دەهاتە بەرچاو کە ناوبانگەکەی لەنێوان خەمە هەنوکەییەکانی ژیانی تایبەتییدا گەلێك بووەتە مایەی دەردی سەری بۆی، هەر ئەوەندەی کە چووە ناو ڕێستورانەکەو وێنە گەورەکراوەکەی خۆی کە لە زەوی ڕامابوو، بەسەر پۆستەرە بەجێماوەکانی دوا کۆنسێرتەکەیەوە بینی، تووشی خەفەت و هەڵچوون هات. هەر بەدەم تەماشاکردنی دەورو بەریەوە، کە بە نیگەرانیەوە دەیویست نیشانەیەکی بەناوبانگیی خۆی لە دەموچاوی میوانەکاندا ببینێت، ڕۆزینای بەرەو ساڵۆنی نان خواردن برد. لە تەماشاکردنیان دەترسا، دەیزانی بەوردی لێی دەڕوانن و، ئیتر هەڵسوکەوتی لەژێر کۆنترۆڵی خۆیدا نییە، هەستی کرد چەند نیگایەك کردوویانەتە نیشانە، ویستی وێڵیان بکات و مێزێك کە لە دوای ساڵۆنەکەوە بوو، ئەو شوێنەی پەنجەرەیەکی گەورەی بەسەر باخەکەدا دەیڕوانی، دەست نیشان کرد.

هەر کە دانیشتن زەردەخەنەیەکی بەدەم ڕۆزیناوە کرد، دەستی لاواند و پێی وت جلەکانی لێدێت، ڕۆزینا خاکییانە بەرپەرچی دایەوە، ئەو هەر سووربوو لەسەر ڕایەکەی و دەیویست لەسەر سەرنج ڕاکێشیی ڕۆزینا زیاتر پێ دابگرێت. وتی: سەری لە سیمای سووڕماوە و، تەواوی دوومانگی ڕابوردوو هەر لەبیری ئەودا بووەو، لە خەیاڵیا وێنەیەکی وای کێشاوە کە بە بەراورد لەگەڵ ڕاستیەکەدا گەلێك کەمی هێناوە، وتیشی هەرچەندە بەو هەموو شەوق و عەشقەوە بیری لێکردۆتەوە، بەڵام هێشتا خۆی لەوە خۆشەویستترە کە ئەم لە خەیاڵیا وێنای کردووە.

ڕۆزینا وەڵامی دایەوە ئەو پشتگوێ خستنە بەردەوامەی لە دوومانگی ڕابوردوودا ترومپیت ژەنەکە بەرانبەری هەیبووە، لەگەڵ ئەم قسانەی ئێستایدا گوایە زۆری بیرکردووە تاڕادەیەك سەیر و سەمەرەیە.

کلیما پێشتر خۆی بۆ ئەم ڕاپرسیە تەواو ئامادە کردبوو، هەناسەی قووڵی هەڵکێشاو بە کچەی وت کە ئەو نازانێت لەم دوومانگەدا ئەم چ ئازارێکی کێشاوە. ڕۆزینا داوای ڕوونکردنەوەی لێکرد، وەڵێ ئەو پێی وت واچاکترە نەچنە ناو وردەکارییەکانی ئەو تووڕەهاتانەوە، هەر ئەوەی وت کە بووەتە قوربانیی بێ نمەکیەك کاتێك بەخۆی زانیوە لەم دنیایەدا تاك و تەنیایەو تەنانەت هاوڕێیەکی نییە.

کلیما لەوە ترسا ڕۆزینا بکەوێتە دوای وردەکاریەکان و ڕەنگە بیخاتە داوی درۆکانیەوە. بەڵام ترسەکەی بێ ئاکام بوو، ڕۆزینا بە پەرۆشەوە گوێی بۆ قسەکانی ڕاگرت و، ئەو روون کردنەوەیەی دەربارەی بێدەنگی دوومانگەی کلیما بیستی خۆشحاڵی کرد. بەڵام گوێی بەوە نەدا کە وردەکاریەکانی ئەو بەدبەختیە لە چیدایە. تاقە شتێك لە خەمی ئەومانگانە کە مەبەستی ڕۆزینا بێت تەنیا خەمەکانی خۆیان بوو.

ڕۆزینا وتی "زۆر بیرم لات بوو، بەدڵ حەزم ئەکرد هاوکاریت بکەم"

"هێند لە هەموو دنیا بێزاربووم نەمدەویست کەس ببینم، مرۆڤی غەمبار نابێتە هاوڕێی باش"

"منیش غەمبار و تەنیا بووم"

دەستی لەناو دەستیا لاواند "دەزانم"

"زۆر دەمێك بوو دەمزانی مناڵێکم لێت دەبێت، تۆیش هەرگیز تەلەفۆنت بۆ نەکردم، هەرچۆنێك بێت، بێ گوێدانە هیچ، مناڵەکەم دەپاراست، تەنانەت ئەگەر نەیشهاتیتایەو، نەتویستایە هەرگیز بمبینیت، بەخۆم وت تەنانەت

ئەگەر تاق و تەنیایش بمێنمەوە، هیچ نەبێت مناڵەکەتم هەیە. هەرگیز لەبار خۆمم نەدەبرد هەرگیز..."

کلیما سەری بە سووڕهات.

خۆشبەختانە، سەروکەللەی بۆیەکە دەرکەوت کە لەناو مێزەکاندا سست و خاو دەسووڕا، هاتە سەرمێزەکەیان تا پرسیاری خۆراکیان لێبکات.

ترومپیت ژەنەکە لەسەر خۆ وتی: "براندیەك" پاشان خێرا وتەکەی ڕاستکردەوە: "بیکە بە دوان"

کەمێك بێدەنگیی‌تر.

ڕۆزینا بەهێوری پێی وت: "ناهێڵم منداڵەکەم لێ بستێنن، بە هیچ نرخێك"

کلیما هاتەوە سەر خۆی "ئەم قسانە مەکە، هەر چۆنێك بێت، تۆ بەتەنیا دەرگیری ئەم مەسەلەیە نیت، منداڵ هەر گرفتی ژن نییە، پەیوەندی بە هەردوو کەسەکەوەیە، دەبێت بە جووتە بیری لێبکەنەوە، ئەگینا بەڕاستیی گیردەخۆن"

کە کلیما ئەم قسانەی کرد زانی ئێستا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دانی بەوەدا ناوە کە باوکی منداڵەکەیەو، دەبێت هەموو گفتوگۆکانی داهاتوو لەگەڵ ڕۆزینادا لەسەر ئەو بنەمایە بێت. ئەو بەپێی بەرنامە کاری دەکرد، ئەمە ڕێککەوتنێك بوو پێشەکی هەڵسەنگێنرا بوو، هەرچۆنێکە، کلیما لە قسەکانی خۆی ترسێکی لێ نیشت.

پێش خزمەتەکە بە دوو پەرداخ براندیەوە گەڕایەوە. وتی: "جەنابت کلیمای ترومپیت ژەنیت؟"

"بەڵێ"

"کچانی چێشتخانە ناسیتیان، وێنەی سەرپۆستەرەکە خۆتانن؟"

"بەڵێ"

بۆیەکە وتی "دەزانم کچانی تەمەن دوانزە ساڵ تا حەفتاساڵ دەتپەرستن" پاشان رووی لە رۆزینا کرد: "هەموو ژنان لە حەسوودیا خەریکە دەتەقن، نەهێڵیت چاوت دەربێنن" لە گەرانەوەیدا بۆ چێشتخانە چەند جارێك ئاوڕی دایەوەو لە حاڵەتێکی خۆشی و رووکراوەییدا زەردەخەنەی بۆ کردن.

رۆزینا جارێکی تر وتیەوە: "هەرگیز ناهێڵم منداڵەکەم لێ بستێنن و، تۆیش رۆژێك لە رۆژان، بەوە شادمان دەبیت منداڵێکت هەیە، من هیچم لە تۆ ناوێت، هەرگیز بیریش لەوە مەکەرەوە، بۆ چرکە ساتێك تووشی سەرئێشەت بکەم، پێویست بە نیگەرانی ناکات، ئەمە کێشەی منە، ئەگەر حەزیش دەکەیت هەر بە یەکجاری بیخەرە ئەستۆی من"

هیچ شتێك بە ئەندازەی ئەم جۆرە دڵنیاییە پیاو توورە ناکات، کلیما وای هەستکرد تادێت لە هێز و توانای کەم دەبێتەوە، لە رەوینەوەی مەترسیەکە تەواو نائومێدبوو، تەواو بێدەنگ بوو، قسەکانی دوایی رۆزینا هێند کرچ کرد دەتوت بەنائومێدیە بێ سنوورەکەی پێ دەکەنێ. بەڵام کلیما ژنەکەی خۆی هاتەوە بیرو زانی نابێت خۆی بە دەستەوە بدات. ئەمەندە دەستی بەسەرمێزە مەرمەرەکەدا سووراند تا بەردەستی رۆزینا کەوت. پەنجەکانی گوشی و وتی: "با کەمێك واز لە منداڵ بهێنین، هەر چۆنێك بێت منداڵ ئەوەندە گرنگ نییە، تۆ وا بیرناکەیتەوە کە ئێمە هەردووکمان قسەیەکمان نییە بۆ یەکتری بکەین؟ لەو باوەرەدایت کە من تەنیا بۆ خاتری منداڵێك تائێرە ئۆتۆمبیلم لێ خوری بیت تا بتبینم؟

رۆزینا شانی هەڵتەکاند:

"نازانیت چەند دڵم تەنگ بوە بۆت؟ شتێکی سەیرە، من و تۆ بۆ ماوەیەکی زۆر کەم یەکدیمان ناسی، کەچی رۆژێك نەبوە بیرم لات نەبێت"

کلیما بێدەنگ بوو، ڕۆزینا وتی: "دوو مانگی ڕێك تەنانەت گوێم لە وشەیەکت نەبووە، دووجاریش نامەم بۆ نووسیویت!"

ترومپیت ژەنەکە وتی: "ئازیزم، لێم زیز مەبە، من هەر بە ئانقەست وەڵامم نەداویتەوە، لە زریانی ناوەوەی خۆم دەترسام، بەرەنگاریی عەشقم دەکرد، دەمویست نامەیەکی درێژت بۆ بنووسم، بەڕاستییش چەند لاپەڕەیەکم ڕەش کردەوە، وەلێ دوایی هەموویانم تووڕدا، لەمەوبەر هیچ کاتێك ئەم عەشقەم بەخۆمەوە نەدیوە، ئەم عەشقە منی ترساند، پاشان شتێکی تریش لە ئارادابوو، بۆ نابێت دانی پیا نەنێم؟ دەمویست لەوە دڵنیابم کە ئایا ئەوە سۆزێکی ڕاستەقینەیە، سیحرو جادوویەك نیە خێرا هاتبێت و لە پڕا نەمێنێت. بە خۆمم وت: "ئەگەر تا مانگێکی تر هەر ئاوا عاشقێکی شەیدا بم، ئەوسا دەردەکەوێت ئەوە وەهم نییە، بەڵکو خۆشەویستیەکی ڕاستەقینەیە"

ڕۆزینا لەسەرخۆ وتی: "ئەی ئێستا ئەڵێی چی؟ ئایا هەر وەهم بوو؟"

هەر کە ڕۆزینا ئەمەی وت، ترومپیت ژەن هەستی کرد خەریکە نەخشەکەی سەردەگرێت، بۆیە دەستی کچەی هەر لە ناو دەستی خۆیدا هێشتەوە و زۆر بەهێوری کەوتە دواندنی، وتی لەو کاتەدا کە لەوێ دانیشتووە و تەماشای ئەکات، پەی بەوە دەبات مەبەستی نییە هەستی خۆی بە ئەزموونی ترەوە خەریك بکات، چونکە هەمووشتێك لەبیریدا تەواو ڕوونە، گفتوگۆ لەبارەی منداڵەکەوە بێ هوودەیە، چونکە لای ئەو تەنیا ڕۆزینا گرنگە نەك منداڵەکەی. ئەو منداڵەی کە هێشتا لەدایك نەبووە، بایەخی لەوەدایە کە ئەوی بۆلای ڕۆزینا هێناوە، بەڵێ، منداڵەکەی سکی ئەوی هێنابوە شوێنی سەرچاوەی ئاوەکانزا ییەکان و دەری خستبوو کە چەندی ڕۆزینا خۆش دەوێت "پێکە براندیەکی بەرزکردەوە" بەخۆشی منداڵەکە.

هەر لەوکاتەدا، لەو پێکهەڵدانە شوومەدا کە تاسە زمانیەکەی پێی کردبوو ترسا، بەڵام تازە درەنگ بوو، وشەکان لە دەمی هاتبوونە دەرێ، ڕۆزینا پێکەکەی بەرزکردەوە، لەسەرخۆ وتی: "بەڵێ، بەخۆشیی منداڵەکەمان" و پێکە براندیەکەی هەڵدا.

ترومپیت ژەن هەوڵیدا ئەوپێك هەڵدانە شوومە لە ناو کۆمەڵێك وتەدا ون بکات و جارێکیتر وتیەوە کە ڕۆژ و سەعات نەبووە بیر لە ڕۆزینا نەکاتەوە.

ڕۆزینا وتی بێگومانە، لە پایتەخت کۆمەڵ کۆمەڵ ژنی جوان و سەرنج ڕاکێش دوای دەکەون.

کلیما وەڵامی دایەوە کە لە نازو نووکیان بێزار بووە، ئەوان گازندەیان زۆرە، بەڵام ڕۆزینا شای حەقیقەتە، زۆریشی داخی بەوە خوارد کە تائێستا لێی دووربووە. ئایا ئەو ناتوانێت بێتە پایتەخت؟ ڕۆزینا وتی زۆری پێ خۆشە، بەڵام دۆزینەوەی کار لە پایتەختا ئاسان نییە.

کلیما زەردەخەنەیەکی بەسۆزی بۆ کردو وتی لەوێ خەڵکانێکی زۆری خاوەن دەسەڵات دەناسێت، کارپەیداکردن بۆی لە عیادە یان خەستەخانەیەکدا گران نییە.

ماوەیەکی زۆر هەر بەوشێوەیە قسەی کرد، هەردەستی گرتبوو، ئاگای لەوە نەبوو کچێکی جوان هاتبووە نزیك مێزەکەیانەوەو، هیچ گوێی لەوە نەبوو کە دەبێتە هۆی تێکدانی دانیشتنەکەیان، بوێرانەو بەدەنگی بەرز وتی: "جەنابتان کلیمای بەڕێزن! یەکسەر ئێوەم ناسی، دەتوانم ئیمزاکەتان لێ وەربگرم؟"

کلیما سوور داگەڕا، هاتەوە سەرخۆی کە لە شوێنێکی گشتی و لەبەردەم دانیشتواندا دەستی ڕۆزینا دەگوشێت و باسی خۆشەویستی بۆ ئەکات، وا خۆی هاتە بەرچاو کە لەسەرتەختەی شانۆیەك دانیشتووەو هەموو دنیا

بوونەتە بینــەری، بەمەبەسـتەوە تەماشـای هەوڵـە ناکامـەکانی دەکـەن و پێـی پێدەکەنن.

کچەکە پارچە کاغەزێکی بچووکیدایە، کلیما دەیویست زوو ئیمزاکەی بۆ بکات، وەلێ نە خۆی و نە کچەکە هیچیان قەڵەمیان پێ نەبوو، لەسـەرخۆ بـە ڕۆزینای وت"

"قەڵەمت پێیە؟"

کلیما بە چرپە ئەم پرسیارەی لە ڕۆزینا کرد لە ترسی ئەوەی نەکا کچەکە هەست بەبێ پەردەیی نێوانیان بکات، بەڵام هەر زوویش کلیما دەرکی بەوە کرد کە دەست لەناو دەستیەکەیان لە قسەکردنەکە زیاتر بەماناو دیارە، بۆیە ئەمجارەیان پرسیارەکەی بەدەنگی بەرزکرد: "قەڵەمت پێیە؟"

ڕۆزینـا بەسـەر تێـی گـەیاند کـە قەڵـەمی لا نیـەو کچەکـە گەڕایـەوە سەرمێزەکەی خۆی، هـەموو هاوڕێکـانی لـە دەرفـەتی دیـداری مۆسـیقارێکی بەناوبانگ کەڵکیان وەرگرت و لە دەوری کلیما کۆبوونەوە، قەڵەمیان دایەو، بۆ ئیمزا لەسەر کردن چـەند لاپەڕەیـەکیان لـە دەفتـەرێکی چکۆلـەی یاداشـتا لێ کردەوە.

لە ڕووی بەرنامە ڕێژییەوە کارەکە باش بەڕێوە دەچوو، چەند ژمارەی ئەو کەسانە زیادی بکردایـە کـە ئاگاداری پـەیوەندی گـەرم و گوڕی ئـەو دووانـەن، ڕۆزینا زیاتر لەوە دڵنیا دەبوو کە پەیوەندیی خۆشەویستی لەگـەڵ کلیمـادا ڕیشەدارو ڕوو لـە زیادبوونـە. بەڵام بیری کلیما هێنـد لـە نێـو قـەیرانی تـرس و نائارامیدا شلوێ ببوو بڕوای بەو لۆژیکە نەدەکرد، وای بیردەکردەوە هـەموو ئەو کەسانە هاوکاری ڕۆزینان، هەموویشیان شایەتی ئەوە دەدەن ئەو باوکی منداڵەکەیە "بەڵێ، هەردووکیانمان بینی، وەك دوو عاشق پێکەوە نووسابوون،

ئەو دەستی ڕۆزینای لەناو دەستیا دەلاوانـدو بـە شـەوقەوە لـە چـاوانی دەڕوانی".

خۆ بەزل زانین لە شپرزەیی‌یی مۆسیقارەکەی زیاد دەکرد، بەلای ئەوەوە ڕۆزینا هێند جوان و سەرنج ڕاکێش نەبوو کە لە بەردەم خەڵکیدا شایستەی خۆشەویستی ئەو بێت، لـەم لایەنـەوە تـا ڕادەیـەك بێویـژدان بـوو، لەڕاستیا ڕۆزینا زۆر لـەوە جوانتربوو کە کلیما لـەو ساتەدا دەهاتـە بەرچاوی، هـەروەك چۆن عەشق خۆشەویستەکەت لەبەر چاو جوانتر ئەکات، ژنێکیش کە مەترسی لێ بکرێـت وا تووشـی دڵـەڕاوکێت دەکـات و، هـەموو کەموکوڕییـەکانی بەشێوەیەکی نەگونجاو لات گەورە دەبن.

سەرئەنجام هەردووکیان بە تەنیا مانەوە، کلیما پێی وت: "من حەزم بەم شوێنە نییە، پێت خۆشە ماشێن سواریەك بکەین؟"

ڕۆزینا زوو قایل بوو، چونکە پەرۆشی بینینـی ماشـێنەکەی بـوو، کلیمـا حسابەکەیانی داو چوونە دەرێ، بەرانبـەر ڕێسـتورانەکە باخچەیـەکی بچـووك بـوو، لەگـەڵ ڕێڕەوێکـی بـە لمـی زەرد داپۆشـراودا، نزیکـەی دەپیـاو لەسـەر ڕێڕەوەکە بە ڕیز وەستابوون، زۆربەیان بەتەمەن بوون، بازوبەندێکی سووریان بەسەر قۆڵە چرچ و لۆچەکانیانەوە بەستبوو، هەریەکەو داردەستێکی درێژیان پێ بوو، کلیما بەسەر سووڕماویەوە وتی: "ئەمەیان چییە؟"

ڕۆزینا خێرا وتی: "هیچ نییە، بابڕۆین، ماشێنەکەت کوا؟" و هەوڵیدا زوو لەوێی دووربخاتەوە.

بەڵام کلیما نەیدەتوانی چاو لەسەر ئـەو پیرەمێردانـە هـەڵبگرێت، سـەری لەوە دەرنەدەکرد ئەودارە درێژانەی سەریان ئەڵقەیەکی تەلی پێوەیە کەڵکیان چییە. ئەوانە لەو پیاوە کۆنانە دەچوون کە چرایان دادەگیرساند، یان ڕاوچیی ماسیی باڵدار، یان ئەو پاسەوانانەی چەکی نهێنی هەڵدەگرن.

لەکاتی تەماشاکردنیدا، کلیما وای هاتە بەرچاو کە یەکێك لەو پیاوانە بۆی پێدەکەنێت. ترسا، لەوە ترسا کە تووشی واهیمە هاتبێت و وابزانێت هەموو خەڵکی پیلانی لێدەگێڕن، لێگەڕا ڕۆزینا خێرا بیگەیەنێتە پارکی وەستانی ماشێنەکان.

—9—

وتی: "پێم خۆشە بۆ شوێنێکی دوورت بەرم" دەستێکی بەسەر ستێرنەوەو، دەستەکەی تری خستبووە سەرشانی ڕۆزینا، "بەرەو باشوور، حەز ئەکەم لەگەڵتا بە شەقامە درێژەکانی کەناری دەریادا بئاژووم، ئیتاڵیات دیوە؟"

"نەء"

"بەڵێنم بدەرێ لەگەڵما بێیت"

"کەمێك زیادە ڕۆیی ناکەیت؟"

ڕۆزینا ئەم قسەیەی بێ مەبەست درکاند، بەڵام ترومپیت ژەنەکە لەوە ترسا "زیادەڕۆیی ناکەیت"ی کچەکە ئاماژە بێت بە قسە فریو دەرەکانی تری. بەڵام تازە نەیدەتوانی پاشەکشێ بکات.

"وایە، من زیادەڕۆیی ئەکەم، هەمیشە وام لە بیرکردنەوەدا، ئیتر من وام، بەڵام بە پێچەوانەی خەڵکی ترەوە، حەز دەکەم لە مەسەلەی بیروباوەڕدا زیادەڕۆبم و بەدییشی بهێنم. باوەڕبکە لە دنیادا هیچ شتێك لەو خەونە مەزنە جوانترنییە کە بەرگی واقیعیەتی پۆشی بێت. خۆزگا هەموو ژیانم تەنیا خەونێکی زێدەڕۆبوایە. خۆزگا هەرگیز ناچار نەبووینایە بگەڕێینەوە بۆ ئاوەکانزا ییەکە. خۆزگا ئەوەندەم بئاژوایە تا دەگەیشتمە دەریا، کارێکم لە

ئۆرکسترایەکدا دەگرتە دەست و لەم شارۆچکەی کەنار دەریایەوە دەچووینە شارۆچکەیەکی کەناری دی".

ماشێنەکەی لە شوێنێکی چاو ئەندازدا ڕاگرت، هاتنە خوارێ، کلیما پێشنیازی کرد لەناو دارستانەکەدا پیاسە بکەن. ماوەیەکی کەم گەڕان و پاشان لەسەر کورسیەکی دارین دانیشتن، کورسییەکە پاشماوەی سەردەمانێك بوو کە خەڵکی زۆریان کەڵك لە ماشێن وەرنەدەگرت و گەڕانی گوندیان پێ خۆشتربوو. دەستی لە قەدی ئالاَندو لەپڕا بە ئاوازێکی غەمگینەوە وتی:

"ئەزانیت، هەموو وا ئەزانن من زۆر بەختەوەرم، بەلاَم ئەمە زۆر لە ڕاستیەوە دوورە، من بەدبەختم، زۆریش. نەك تەنیا لەم مانگانەی دواییدا، بەڵکو زۆر پێشتر، زۆریش"

قسەکانی ترومپیت ژەنەکە لە بارەی سەفەری ئیتاڵیاوە بەلای ڕۆزیناوە ڕاست نەبوو (دەیزانی ڕێگادان بە سەفەری ئازادی دەرەوەی ولاَت گەلێك زەحمەتە) ئەو قسانە بێ بڕواییەکی تیا دروست کرد، کەچی بە پێچەوانەوە، ئەم قسانەی ئێستای پێ خۆشبوو کە بۆنی غەم و ئازاریان لێ دەهات، وەك بۆنی بەرخێکی برژاو هەڵی دەمژی.

"چۆن دەبێت لەنێو ئەم هەموو خەڵکەدا تۆ بەدبەخت بیت؟"

ترومپیت ژەنەکە هەناسەی هەڵکێشا "دەبێت، باوەڕبکە"

"تۆ پیاوێکی بەناوبانگیت، ماشێنی تازە، پارەو ژنی جوانیش.."

ترومپیت ژەنەکە بە ناخۆشییەوە وتی: "ڕەنگە جوان بێت.."

ڕۆزینا وتی: "ئەزانم، ئەو ئیتر گەنج نییە، هاوتەمەنی خۆتە، وانییە؟"

ترومپیت ژەنەکە زانی ڕۆزینا توانیویەتی زانیاریی تایبەتی لە بارەی ژنەکەیەوە بزانێت. ئەمە تووڕەی کرد، بەلاَم هەر چۆنێك بوو خۆی گرت "وایە، هاوتەمەنی خۆمە"

"باشە، تۆ لەو لایەنەوە هیچ گیروگرفتت نییە، بەڕاستی بەتەمەن نیت، زۆر گەنج دیاریت"

کلیما وتی: "بەڵام پیاو، بە تایبەتی پیاوی هونەرمەند، پێویستیی بە ژنی لەخۆی گەنجتر هەیە، ڕۆزینا، من پێویستم بە گەنجە، نازانیت چەندم پێ خۆشە کە تازە پێ ئەگەیت، هەندێکجار بیردەکەمەوە ئیتر ناتوانم بەرگەی ئەم حاڵە بگرم، زۆرم حەز لێیە خۆم ئازادبکەم، هەموو شتێك لەسەرەتاوە دەست پێبکەمەوە، ڕۆزینا، تەلەفۆنەکەی دوێنێ ئارەقەی نیشاندە سەرپشتم، هەستم کرد ئەو تەلەفۆنە خودی چارەنووسی منە"

بە هێوری پرسی "بەڕاستتە؟"

"تۆ دەزانیت بۆ یەك سەڵەف تەلەفۆنم بۆ دەکردیت؟ هەستم زۆر بەوە دەکرد کە نابێت کات بە فیڕۆ بدەم، دەبێت زوو بتبینم، زوو، زوو.."

کەمێك وەستاو لەناوچاوی ڕاما "ئەرێ خۆشت دەوێم؟"

وتی "زۆرم خۆش دەوێیت"

"منیش هەروا"

کلیما لێی نزیك بوەوەو دەمی خستە ناو دەمی، دەمێکی پاکیزە، جوان و شیرین، لێوی ناسك و، ددانی بە فلچە جوان پاك کرابوونەوە، هەموو شتێکی دڵگیربوو، لەڕاستیا هەر ئەمەیش بوو کە پێش دوومانگ، گیرۆدەی ماچی ئەو لێوانەی کرد، هەر ئەو دەمە بوو کە ئەوسا توند بۆلای خۆی ڕایکێشا، لەناو هەوری ئارەزوودا بینی و لە ڕووە ڕاستییەکەی تێنەگەیشت؛ زمانی بڵێسە و ئاوی ناو دەمیشی بادەیەکی مەستکەر بوو، ئەو دەمەی کە هیچ توانای سەرنج ڕاکێشانی نەما دەمی واقیعی بوو، واتا چاڵێکی پڕکار، کە دنیایەك کولێرە، پەتاتەو شۆربای پیا تێئەپەڕی، دەمێك ددانەکانی کرم خواردبوونی و ئاوەکەیشی نەك مەستی نەدەکردی، بەڵکو تۆپەڵە تفێك بوو بۆخۆی.

دەمی ترومپیت ژەنەکە پڕ بوو لە زمانی ڕۆزینا، بەڵام وای هەست ئەکرد تیکەیەکە نە دەتوانێت قووتی بدات و نە شیاوی فڕێدانیشە بۆ ئەو.

ماچەکە تەواو بوو، کەوتنە پیاسە، ڕۆزینا تاڕادەیەك دڵی خۆشبوو، لەوەیش بە ئاگابوو کێشەیەك هۆی تەلەفۆن کردنی ئەم بوو بۆ ترومپیت ژەنەکە، ئەو کێشەیەی کلیمای گەیاندبووە ئێرە، بە شێوەیەکی سەیر نەدەهاتە نێو گفتوگۆکانیانەوە. نەیدەویست لەوبارەیەوە بە درێژی لەگەڵیا بدوێت، بە پێچەوانەوە، باسەکەی ئێستایان زۆر دڵگیرترو گرنگتر دەهاتە بەرچاو، لەگەڵ ئەوەیشدا، دەیویست ئەو کێشەیەی کە بێدەنگیی لێکراوە، تەنانەت لە شێوەیەکی ئاساییدا، بێ هەراوزەنا باسی لێوە بکرێت، بۆیە کە کلیما-دوای ئەوەی زۆرێك لە عەشقی خۆی دووا- کە دڵنیای کرد بەهەمووتوانایەوە ژیانێکی تازەی بۆ دابین دەکات. ڕۆزینا وتی: "ئەمە ئەوپەڕی دڵسۆزیتە، وەلێ نابێت ئەوەت لەبیر بچێت کە ئیدی من یەکێك نیم"

کلیما وتی: "ڕاستە" زانی ئەو چرکەساتەی دەمێکە لێی دەترسێت وا گەیشت، ناسکترین جێگای فریودانەکەی.

دووبارەی کردەوە "بەڵی، ڕاست ئەکەیت، تۆ لەمەودوا تەنیا نیت، وەلێ زۆریش گرنگ نیە، من لەبەر ئەوەنا کە دووگیانیت، بەڵکو لەبەر ئەوەی خۆشم دەوێیت دەمەوێت لەگەڵتابم"

ڕۆزینا هەناسەی هەڵکێشا "وایە"

"هیچ کارێك لەوە ناشرینتر نیە دووکەس تەنیا لەبەر ئەوە ببن بە هاوسەر چونکە لە دەستیان دەرچووەو منداڵیان دروست کردووە ئازیزەکەم، ڕاستت دەوێت، دەمەوێت ڕێك وەك جاران وابیت، دەبێت هەر هەردووکمان بین، هیچ کەس نەیەتە بەینمانەوە، تێم دەگەیت؟"

ڕۆزینا بەرپــەرچی دایــەوە "ئـاھ، نـا، ئـەوە هـەرنابێت، مـن نـاتوانم کـاری وابکەم، هەرگیز کاری واناکەم"

ڕۆزینا زۆر بە پەرۆشەوە ئەمانەی وت، بەڵام بەرەنگارییەکەی لە بڕوایەکی قووڵەوە سەرچاوەی نەگرتبوو، هەرچۆنێك بێت، ئەو دوو ڕۆژ بوو گەیشتبووە ئەوە کە بە ڕاستیی سکی هەیەو، هێشتا ئەو مەسەلەیە لەوە تازەتر بوو کە بەرنامە یان ڕەنگڕێژی تازەی هێنابێتە ئاراوە، بەهەرحاڵ، لەوە گەیشتبوو، کە دووگیانیەکەی ڕووداوێکی گەورەی ژیانیەتی و دەرفەتێکە بەو زووانە دووبارە نابێتــەوە. هەسـتی سـەربازێکی یـاریی شـەترەنجی هـەبوو کـە گەیشـتبێتە دواخانـــەی شـــەترەنج و بووبێتـــە وەزیـــر. تـــامی دەســـەڵاتی تـــازەو چاوەڕواننــەکراوی خــۆی چەشــت. زانـــی تەلەفۆنەکـــەی گـــەلێك ڕووداوی ورووژاندووە: ترومپیت ژەنە ناودارەکە بە پەلە ماڵەوەی بەجێهێشتووە تا بگاتە لای ئـەم، بـە ئۆتۆمبیلـە جوانەکـەی لەگـەڵ خۆیـدا ئەملاوئـەولای پـێ بکـات، خۆشەویستی لەگەڵدا بکات، دیارە، لەنێوان دووگیانیی ئەم و ئەو دەسەڵاتە کتوپڕەدا پەیوەندییــەك هەیــە. ڕەنگــە بەدەســت بــەرداربوونی هەریــەکێك لــەو دووانە ئەوی تریشی لەدەست بچێت.

ترومپیت ژەنەکە دەبوو بەناچاری باداتەوە، "گیانەکەم، من بە تەمای ماڵ و منـاڵ پێکـەوەنان نیـم، مــن حــەزم لــە عەشــقە، تــۆ عەشــقی منیــت، منــداڵ خۆشەویستی دەگۆڕێت بۆ خێزان، بۆ بێزاریی، بۆ نیگەرانی، بۆ کـارکردنی ناچاریی. دڵخوازەکەت دەکات بە دایکێکی ئاسایی، حەز ناکەم تۆ ببیتە دایك، تـۆ خۆشەویسـتی منیـت، نامـەوێت یـەکێکی دی تـۆم لەگـەڵدا بـەش بکـات، تەنانەت منداڵیش"

هەموو قسەکان باش بوون، ڕۆزینا زۆری پێخۆش بوون. بەڵام بەو حاڵەیشەوە هەرسەری لەقاند: "نا، من ناتوانم کاری وابکەم، ئەمە جگەرگۆشەی تۆیە، چۆن دەتوانم دەستبەرداری جگەرگۆشەی تۆ بم؟"

کلیما چ پەساوێکی تازەی بە بیردا نەهات، بۆیە دەستی کردەوە بە دووبارەکردنەوەی قسەکانی پێشووی، لەوە ترسا ڕۆزینا پەی بە درۆکانی بەرێت.

ڕۆزینا وتی: "تەمەنت لە سی ساڵی تێپەڕیووە، ئایا حەز ناکەیت منداڵێکت هەبێت؟"

لە ڕاستیا، کلیما حەزی لەوە نەبوو، هێند کامیلای ژنی خۆشدەویست وای لێکدەدایەوە منداڵ دەبێتە شەریکە بەشی. ئەو قسانەی کەمێك لەمەوبەر بە ڕۆزینای وتبوو هەمووی هەر درۆ نەبوو، ساڵەهای ساڵ ئەو قسانەی بەڕاست و ڕەوانی بە ژنەکەی وتبوو.

"شەش ساڵە ژنت هێناوەو منداڵت نیە، خۆشحاڵم بەوەی توانیومە منداڵێکت پێ ببەخشم"

کلیما هەستی کرد تێکڕای شتەکان لە دژی ئەو دەکەونەوە، خۆشویستنی زێدە بەدەری کامیلای ژنی لە دیدی ڕۆزیناوە لەبەر ئەوە بوو کە ژنەکەی منداڵی نابێت و نەزۆکەو، هەر ئەمەیش هانی ئەو سەرەڕۆییە بێ شەرمانەیەیدا.

هەوا تا دەهات ساردتر دەبوو، خۆر لە ئاسۆ نزیك دەکەوتەوە، کات خێرا تێ ئەپەڕی، ئەویش هەرچیەکی بە ڕۆزینا وتبوو دووبارەی دەکردەوەو ڕۆزینایش سەری قایل نەبوونی ڕادەوەشاند کە نا، نا، ناتوانم. کلیما وای هەستکرد لە کۆڵانێکی بن بەستا گیری خواردووە. نەیدەزانی لەکوێوە سەر دەربکات و وای دەهاتە بەرچاو شتەکان لە تەقینەوەدان، هێند بەگیر هاتبوو لە

بیری چوو دەستی بگرێت، ڕایموسینێت و قسەی خۆشی لەگەڵ بکات، کە هەستی بە خۆی کرد هەوڵیدا بگەڕێتەوە سەر شۆڕو شەوقەکەی، وەستا، زەردەیەکی بۆ کردو لە ئامێزی گرت، ئەم لە ئامێز گرتنە نیشانەی ماندوویەتی و بێ توانایی خۆی بوو، بەخۆیەوە نووساند، ڕوومەتی بە ڕوومەتیەوە نا، لەڕاستیا پاڵی بە ڕۆزیناوە دابوو، پشووی دەداو دەحەساوە، پێدەچوو ئەو ڕێگایەی هەنگاوی بۆ دەنا زیاد لە توانای لاوازی خۆی سەخت بێت.

بەڵام بیری ڕۆزینایش لەکارکەوتبوو، ئەویش بەڵگەی تری بۆ نەدەرەخسا، دەیشیزانی بەم نکووڵی لێکردنە سەرسەختانەیە دڵی پیاو بەدەست نایەت.

ماوەیەکی زۆر لە ئامێزی یەکتردا بوون، کە کلیما باسکی لێ بەردا، ڕۆزینا سەری داخست و بە هەناسەی خۆ بەدەستەوە دانەوە وتی: "باشە، پێم بڵێ چی بکەم"

کلیما بڕوای بە گوێچکەی خۆی نەکرد، چونکە زۆر کت و پڕو چاوەڕوان نەکراو بوو، ئاسوودەگیەکی گەورەیش بوو، هێند گەورە کە ناچاربوو بەسەرخۆی نەهێنێت و ئاشکرای نەکات. دەستی نازی بەسەر دەموچاویا هێناو پێی وت کە دکتۆر سکریتا هاوڕێیەکی باشیەتی و، تەنیا کارێك کە پێویست بیکات ئەوەیە لە ماوەی سێ ڕۆژدا ئامادەی دانیشتنێك بێت، پێکەوە دەچنە ئەوێ، ترسیشی ناوێت.

ڕۆزینا پێچی تێنەخست، کلیمایش تاوێکی تازەتری بۆ بەکۆتایی هێنانی کێشەکە تێگەڕا، دەستی لە ئەستۆی کردو دیسان بۆلای خۆی کێشاو ماچیکردەوە (هێند خۆشحاڵ بوو کە دیسان تەمەکە دەم و لێوی ڕۆزینای داپۆشی)، ئەوەی بە گوێی ڕۆزینادا دایەوە کە پێی خۆشە ببیاتە پایتەخت، تەنانەت باسی سەفەرەکەی باشووریشی دووبارە کردەوە.

ئیدی خۆر لە ئاسۆ داکەوتبوو، دارستانەکە بەرەو تاریکیی دەچوو، مانگ لەسەر چڵی بەرزی درەختەکانەوە دەردەکەوت، گەڕانەوە لای ئۆتۆمبیلەکەیان، کە گەیشتنە شەقامە سەرەکیەکە لەپڕا بەرەو ڕووی ڕووناکییەکی زۆر تونـد بوونەوە، لە پێشا وایانزانی ڕووناکیی ئۆتۆمبیلێکە بەوێدا تێدەپەڕێت، بەڵام دەرکەوت بە دوایانەوەن، ڕووناکییەکە لە ماتۆڕسایکلێکەوە دەهات لەوبەری شەقامەکەوە وەستابوو، پیاوێکی بەسەرەوە بوو زۆر بەوردی تەماشای دەکردن.

ڕۆزینا وتی: "وەرە، باخێرا بڕۆین"

کە لە ماشێنەکەیان نزیکتر کەوتنەوە پیاو کە لەسەرماتۆڕسایکلەکە هاتە خوارێ و بەپێ بۆ لایان هات. ترومپیت ژەنەکە تەنیا سێبەرێکی تاریکی بینی کە لایتی گەورەی ماتۆڕەکە ڕووناکی دەکردەوە.

پیاوەکە بە پەلە بەرەو لای ڕۆزینا چوو، بە پەشۆکاوییەوە بەسەریا خوڕی "بوەستە، ئەبێت قسەت لەگەڵدا بکەم، ئەبێت بتبینم"

ترومپیت ژەنەکەیش شپرزە و تووڕە بوو، بێجگە لە تووڕە بوونێکی زۆر بەرانبەر بێ ئەدەبیی پیاوە غەریبەکە هەستی بە هیچی تر نەدەکرد.

بەتوندی وتی: "ئەو خانمە لەگەڵ مندایە"

پیاوەکە بە سەر ترومپیت ژەنەکەدا قیڕاندی "لەگەڵ تۆیشا قسەم هەیە، ڕەنگە وا بزانیت لەبەر ئەوەی ناوبانگت هەیە ئیتر هەرچیەکت بوێت بیکەیت! وا دەزانیت دەتوانیت هەموو کچێك تەفرە بدەیت! ئەم کارانە بۆ ناسراوێکی وەك تۆ زۆر ئاسانە!"

هەر ئەوەندەی کە ماتۆڕ سوارەکە بۆ چرکەیەك ڕووی لە کلیما کرد، ڕۆزینا بەپەلە فرسەتی هێناو خۆی فڕێدایە ناو ئۆتۆمبیلەکەوە. جامی ئۆتۆمبیلەکەی سەرخست و ڕادیۆکەی کردەوە، دەنگیمۆسیقایەکی بەرز لەناو ئۆتۆمبیلەکەوە

بەرزبوەوە، ترومپیت ژەنەکەیش سواری ئۆتۆمبیلەکە بوو و دەرگاکەی توند داخست، لە جامەکەوە چاویان لە پیاوە بەهەرا و زەناکە بوو چۆن دەستی ڕادەوەشاند.

ڕۆزینا وتی: "هەمیشە بە دوامەوەیە، نەخۆشی دەروونی هەیە، دەبێت زوو لێرە دووربکەوینەوە"

—10—

ماشێنەکەی وەستاند، تا ساختمانەکەی کارڵ مارکس ڕۆزینای ڕەوانە کردو ماچی ماڵ ئاوایی لێ کرد، کە ڕۆزینا لە دەرگاکە ئاودیو بوو، ئەم ئەمەندەی هەست بە ماندوو بوون کرد دەتوت تازە دە دوانزە شەوی بە بێخەوی گوزەراندووە، شەو داکەوتبوو، برسی بوو، هەستی کرد تەنانەت هێزی دانیشتنی پشت ستێرن و لێ خوڕینی نییە، حەزی لە قسە خۆشەکانی بارتلیف بوو، بەرەو ئەولای پارکەکە، بەرەو ساختمانەکەی ریچموند چوو.

کە گەیشتە بەردەم ساختمانەکە پۆستەرێکی گەورەی بینی گڵۆپی شەقامەکە ڕووناکی کردبووەوە. بەپیتی گەورە و ناشرین ناوی لەم سەرەوە تا ئەوسەری پۆستەرەکەی داگیرکردبوو. ناوی سکریتا و دەرمان ناسەکە بە پیتی بچووکتر لە خوارەوە نووسرابوون. پۆستەرەکەیان بەدەست دروست کردبوو، وێنەی ترومپیتێکی ئاڵتوونی لەسەر بوو.

کلیما ئەو ڕاگەیاندنە خێرایەی دکتۆر سکریتا بۆ سازدانی کۆنسێرتەکە بە پێشهاتێکی خێر هاتە بەرچاو، دکتۆر لەو کەسانە بوو پشتی پێ دەبەسترا.

کلیما بە پلیکەکاندا چووە سەرێ و لە دەرگای ژووری بارتلیفی دا، وەڵام نەبوو.

جارێکی دی کوتایەوە و هەردەنگ نەبوو.

پێش ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە لەکاتێکی نەگونجاودا هاتووە (پیاوە ئەمریکاییەکە ناوبانگی ژن بازیی هەبوو) دەستگیری دەرگاکەی هێنایە خوارێ، دەرگاکە دانەخرا بوو، ترومپیت ژەنەکە چوە ژوورێ، لە پڕا وەستا، سڵەمیەوە، ژوورەکە بێجگە لە ڕووناکیەك کە لە سووچێکەوە دەردەکەوت بە تەواوی تاریك بوو. ڕووناکیەکە نە لە ڕووناکیە سپیەکەی مانگەشەوی فلورانست دەچوو نە لە ڕووناکیە زەردەکانی گڵۆپ. ڕەنگی شین بوو، شینێکی سەیر.

لەوکاتەدا بزاوتی بیری سستی ترومپیت ژەنەکە گەیشتە لای بزاوتی دەستە بزۆکەکەی. بیری لەوە کردەوە کە بێ ئەدەبییە لە کاتێکی درەنگ وەختی وادا و بێ ئەوەی وەعدێکی پێشینەت هەبێت خۆت بکەیت بە ماڵی یەکێکیتردا. شەرمەزاربوو لە بێ ئەدەبیەکەی، گەڕایەوە ڕێزەوەو بە پەلە دەرگاکەی لەدوای خۆیەوە داخست، هێند پەشۆکابوو کە هەر لەوێدا وەستاو نەڕۆشت. دەیویست هەر چۆنێکە شتێك لەو ڕووناکییە بزانێت کەدیبووی، وای بۆ چوو دەشێت ئەمریکاییەکە خۆی دابێتە بەر تیشکی سەروو وەنەوشەیی. کەچی لە ناکاودا دەرگا کرایەوەو بارتلیف دەرکەوت، بەرگی تەواوی لەبەردابوو، هێشتا هەر جلەکانی بەیانی بوو، زەردەیەکی بۆ ترومپیت ژەنەکە کرد (پێم خۆشە هاتوویتەتە لام، فەرموو)

ترومپیت ژەنەکە فزولیانە چوەوە ژوورێ، وەلێ لەوە گەیشت کە ژوورەکە ئاسایی گڵۆپێکی هەڵواسراوی بنمیچ ڕووناکی کردبوەوە.

ترومپیت ژەنەکە وتی: "وابزانم لێم تێکدایت"

بارتلیف بەدەم ئاماژەکردنیەوە بۆلای پەنجەرەکە وەڵامی دایەوە:

"نەخێر، بە هیچ جۆرێك" ترومپیت ژەنەکە کەمێك لەوەوبەر وای هاتبووە بەرچاو کە ڕووناکییەکە لەوێوەوە بووە "لەوێدا دانیشتبووم و بیرم دەکردەوە، هەر ئەوەندە"

"کە تۆزێك لەمەو پێش هاتمە ژوورەوە -ببوورە سەرەڕۆ هاتم- ڕووناکییەکی سەیرم بینی"

بارتلیف پێکەنی "ڕووناکی؟ نابێت مەسەلەی سکەکە ئەمەندە بە قورسی بگریت، ئەگینا تووشی واهیمە دەبیت"

"ڕەنگە چاوم ڕێشکەوپێشکەی کردبێت، چونکە هۆڵەکە زۆر تاریك بوو"

بارتلیف وتی "ڕەنگە، بەڵام باسی بینینی ڕۆژینام بۆ بکە"

ترومپیت ژەنەکە چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە، دوای کەمێك بارتلیف قسەی پێ بڕی "بێگومان برسیتە"

ترومپیت ژەنەکە سەری ڕەزامەندی لەقاند، بارتلیف لە چەکمەجەیەکدا پاکەتێك پسکیت و قوتوویەك کونسروی ژامبونی دەرهێناو یەکسەر دەستی بە کردنەوەیان کرد.

کلیما کەوتەوە قسە، بە خۆشیەوە شێوەکەی خواردو فزولیانە لە بارتلیفی دەڕوانی.

بارتلیف دیسان دڵنیای کردەوە "من وای بۆ دەچم هەموو کارەکان باش بەڕێوە بچن"

"لەبارەی کابرای ماتۆڕسوارەکەوە چی دەڵێیت؟"

بارتلیف شانی هەڵتەکاند "نازانم، هەرچۆنێك بێت، ئیتر گرنگ نییە"

"ڕاستە، کێشەی من ئێستا ئەوەیە چۆن کامیلا تێبگەیەنم کە بۆ کۆنفرانسەکە وا درێژەی کێشا"

زۆر درەنگ ببوو، ترومپیت ژەنەکە، هێور و لەسەرخۆ سواری ماشێنەکەی بوو بەرەو پایتەخت بەڕێکەوت، مانگێکی خڕ و گەورەیش ڕێگای بۆ ڕووناك دەکردەوە.

*          *          *

*جامی پیرۆز: ئەو جامەیە کە مەسیح لە دوا شێودا بەکاریهێناوە.

**(1)Bartleff**
**(2)Saint Lazarus**
**(3)The ophilas**
**(4)Skreta**

**-1-**

سەر لەبەیانی ڕۆژی چوارشـەممە، ناوچـەی ئاوەکانزاییـەکان دووبـارە لـە جـۆش و خرۆشـی چالاکییـەکانی خۆیدابـوو. حـەوزەکان ئاویـان تێـدەڕژا، ماساژکەرەکان کەوتنەوە ڕاهێنانی دەستیان، چەرچەفە پاکەکان ئامادە کران، ئۆتۆمبیلێکی تایبەتی لە پارکەکەدا وەستا، ئەوە هەمان لیموزینەکەی دوێنێ نەبوو کـە هـەر لـەوێدا وەسـتابوو، بـەڵکو ماشـێنێکی ئاسـایی و سـادە بـوو، پیاوێکی تەمەن نزیك بە چل و پێنج ساڵ لە پشت ستێرنەکەوەو، هەرخۆی بە تەنیابوو، چەند جانتایەك لەسەر کوشنی دواوە لەسەریەك دانرابوون.

پیاوە لە ماشێنەکە دابەزی، دەرگاکەی داخست، چەند وردە دراوێکی بە پاسەوانەکە دا، بەرەو ساختمانەکەی کارڵ مارکس بەڕێکەوت، هـەموو ڕاڕەوەکەی بەپێوەدا تا گەیشتە عیادەکەی دکتۆر سکریتا، دوای ئـەوەی لە ژووری چاوەڕوانی تێپەڕی، لە دەرگای ژووری عیادەکەیدا، سستەرێك لـە درزی دەرگاکـەوە سـەری دەرهێنـا، پیاوەکـە خـۆی پێناسـاند و لـە ماوەیەکی زۆر کورتا دکتۆر دەرکەوت.

"یاکوب![1] کەی گەیشتی؟"

"هەر ئێستا"

"زۆرچاکە، قسەمان زۆرە پێکەوە بیکەین.. گوێ بگرە"

کـەمێك بـیری کـردەوەو وتـی: "نـاتوانم ئێسـتا ئـێرە بـەجێ بـهێڵم، وەرە لەگەڵما، با بەروانکەیەکت بدەمێ"

یاکوب پزیشك نەبوو، هەرگیز چاوی بە عیادەی تایبـەتی ژنان نەکەوتبوو، وەلێ دکتۆر سکریتا دەستی گرت و بـەرەو ئـەو ژوورەی بـرد کـە دیوارەکـانی سپی و ژنێك لەسەر پشت ڕاکشابوو.

سـکریتا بـە سسـتەرەکەی خـۆی وت: "بەروانکەیـەك بـدە بـە دکتـۆر" سسـتەرەکە دەرگـای دۆلاَبێکـی کـردەوەو بەروانکەیـەکی سـپی باشـی دایـە. سکریتا ڕووی لـە یاکوب کرد و وتـی: "فـەرموو وەرە ئـێرەوە، حەزئەکـەم لـە دەست نیشانکردنی نەخۆشیەکەدا پاڵپشتیم بکەیت" پێدەچوو ژنەکـە بـەوە دڵخۆش بێت کە پسپۆرێکی تر بۆ دۆزینەوەی نهێنی منداڵدانی هاتۆتە سەری، لە کاتێکدا کە هەموو هەوڵ و تێکۆشانی لە بەدیهێنانی منداڵێکدا تا ئێستا بە فیڕۆچوبوو.

دکتۆر سکریتا جارێکی تر کەوتەوە چاو گێڕان بە ناوەوەی نەخۆشەکەدا، چـەند زاراوەیـەکی لاتینـی وت کـە یـاکوب لـە ژێـر لێـوەوە وەك نیشـانەی پاڵپشتکردنی وەلاَمی دایەوە، پاشان پرسی: "چەند لێرە دەمێنیتەوە؟"

"ڕۆژێك"

"تەنیا ڕۆژێك؟ شتێکی خراپە، تەنانەت فریای قسەکردنیش ناکەوین"

ژنە ڕاکشاوەکە کە قاچی هەڵنابوو، وتی: "کە بەم جۆرە دەستم لێ دەدەیت ئازارم دەگاتێ"

یاکوب بۆ ئەوەی هاوڕێکەی بخاتە پێکەنین، وتـی: "کـەمێك هـەر ئـازاری هەیە، بە گشتی ئاساییە"

سکریتا وتی: "وایە، دکتۆر ڕاست ئەکات، هیچ نییە، بەگشتی ئاساییە، ڕستێك دەرزیتان بۆ دەنووسم، دەبێت هەموو بەیانیەك، پێش هەر شتێك بێیتە ئـێرە، سسـتەرەکە دەرزییـەکتان لێبـدات، ئێسـتا دەتوانیـت جلـەکانت لەبەربکەیت"

یاکوب وتی: "بەڕاستی هاتووم خواحافیزیت لێبکەم"

"مەبەستت چییە؟"

"دەڕۆم بۆ دەرەوەی ولاَت، ئاخری مۆڵەتی کۆچیان پێدام"

ژنە نەخۆشەکە جلەکانی لەبەرکرد و، ماڵئاوایی لە دکتۆر سکریتا و هاوکارەکەی کرد.

دکتۆر سکریتا بەسەر سوورماوییەوە وتی: "لە ڕاستیا شتێکی کت و پڕە، هەرگیز بیرم لێ نەدەکردەوە، ژنەکان ڕەوانە دەکەم بڕۆن تا کەمێك پێکەوەبین"

سستەرەکە خۆی خستە ناو قسەکانەوە و وتی: "بەڵام دکتۆر، دوێنێیش هەروات کرد، وا بڕوات لە کۆتایی هەفتەدا بەرنامەکانمان دوادەکەوێت"

سکریتا بەدەم هەناسە هەڵکێشانەوە وتی: "زۆر باشە، نۆرەی کێیە بابێت"

سستەرەکە نەخۆشێکی دوای ئەوی ئامادە کرد، دوو پیاوەکە بەسەر سوورماویەوە تەماشایان کرد، زانیان لە نەخۆشەکەی پێشوو جوانترە. دکتۆر سکریتا لێی پرسی ئاخۆ گەرماوەکان کاریان تێکردووە، پاشان داوای لێکرد بۆ تەماشاکردنی خۆی ئامادەبکات.

"زۆری خایاند تا پەساپۆرتیان دامێ، کە دایانمێ ئامادە بووم لەماوەی دوو ڕۆژدا بڕۆم، تەنانەت ئەرکی ئەوەیشم نەکێشا ماڵئاوایی لە کەس بکەم"

سکریتا وتی: "بەم هاتنەت دڵخۆشتر بووم" داوای لە ژنە گەنجەکە کرد لە سەرتەختی تێڕوانینەکە ڕابکشێت، دەستکێشە لاستیکیەکەی لە دەستکرد و کەوتە تەماشا کردنی ژنەکە.

یاکوب وتی: "نەمدەویست بێجگە لە تۆو ئۆلگا[2] کەسی تر ببینم، هیوادارم حاڵی باش بێت"

سکریتا وتی: "حاڵی باشە" بەڵام لە دەنگیا هەست بەوە دەکرا بێ بیرکردنەوە وەڵامی دابێتەوە. هەموو هەستی لای نەخۆشەکە بوو، وتی "ناچارم نەشتەرگەرییەکی بچووکت بۆ بکەم، مەترسە، هەرگیز ناڕەحەت نابیت" چووە لای دۆڵابە شووشەییە داخراوەکەوەو سرنجێکی دەرهێنا، سرنجەکە لە باتی دەرزی لوولەیەکی پلاستیکی پێوەبوو.

یاکوب پرسی: "ئەمە چییە؟"

"دوای ئەم هەموو ساڵە ڕێگایـەکی تـازەم دۆزیوەتـەوە گـەلێك كاریگـەرە، ڕەنگە ئەمە بە خۆپەرستی من بزانیت، بەڵام پێم چاکە ئەم نهێنیە لای خۆم بێت"

ژنەکـە هـەردوو قـاچی بڵاوکردبـوەوە، پرسـی "بەڕاسـت باشـم؟" دکتـۆر سـکریتا لـە کـاتێکدا کـە نووکـی سـرنجەکەی زۆر بـەوردی بـە لوولـەی تاقیکردنەوەکـەوە دەکـرد، وەڵامـی دایـەوە: "تـەواو باشـیت" پاشـان لـە نەخۆشەکە نزیك کەوتەوە، سرنجەکەی بە لەشیا کردو پاڵنەرەکەی ڕادا.

"ئازارتان نەبوو، نا؟"

ژنە وەڵامی دایەوە "نەخێر"

یـاکوب وتـی: "یـەکێکی دی لـە هـۆی هـاتنم ئـەوەبوو دەنکـە حەبەکـەت بدەمەوە"

دیسـان دکتـۆر سـکریتا ئاگـای لـە یـاکوب بڕابـوو، هـۆش و گۆشـی لای نەخۆشـەکە بـوو، زۆر بـە وردی تەماشـای سـەرتاپای کـرد وتـی: "بەڕاسـتیی حەیفە تۆ منداڵت نـەبێت. بەلـەکی بـەرز و جـوان، حـەوزێکی کەمـەری کـامڵ، قەفەزەیەکی سنگی قەشەنگ و سیمایەکی زۆر دڵگیرت هەیە"

ژێر چەنەی گرت و وتـی: "شەویلاگێکی چاك و بەهێزیشت هەیە، هەموو شتێکتان باش دروست بووە".

پاشان دەستی لە ڕانیدا و وتـی: "ئێسـکت یـەکجار پتـەوە، دەڵێـی لـەژێر ماسوولکەکانتەوە بریسکەیان دێت"

ماوەیـەك هـەر بـەدەم دەسـت لێدانـی لەشـی ژنەکـەوە ستایشـی لێ دەکـرد، ژنەکە نە بەرپەرچیەکی هەبوو نە پێکەنینی ناز، چونکە ئەو بایەخـە زۆرەی

دکتۆر پێی دابوو ئەوەی دوور خستەوە ئاماژە و بزاوتەکانی دکتۆر نیشانەی بێ ڕەوشتیان پێوە دیاربێت.

سەرئەنجام داوای لە نەخۆشەکەی کرد جلەکانی لە بەربکات و، گەڕایەوە لای هاوڕێکەی: "داوای لێبوردن ئەکەم، ویستت چی بڵێیت؟"

"وتم هاتووم حەبەکەت بدەمەوە"

"حەبی چی؟"

نەخۆشەکە بەدەم جل لەبەر کردنەوە وتی: "دکتۆر باوەڕت وایە ئومێدێکم هەبێت؟"

دکتۆر سکریتا وەڵامی دایەوە "من زۆر ڕازیم، هەموو شتێك باش بەڕێوە دەڕوات، هەردووکیشمان -تۆ و من- دەبێت چاوەڕێی سەرکەوتن بین"

ژنە سوپاسی دکتۆری کردو ڕۆشت، یاکوب وتی: "جارێکیان دەرمانێکت پێداوم چ کەسێك ئامادە نەبووە کاری وام بۆ بکات، ئێستا کە وڵات بەجێ دێڵم پێویستم پێی نەماوەو دەمەوێت بتدەمەوە"

"با هەر لات بێت، حەبی وا دەشێت لە هەموو جێگایەکدا کەڵکی لێ ببینیت"

"نا، نا، ئەم حەبە هی ئەم وڵاتەیە، نامەوێت شتێك کە هی من نییە لەگەڵ خۆمدا ببەم"

سستەرەکە پرسی: "دەتوانم نەخۆشێکی تر بانگ بکەم؟"

دکتۆر سکریتا وتی: "هەموو ئەو خانمانە بنێرەوە ماڵی خۆیان، بەشی ئەمڕۆم تەواوکردووە، ئەم نەخۆشەی دوایی کە ئێستا ڕۆشت دڵنیام منداڵی دەبێت، گرەوی لەسەر ئەکەم، ئەمە بۆ ڕۆژێك کارکردن بەسە، وانیە؟"

سستەرەکە تەماشایەکی خۆشەویستانەو لەهەمان کاتدا پڕ لە بایەخی دکتۆری کرد، دکتۆر لە ماناکەی تێگەیشت.

"زۆر باشه، زۆرباشه، با نەڕۆن، پێیان بڵێ نیوسەعاتی تر دەگەڕێمەوە"

"دوێنێش هەروات وت، تا دوایی ناچاربووم بێمە دەرێ و لەسەر شەقامەکە بتگرم"

سکریتا وتی: "نیگەران مەبە، هەر کە گەیشتە سی دەقیقە دەگەڕێمەوە"

پاڵتۆی هاوڕێکەی بە شوێن جلەکانەوە هەڵواسی، پاشان بردیە دەرەوەو لە ڕێگای باخەکەوە بۆ باڵەخانەکەی ڕیچموند چوون.

—2—

بە پلیکانەکاندا بەرەو قاتی دووەم و تا کۆتایی فەرشە درێژە سوورەکەی ڕاڕەوەکە چوون، دکتۆر سکریتا دەرگایەکی کردەوەو چووە ژوورێکی بچووک بەڵام دڵگیرەوە. یاکوب وتی:

"تۆ بەردەوام شوێنێك بۆ خەو و ژیانی من فەراهەم دێنیت ئەمە کارێکی زۆر مەزنە"

"لە کۆتایی ڕاڕەوەکەدا یەك دوو ژووریان بۆ نەخۆشە تایبەتیەکانی من تەرخان کردووە، هەر لە پاڵ ژوورەکەی تۆدا، ئاپارتمانێکی زۆر جوان هەیە کۆن خاوەن پیشە و وەزیرەکان سوودیان لێ بینیوە. ئەو شوێنەم بە یەکێك لە نەخۆشە بەنرخەکانم داوە کە ئەمریکاییەکی دەوڵەمەندەو خێزانەکەی خەڵکی ئێرەیە. بووینەتە هاوڕێی یەکتری".

"ئەی ئۆلگا لە کوێ ئەژی؟"

"لە باڵەخانەکەی مارکس، وەك خۆم، شوێنێکی خراپ نییە، نیگەران مەبە"

"لە ڕاستیا بەوە خۆشحاڵم کە چاودێریت لێکردووە، حاڵی چۆنە؟"

"ئەو ژنانەی زۆر حەساسن بەردەوام لە کێشەدان"

"لام سەیرنیە، بۆم نوسیبوویت لە ژیانیا چ ڕەنجێکی کێشاوە"

"زۆربەی ژنەکان بۆ سککردن دێنە ئێرە، بەڵام کچەتیوەکەی لای تۆ ئەگەر ئەویان نەکات ژیانی باشتر ئەبێت، تۆ تا ئێستا بەڕووتی بینیوتە؟"

یاکوب بەسەر سووڕماوییەوە وتی: "خودای میهرەبان! هەرگیز!"

"کەواتە باش ئاگاداریکە، مەمکەکانی چکۆلەو لاوازن، وەك دوو هەڵووژەی وشك بەسنگیەوە ئاوێزانن، پەراسووەکانی دیارن، دەبێت لەمەودوا زیاتر گوێ بە قەفەزەی سنگ بدەیت، سنگی ڕاست و دروست دەبێت نیشانەی هێرش هێنانی پێوە بێت، هێند پان و پۆڕبێت کە فەزایەکی زۆری بۆ خۆی داگیرکردبێت، ئەگەرچی، هەندێك قەفەزەی سنگ لە باری بەرگریدان، هێرش بۆ دەرەوە ناکەن، وەك چاکەتی شێتەکان ئەوەندە تەنگن مرۆڤ دەگەیەننە شەرای مەرگ، قەفەزەی سنگی ئۆلگا وایە، پێی بڵێ سنگیت پیشان بدات".

"من کاری واناکەم"

"لە بینینی دەترسیت، ئیتر ناتوانیت پارێزگاری لێبکەیت؟"

یاکوب وتی: "بە پێچەوانەوە، ئەترسم خەمی زیاتری بۆ بخۆم"

سکریتا وتی: "بەڕاست، ئەو ئەمریکاییە کەسایەتێکی زۆر سەرنج ڕاکێشە"

یاکوب پرسی: "لە کوێ دەتوانم بیبینم؟"

"کێ؟"

"ئۆلگا"

"ئێستا ناتوانیت بیدۆزیتەوە، لە ژێر چارەسەر کردندایە، هەموو بەیانیەکە دەبێت لە حەوزی مەلەدا بێت"

"پێم ناخۆشە نەیبینم، ناتوانم تەلەفۆن بۆ مەلەوانگەکە بکەم؟"

دکتۆر سکریتا بێ ئەوەی قسەی لەگەڵ یاکوبدا ببڕێت تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و ژمارەیەکی وەرگرت: "بە یەکترتان دەناسێنم، دەمەوێت

کەسایەتیەکەیم بۆ شی بکەیتەوە، تۆ سایکۆلۆژیەکی زۆر چاکیت، من و ئەو بەرنامەیەکمان بە دەستەوەیە"

یاکوب پرسی: "بەرنامەی چی؟" وەلێ سکریتا کەوتبووە قسەکردن.

"تۆ رۆزینای سستەریت؟ چۆنیت؟ لەو مەسەلەیە مەترسە، بۆ حاڵەتی تۆ ئاساییە، گوێ بگرە، بۆیە تەلەفۆنم بۆ کردیت بزانم نەخۆشێکم لەوێیە یان نا، دەزانیت کامە، ئەوەی لە پاڵ ژوورەکەی تۆدایە... لەوێیە؟ پێی بڵێ یەکێك لێرەیەو دەیەوێت بیبینێت... باشە، سەعات دوانزە لەبەردەم مەلەوانگەکە چاوەڕێی دەکات"

سکریتا تەلەفۆنەکەی دانا "گوێت لێبوو چیم وت، لەسەری نیوەڕۆدا دەتبینێت، ئاه، بەڕاست لەبارەی چییەوە دەدواین؟"

"لەبارەی ئەو ئەمریکاییەوە"

سکریتا وتی: "ئاه، بەڵێ، مرۆڤێکی سیحر ئامێزە، چارەسەری ژنەکەیم کرد، نەزۆك بوو"

"ئەی خۆی چییەتی؟"

"دڵی نەخۆشە"

"وتت پێکەوە بەرنامەتان هەیە؟"

سکریتا بە تووڕەییەوە وتی: "بەڕاستیی کارێکی شەرمەزارییە، لەم وڵاتەدا دکتۆرێك بۆ ئەوەی بتوانێت ژیانێکی شەرەفمەندانە بگوزەرێنێت پێویستە ڕەنج بکێشێت، سبەینێ کلیمای ترومپیت ژەنی بەناوبانگ دێتە ئێرە، منیش بۆ ئەوەی پارەیەکم دەست بکەوێت، دەبێت بە تەپڵەوە هاوکاری بکەم"

یاکوب وایزانی سکریتا گاڵتە دەکات، بەلام خۆی لەو دارەتە نەداو قسەکانی بە ڕاست وەرگرت: "مەبەستت چییە؟ تۆ تەپڵ لێ دەدەیت؟"

"بەڵێ، دەمەوێت خێزانێك پێکەوە بنێم، ئەی چی بکەم؟"

ئەمجارەیان یاکوب تەواو سەری سووڕمابوو "چیی؟ نەکەی ژنت هێنابێت"

"هێناومە"

"کڤیتا؟"[3]

کڤیتا پزیشکی گەڕاوەکە بوو، ساڵانێك لەگەڵ سکریتا زۆر هاوڕێ بوون. بەڵام سکریتا بەردەوام لە ژنهێنان ڕایدەکرد.

سکریتا وتی: "بەڵێ، کڤیتام هێنا، لە بیرتە هەموو ڕۆژانێکی یەك شەممە من و ئەو لە ڕوانگەکەدا پیاسەمان دەکرد؟"

یاکوب بە غەمبارییەوە وتی: "ئاخری هەر ژنت هێنا"

سکریتا لەسەر قسەکانی ڕۆشت "هەر جارێك کە دەچووینە ڕوانگەکە، کڤیتا دنەی ژنهێنانی دەدام، کە دەگەیشتینە سەر قەڵاکە ئەمەندە شل و شەکەت دەبووم هەستم بە پیری دەکردو حەزی ژنهێنانم دەجووڵا، بەڵام هەمیشە دەمتوانی کۆنترۆڵی خۆم بکەم، کە لە قەڵا دەهاتینە خوارێ دووبارە هێزو توانام تێ دەگەڕایەوەو زگورتیەتیم زۆر پێ خۆشبوو. هەرچەند، ڕۆژێکی یەك شەممەی شووم، کڤیتا لە تووڵە ڕێیەکەوە سەری خستم زۆر ناخۆشبوو، بە جۆرێك پێش ئەوەی بگەینە قەڵاکە بەدەم هەناسە بڕکێوە بەڵێنم دایە، ئێستا منداڵێکمان بەڕێوەیە پێویستە بیر لە پارە بکەمەوە. ئەمریکاییەکە نیگارکێشێکی مەزهەبییە. دەشێت داهاتێکی باش بێت، تۆ ئەڵێی چی؟"

"تۆ لەو باوەڕەدایت نیگاری مەزهەبی بازاڕی هەبێت؟"

"هەڵبەت، دەتوانین لە هەر شوێنێکدا مەزار هەبێت، لەپاڵ کەنیسەیەکدا، کۆشکێك بکەینەوەو سەدان وێنەی لەم بابەتە بفرۆشین، هەردووکمان دەوڵەمەند ئەبین، من ئەتوانم کارمەندی بم و قازانجەکەی لەگەڵدا بکەمە دوو کەرتەوە"

"ئەو ئەڵێ چی؟"

دكتۆر سكريتا وتی: "ئەو زۆڵە ئەوەندەی پارە هەيە نازانێت چيی لێبكات، دڵنيام ناتوانم قەناعەتی كاركردنی پێبكەم" و لە ژێر لێوەوە جوێنيدا.

-3-

ئۆلگا تەواو تێگەيشت ڕۆزينای سستەر لەپاڵ حەوزەكەدا دەستی بۆ ڕادەوەشێنێت، بەڵام لە مەلەكردن نەكەوت و وای دايە قەڵەم كە ئاگای لێنەبووە.

ئەو دوو ژنە يەكتريان خۆشنەدەويست، دكتۆر سكريتا لەپاڵ ژوورێكی ڕۆزينادا داينابوو، ڕۆزينا عادەتی وابوو دەنگی ڕاديۆ بەرزبكاتەوەو، ئۆلگايش حەزی لە بێدەنگی بوو، چەندين جار بە ديوارەكەييدا دەكێشا، سستەرەكەيش زياتر دەنگی ڕاديۆكەی بەرزدەكردەوە.

ڕۆزينا ئەمەندەی دەست ڕاوەشاند ئاخری سەرنجی نەخۆشەكەی ڕاكێشا و پێی وت يەكێك لەپايتەختەوە هاتووەو سەعات دوانزە دەيەوێت بيبينێت.

ئۆلگا يەكسەر زانی ياكوب هاتۆتە ديدەنی و بەمە زۆر خۆشحاڵ بوو، ئەم خۆشحاڵيەی پێ سەيربوو، لەخۆی پرسی بۆ كە هەواڵی هاتنی ياكوبی بيست ئەم شاديەی تێگەڕا؟ ئۆلگا لەو ژنە تازەكارانە بوو كە حەز ئەكەن خۆيان بكەن بە دوو بەشەوە، بەشێكيان ئەوەن كە ئەزموونی ژيان دەكەن و ئەوی دی ئەوەيە كە خۆی دەگرێ و پارێزكارە.

بەڵام ئێستا تەنانەت ئەو ئۆلگايەی كە پارێزكارە دڵخۆش بوو، زۆرباشی دەزانی ئەم هەموو شادمانيە، بەلای ئەويترەوە، ئۆلگای ئەزموونگەر، بێ كەڵكو ناشايستەيە، لەبەر ئەوەيش كە ئۆلگای پارێزكار حەزی بە ئازار بوو ئەم ناشايستەييەی پێخۆشبوو، خۆی سەرقاڵی ئەوە كرد كە ئەگەر ياكوب بەم شادمانييە زۆرەی ئەم بزانێت چەند دەترسێت.

میلی سەعاتی سەر مەلەوانگەکە سەعات دوانزە چارەك کەمی پیشاندەدا. ئۆلگا بیری لەوە کردەوە ئەگەر ئاوێزانی گەردنی یاکوب بێت و ماچبارانی بکات چ کارێکی لێ دەکەوێتەوە. بە مەلە هاتە کەنار حەوزەکەوە و لە ئاوەکە هاتە دەرێ، بۆ گۆڕینی جلەکانی چووە ژوورە بچووکەکە. پێی ناخۆشبوو زووتر ئاگاداری ئەودیدارە نەبووە، چونکە دەیتوانی بەرگی جوانتر و سەرنج ڕاکێشتر لەبەر بکات، ئێستا جلێکی خۆڵەمێشی و ئاساییە کە میزاجی هەڵی ناگرێت. هەندێك کات، بەتایبەت کە دەچووە مەلە زۆر گوێی بەڕواڵەتی نەدەداو مەبەستی نەبوو، وەلێ ئێستا بەرانبەر ئاوێنەیەکی بچووك وەستاوەو خۆی لە بەرگێکی ڕەنگ خۆڵەمێشی تێردا دەبینێت، تا پێش چەند دەقیقەیەکیش، بیری لە ئامێزگرتن و ماچ کردنی گەرمی یاکوب دەیخستە پێکەنینێکی ناجۆرەوە، بەڵام ئەمەی لەناو حەوزەکەدا بەبیردا هات، ئەو ساتەی گیانێکی بێ لەش و ئازادی مەلەکردن بوو، ئێستا کەجارێکیدی لەشی خزاوەتە ناو جل و بەرگەوە، هەستی کرد لەو ئارەزووە خۆشە زۆر دوورکەوتۆتەوە، زانی جارێکی دی بوەتەوە بەو ئۆلگایەی هەمیشە یاکوب خەفەتی لێ دەخوات، کچێکی بەدبەخت کە پێویستی بە یارمەتیدانە.

ئەگەر ئۆلگا کەمێك دەبەنگ بوایە بەڕاستیی خۆی بە جوان دەزانی، بەڵام چونکە بە ئاگایە، خۆی لەوە کەمتر هاتە پێشچاو کە هەیە، لە ڕاستیا، ئۆلگا نەجوان بوو نە ناشیرین.

ئۆلگای پارێزکار سەرکۆنەی خوشکە خاکیەکەی خۆی کرد: سیمای هەر چۆنێك بێت لە چی دەگۆڕێت؟

بۆ بەهۆی لەخۆ ڕامانی لە ئاوێنەدا ئازاری خۆی دەدات؟ بۆ ئەو شتێکە تەنیا بۆ تەماشا کردنی پیاو؟ وەك کاڵایەکی بازاڕ؟ بۆ خۆی لە داوی ئەو ڕواڵەت بینیە ڕزگار نەکات؟ ئایا ژن لەو ئازادیەی کە پیاوان هەیانە، بێ بەشن؟

له ساختمانەکە هاتە دەرێ و چاوی بەو پیاوە کەوت کە زەردەخەنەیەکی خۆشی بۆ کرد. دەیزانی یاکوب لەبری ئەوەی تەوقەی لەگەڵدا بکات وەك منداڵێك دەست بەسەریدا دێنێت، بەڕاستیش یاکوب وایکرد.

یاکوب لێی پرسی: "نیوە ڕۆژە لە کوێ بخۆین؟"

ئۆلگا پێشنیازی هۆڵی خواردنی نەخۆشەکانی بۆ کرد، چونکە جێگایەکی خاڵیی لەسەر مێزەکە هەیە.

هۆڵی نان خواردن تەلارێکی زۆر گەورەی پڕ لە مێزو خەڵکی بوو، یاکوب و ئۆلگا دانیشتن و زۆریان چاوەڕێ کرد تا ژنە پێش خزمەتەکە سووپیان بۆ بهێنێت، دوو کەسی تریش لەسەر مێزەکەیان دانیشتبوون، خەیاڵیان بۆ ئەوە چوو کە یاکوبیش یەکێکە لە نەخۆشەکان و لەگەڵیا کەوتنە قسە، بۆیە گفتوگۆی نێوان یاکوب و ئۆلگا لەچەند پرسیارێکی دیارو خێرا تێنەپەڕی: ئایا حەز لە خواردنی ئاوەکانزاییەکان دەکات، ئایا لە پزیشکەکەی ڕازییە، ئایا لە جۆری چارەکردنەکە قایلە؟ کە لە شوێن خەوتنەکەیشی پرسی، ئۆلگا وەڵامی دایەوە دراوسێیەکی خراپی هەیە، بەسەریشی ئاماژەی بۆ لای ڕۆزینا کرد کە لە نزیکیانەوە دانیشتبوو.

ئەو دووانەی لەسەر مێزەکەیان دانیشتبوون سەر ئەنجام هەستان و خوا خافیزیان لێکردن. یاکوب بەدەم تەماشاکردنی ڕۆزیناوە، وتی: "هیگڵ[4] لەبارەی لایەکی دەموچاوەوە کە بە زاراوەی یۆنانی لووت و تەوێڵ لە هێڵێکی ڕاستا پێك بگەن بۆچوونێکی سەرنج ڕاکێشی هەیە، بەلای هیگڵەوە جوانیی ئەو لا دەموچاوە مانایەك بە بەشەکانی سەرەوەی سەر ئەدات، ئەویش جێگای عەقڵ و ڕۆحە، لە تەماشاکردنی دراوسێکەتدا وام هاتە بەرچاو بە پێچەوانەی یۆنانیەکانەوە هەموو دەموچاوی لە دەمیا کۆبۆتەوە، بڕوانە چەند بە خۆشیەوە تیکە دەگلێنێت و لە هەمان کاتیشدا بەدەنگی بەرز دەدوێت. ئەم

شێوە هەڵکەوتنەی بەشی خوارووە کەبەشە ئاژەڵیەکەی دەموچاوە هیگڵ بە تەنگ دێنێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ئەم ژنە شتێکی تیا هەیە پێم ناخۆشە، دەبێت بیڵێم ژنێکی زۆر سەرنج ڕاکێشە"

ئۆلگا وتی: "بەڕاست وا بیردەکەیتەوە؟" لە دەنگیا هەست بە بێزاری دەکرا.

یاکوب خێرا وتی: "بەڵام لە دەمی دەترسم، دەترسم قووتم بدات"

لەسەری ڕۆشت: "ئەگەرچی هیگڵ ناتوانێت هیچ خەوشێك لە تۆدا بدۆزێتەوە، بەشی زۆری ڕووت تەوێڵت داگیری کردووەو ڕێك ئەوە لە هەموو کەس دەگەیەنێت کە چەند هۆشمەندیت"

ئۆلگا بە توندی وتی: "ئەم جۆرە بیروباوەڕانە لە پێستی خۆمم دەردەکەن، دەڵێن سیمای مرۆڤ وێنەی ڕۆحیەتی، ئەمە قسەیەکی تەواو بێ مانایە، من وا وێنەی ڕۆحم دەکەم کە چەنەیەکی گەورەو دەموڵێوێکی شەهوەت ئەنگێزی هەیە، کەچی چەناگە ڕاستیەکەی من بچووکەو زاریشم هەروایە، ئەگەر هەرگیز خۆم لە ئاوێنەدا نەدیبایەو ناچار بوومایە لە بەر ڕووناکی ئەو زانستیەوە کە لەسەر دەروونم هەیە وێنەیەکی سیمای خۆم بکەم، وێنەکەم کەمترین لێکچوونی لەگەڵ خۆمدا نەدەبوو، ئەسڵەن من بەو جۆرە نیم کە خۆم وا پیشان دەدەم".

—4—

دۆزینەوەی وشەیەکی گونجاو بۆ پێناسەکردنی پەیوەندی نێوان یاکوب و ئۆلگا کارێکی زۆر گرانە، ئەو کچی هاوڕێیەکی بوو کە لە تەمەنی حەوت ساڵانەی ئۆلگادا لە سێدارەیان دابوو، هەر ئەو کاتە یاکوب بڕیاریدا ئەو کچە هەتیوکەوتووە بخاتە ژێر باڵی خۆیەوە، خۆی منداڵی نەبوو، زۆریشی حەز

دەکرد باوکێکی دەربەست (مولتەزم) نەبێت، بە شۆخییەوە ناوی لە ئۆلگا نابوو بەچکەکەم.

ئێستا لە ژوورەکەی ئۆلگادا دانیشتبوون، ئۆلگا کتریەك ئاوی خستبووە سەر وەجاخە کارەباییەکەو، یاکوب دەیزانی ئاشکراکردنی هۆی ئەم دیدارە بۆ ئۆلگا زۆر ناخۆشە.

هەر کە دەیویست پێی بڵێت بۆ ماڵئاوایی هاتۆتە بینینی ترسی لێ دەنیشت، چونکە دەیزانی لەوانەیە هەواڵێکی هێند پڕ لە غەم و پەژارە بێت دۆخی دانیشتنە عاتیفیەکە تەواو تێك بدات، لە کۆنەوە هەستی بەوە کردبوو ئۆلگا بەنهێنی خۆشی دەوێت.

ئۆلگا دوو فنجانی لە سەبەتەکە دەرهێنا، کەوچکێك قاوەی خێرای کردە هەر یەکێکیانەوە، ئاوە لە کوڵەکەی تێکردن، یاکوب حەبە شەکرینەیەکی خستە فنجانەکەیەوەو لەسەرخۆ تێکیدا، گوێی لە ئۆلگا بوو کە دەیگوت: "یاکوب، شتێك هەیە پێم بڵێ، باوکم چۆن پیاوێك بوو؟"

"بۆ دەپرسیت؟"

"بەڕاست ویژدانی پاکبوو؟"

یاکوب پرسی: "بەڕاست دەتەوێت لەبارەی چیەوە بدوێیت؟"

دەمێك بوو باوکی ئۆلگا بە ئاشکرا ئابڕووی بۆ گەڕابووەوە و فەرمانی لە سێدارە دانەکەی بە نادادپەروەرانە دانرابوو. کەس گومانی لەوە نەبوو کە باوکی ئۆلگا بێ تاوان بووە.

ئۆلگا وتی: "مەبەستم ئەوە نییە، مەبەستم تەواو بە پێچەوانەوەیە"

"سەر لە قسەکانت دەرناکەم"

"پرسیارم لە خۆم دەکرد بە ڕاست تۆ بڵێی ئەوەی خەڵکی لەگەڵ باوکما کردیان ئەویش لەگەڵ خەڵکانیتردا نەیکردبێت؟، "بە هەرحاڵ، ئەوانەی

ئەویان بەرەو سێدارە کێش کرد تەواو وەك خۆی وابوون: هەمان بیروباوەڕیان هەبوو، هەمان توندڕەوی، بڕوایان وابوو هەر ڕایەکی پێچەوانەی ئەوان -چەندە بچووك و بێ بایەخیش بێت- هەڕەشەیەکی پڕ لە مەترسیە دژ بە شۆڕش، ئەوانە شێلگیرانە بەدگومان بوون، بەناوی بنەما پیرۆزەکانەوە کە ئەو خۆی بڕوای پێی هەبوو کوشتیان. ئەی تۆ چۆن ئەوەندە دڵنیایت کە ئەویش هەمان ئەو کارانەی لەگەڵ کەسی تردا نەکردبێت؟"

یاکوب بێدەنگ بوو، پاشان وتی: "زەمان تیژ تێئەپەڕێت، دەرککردنی ڕابوردوو تا دێت زەحمەت و زەحمەت تر دەبێت، تۆ لە باوکت، بێجگە لە چەند نامەیەك، چەند لاپەڕەیەك لە دەفتەری یاداشتەکانی کە ئەوان بەزەییان پیاتا هاتەوەو دایانیتەوەو، چەند یادەوەریەك کە لە هاوڕێکانیت بیستووە چیتر دەزانیت؟"

ئۆلگا بێ دەربەستانە وتی: "بۆ لە پرسیارەکەم هەڵدێیت؟ من ڕاست و ڕەوان لێم پرسیت: ئایا باوکیشم وەك ئەوانە وابوو کە لە سێدارەیاندا؟"

یاکوب شانی هەڵتەکاند "دەشێت"

"کەواتە بۆ دەبێت تووشی هەمان ئەو دڵڕەقیەی ئەوان نەبووبێت؟"

یاکوب هێور و هوشیارانە وتی: "لە لایەنی تیۆرییەوە، ڕەنگە ئەویش تووشی ئەو جۆرە نادادپەروەرییە هاتبێت کە بەسەر خۆیدا شکایەوە. لەسەر ئەم ئەستێرەیەدا کەسێك نییە بووبێتە هۆی کوشتنی یەکێك و بە ئازاری ویژدانەوە نەتلابێتەوە، من خۆم تووشی ئەو جۆرە کەسە نەهاتووم، ئەگەر ڕۆژێك مرۆڤایەتی بەو بارەدا بگۆڕێت، یەکێك لە تایبەتمەندییە ئینسانیەکانی خۆی لە دەست دەدات، لەو حاڵەدا نەك ئینسان، بەڵکو دەبێتە بوونەوەرێکی دی"

ئۆلگا وەك قسە بۆ هەزاران یاکوب بكات هاواری كرد: "من یەكێكم وەك ئێوە بیردەكەمەوە! ئێوە كە دەتانەوێت هەموو مرۆڤ تاوانباربكەن، تاوانەكانی خۆتان دادەپۆشن و، وایشی دەدەنە قەڵەم تاوانكردن تایبەتمەندییەكی ڕەسەنی ڕەگەزی مرۆڤە"

یاكوب وەڵامی دایەوە: "زۆربەی خەڵكی لەناو بازنەیەكی بچووك و تایبەتی خێزان و ماڵ و كارەكەیاندا دەژین، ئەوان لەسەر سنوورێكی ئارامی نێوان چاكەو خراپەدان، لە بینینی سەروساختی پیاوكوژێك دەترسێن، ئەوسا تاقە كارێك كە دەبێت بیكەن دەربازكردنی گیانیانە لەو سنوورە ئاسوودەیەو، ئەوانیش، گۆڕانیان بەسەردا دێت و دەبنە تاوانبار، بێ ئەوەی بەوردی لەوە گەیشتبن كە ئەمە چۆن ڕوویدا. مێژوو میانەیەكی بۆ مرۆڤەكان داناوە كە لە بەردەم گوشارو داوێكدا ڕایاندەگرێت كەس توانای بەرەنگاری كردنیانی نییە، بەڵام قسەكردن لەو بارەیەوە چ سوودێكی هەیە؟ ئەگەر باوكت لەڕووی تیۆرییەوە توانای ئەنجامدانی هەر جۆرە كارێكی بووبێت بە تۆ چی، بە هەرحاڵ هیچ ڕێگایەكیش بۆ سەلماندنی لە ئارادا نییە، تەنیا شتێك كە دەبێت بۆی بگەڕێیت ئەوەیە ئایا لە ڕاستیا باوكت چی كردووەو چی نەكردووە. لەم لایەنەوە ویژدانی پاكبووە"

"تۆ تەواو لەمە دڵنیایت؟"

"تەواو، كەس لە من باشتر باوكتی نەدەناسی"

ئۆلگا وتی: "بەڕاستیی لە بیستنی ئەم قسانە تەواو دڵخۆش بووم، دەزانیت، من هەروا بێ مەبەست ئەم شتانەم لێ نەپرسیت، ماوەیەكە نامەی بێ مۆرم پێ دەگات، پێم دەڵێن بۆم نییە دەوری كچە شەهید ببینم، چونكە باوكم لە ڕاوەدوونان و ئازاری گەلێك كەسی بێ گوناهدا بەشداری كردووە كە تاقە تاوانیان ئەوە بووە دنیا بینیان جیاوازیی لەگەڵ دنیابینی ئەودا هەبووە"

یاکوب وتی: "قسەی پووچە"

"ئەوانە باوکم بە پیاوێکی توندڕەو و بێ بەزەیی و زاڵم ناودەبەن، نامەکان ناشیرین و بێ مۆرن، بەڵام ڕەمەکی و بێ سەرەو بەرە نین، نووسەرەکانی قسەی خۆیان هەروا بەلاش و دەم هەڵبەست ناکەن و واقیعی و وردن، لەبەر ئەمەیشە تاڕادەیەك بڕوام بە قسەکانیان کردووە"

یاکوب وتی: "هەموو ئەمانە بێجگە لە زنجیرەیەك تۆڵەکردنەوەی بەردەوام چیتر نین، با شتێکت پێ بڵێم، کە باوکت گیرا بەندیخانەکان سیخناخ بوون لەو کەسانەی بەر یەکەمین شەپۆلی مەترسیی شۆڕش کەوتبوون. باوکتیان وەك سیاسەتمەدارێکی بەناوبانگی کۆمۆنیستی دەناسی، گیراوەکانی تر لە یەکەمین دەرفەتدا پەلاماریان داو ئەمەندەیان لێدا تا بێهۆش کەوت، پاسەوانەکان بە بزەیەکی ناپەسەندانەوە تەماشای دیمەنەکەیان دەکرد"

ئۆلگا وەڵامیدایەوە "ئەزانم" یاکوبیش ئەوەی دەزانی کە پێشتر ئەو چەندین جار ئەم چیرۆکەی گوێ لێبووە، زۆر دەمێکیشە بڕیاریداوە لەو بارەیەوە هیچ نەڵێت، وەڵێ ناکرێت، ئەمە لەوە دەچێت یەکێك جارێك لە ئۆتۆمبیلەکەیدا سەخت وەرگەڕابێت تۆ داوای لێبکەیت ئیتر بیری لێ نەکاتەوە.

ئۆلگا دووبارە وتی: "دەزانم، بەڵام لە بارێکی وادا من سەرزەنشتی ئەو زیندانیانە ناکەم، چونکە ئەوان بێ هیچ دادگایی کردنێك و زۆربەیان بێ هیچ بەڵگەیەك خرابوونە بەندیخانەوە. لە پڕێکا ڕووبەڕووی یەکێك دەبنەوە کە بە بۆچوونی ئەوان هۆی بەدبەختیەکەیانە"

"هەر لەو چرکەساتەوەی کە باوکت بەرگی زیندانی پۆشی بوو بە یەکێك لەوان، پەلاماردانی، بەتایبەت لەبەرچاوی پاسەوانە بزە لەسەر لێوەکان، کارێکی بێ مانابوو، بێجگە لە تۆڵە سەندنەوەیەکی ترسنۆکانە چیتر نەبوو، ئارەزوویەکی نامەردانە بۆ لێدانی قوربانییەکی بێچارە، ئەو نامانەی دەگەنە

دەستت سەرچاوەکەیان ئەو گیانی تۆڵەیەیە، کە وەك ئێستا من بۆی دەچم، سەردەمیش دەرەقەتی نایەت":

"گویّ بگرە، یاکوب، سەد هەزار کەسیان لە زیندان ئاخنی، هەزارانیان هەر لیّ نەگەڕایەوە. هیچ یەکێکیش لەوانەی هۆی ئەو نادادپەروەریە بوون سزا نەدران، ئەوەی ناوی تۆڵەی لیّ دەنێیت لە ڕاستیا تینوویەتی عەدالەتێکە کە تێر ئاونەبووە"

"ئازاردانی کچێك لەسەر باوکی هیچ پەیوەندییەکی بە دادپەروەریەوە نییە، تەنیا ئەوە وەبیر خۆت بێنەوە کە چۆن ناچاربوویت ماڵەکەت، شوێنی لەدایك بوونەکەت بەجێ بهێڵیت، واز لە خوێندن بێنیت، هەموو ئەمانە لەسەر باوکت، باوکێکی مردوو کە تاڕادەیەك نەتدەناسی! ئایا دەبێت ئێستایش لایەنێکی دی لەسەر باوکت ئازارت بدات؟ با ناخۆشترین ئەزموونی ژیانی خۆمت بۆ باس بکەم: هەرگیز قوربانیەکان لە دەسەڵاتدارە ستەمگەرەکان باشترنین، دەتوانم بە ئاسانی پێچەوانەکەی لە زەینی خۆمدا بەرجەستە بکەم، دەتوانیت ئەمە بە جۆرێك لە پاکانە، یان هەوڵێك بۆ خۆدەربازکردن لە بەرپرسیاریەتی و خستنی هەموو کارە نادروستەکان لە ئەستۆی خوایەك کە مرۆڤی بەو شێوەیە دروست کردووە دابنێیت و، ڕەنگە وەك ئەوەی تۆیش ئەیبینیت وابێت، چونکە گەیشتن بەو ئەنجامەی کە لەنێوان قوربانی و جەلاددا هیچ جیاوازییەك نەبێت، گەیشتنە بەو حاڵەتەی کە دەست لە هەموو ئومێدێك بشۆیت، ئەمەیش ئازیزەکەم، یەکێکە لە پێناسەکانی دۆزەخ".

—5—

دوو هاوکاری ڕۆژینا بۆ ئەوەی لە ئەنجامی دیدارەکەی دوێنێی بگەن خۆیان بەسەر پێوە نەدەگرت، بەڵام هەموو سەر لە بەیانییەکە لە بەشێکی تری

ئاوەکانزا ییەکاندا کاریان دەکردو، تا نزیک سەعات سێی دوای نیوەڕۆ نەیانپەرژایە سەر هاوڕێکەیان تا بەپرسیار دایگرن.

ڕۆزینا کەوتە منجە منج و پاشان بە کەم باوەڕییەوە وتی: "پێی وتم خۆشی دەوێم و دەمخوازێت"

سستەرە لاوازەکە وتی: "بڕوانە: پێم نەوتیت؟ لە ژنەکەیشی جیا دەبێتەوە؟"

"وتی دەشێت"

سستەرە بە تەمەنترەکە وتی: "دەبێت جیا بێتەوە، منداڵ گاڵتە نییە، ژنەکەیشی منداڵی نابێت"

ڕۆزینا بە ناچاری کەوتە ڕاستی وتن: "دەڵێت دەمبات بۆ پراگ، کارم بۆ پەیدا دەکات، لە پشوویەکدا دەچینە ئیتاڵیا، وەلێ نایەوێت وا زوو بچینە ژێر باری منداڵەوە، هەقیشیەتی، ئەم ساڵانەی سەرەتا خۆشترین ساڵن و، ئەگەر هەر لە ئێستاوە بچینە ژێر باری منداڵەوە چێژ لە یەکدی نابینین"

سستەرە تەمەن ناوەندەکە بە تەنگ هات و وتی: "چی؟ دەتەوێت لەبار خۆتی بەریت؟"

ڕۆزینا سەری قایل بوونی ڕاوەشاند.

سستەرە لاوازەکە بەسەر سووڕماوییەوە وتی: "شێت بوویت؟"

بە تەمەنترەکەیان وتی: "شتێکی لێکردوویت! هەر ئەوەندەی منداڵەکەت فرێدا پێت دەڵێت خواحافیز"

"جا بۆ دەبێت ئەم کارە بکات؟"

"گرەوم لەگەڵدا دەکەیت؟"

"ئەی ئەگەر خۆشی بوێم؟"

"بە چیا دەزانیت خۆشی دەوێیت؟"

"خۆی وای وت"

"ئەی بۆ دوومانگە نووزەی لێوە نەهاتووە؟"

"لە خۆشەویستی دەترسا"

"ئەمەیان یانی چی؟"

"نازانم چۆنتان پێ بڵێم؟ لەوە دەترسا عاشقم بوو بێت"

"کەواتە بۆیە نووزەی نەکردووە؟"

"دەیویست خۆی تاقی بکاتەوە، بزانێت دەتوانێت لە بیر خۆیم بەرێتەوە؟ قسەیەکی ڕاست و دروستە، وا نییە؟"

سستەرە بە تەمەنترەکە وتی: "وایە، بەڵام کە زانی سکی پڕکردوویت لە پڕا هاتەوە سەرخۆی کە ناتوانێت لە بیر خۆیت بەرێتەوە"

"ئەو دەڵێت دڵخۆشە بە سکەکەم، نەك لەبەر منداڵ، بەڵکو لەبەر ئەوەی لێم وە ئاگاهاتەوە، بووە هۆی ئەوەی بزانێت چەندی خۆش دەوێم"

لاوازەکەیان وتی: "خودا گیان، چەند دەبەنگیت؟"

"بۆ دەبەنگم؟"

بە تەمەنترەکەیان وەڵامی دایەوە: "چونکە تۆ هیچت بەسەریەوە نییە منداڵەکە نەبێت، کە ئەوەت لە دەستدا، ئیتر هیچت پێ نامێنێت و بۆی دەردەچێت"

"حەز ئەکەم لەبەر خۆم بمخوازێت نەك لەبەر منداڵەکە"

"ئاخر تۆ خۆت بە چی ئەزانیت؟ تووخوا بۆ دەبێت لەبەر خۆت بتهێنێت؟"

هەرایان هەر بەردەوام بوو، دوو هاوکارەکەی جەختیان لەسەر ئەوە دەکرد کە منداڵەکە تاقە چەکی دەستیەتی و نابێت لە دەستی بدات"

لاوازەکەیان دیسان وتی: "حەز ئەکەم ئەوەت پێ بڵێم ئەگەر من بوومایە لە باتی تۆ هەرگیز نەمدەهێشت منداڵەکەم پێ لەناوبەرن، سەدساڵ لەوێدا بێت کاری وا ناکەم"

ڕۆزینا وەك کچۆڵەیەکی لە دووڕیانێکدا بەگیر هاتوو وتی "باشە پێم بڵێن چی بکەم!" (ئەمە هەمان ئەو قسەیە بوو کە دوێنێ گیانی بە بەر کلیمادا کردبووەوە)

سستەرە بە تەمەنترەکە وتی: "توند چەکەکەت بگرە"

چەکمەجەیەکی کردەوەو لوولە حەبێکی بە ڕۆزینا دا "دەی، یەکێك لەم حەبانە بخۆ، مێشکت زۆرماندووە، ئەم حەبە خاوت دەکاتەوە)

ڕۆزینا حەبێکی خستە دەمیەوەو قووتیدا.

"ئەو حەبانە هەڵبگرە، ڕۆژی سێ دانەی لێ بەکاردێت، بەلاَم تۆ تەنیا ئەو کاتە دانەیەکی لێ بخۆ کە مێشکت ماندووەو پێویستە بێیتەوە سەر خۆت، کەسانێك هەن کە زۆر هەڵدەچن کەرایەتی دەنوێنن، لە بیرت نەچێت کلیما ڕێویە پیرەیەکی فێڵبازە، زۆریش بە ئەزموونە، بەلاَم فێڵەکانی ئەمجارەی سەرناگرن"

دیسان ڕۆزینا سەری لێشێواو نەیزانی چی بکات، کەمێك لەمەوبەر لە بڕیارەکانی خۆی دڵنیابوو، بەلاَم بەڵگەی هاوڕێکانی هێند قایلکەربوون دوودڵیان کرد، هەر بەو شپرزەییەوە ئەوێی بەجێهێشت.

کە گەیشتە ڕاڕەوی قاتی خوارەوە، کوڕێکی لاو، بە شەڵەژاوی‌و دەموچاوێکی داگیرساوەوە خێرا ڕێی پێگرت. ڕۆزینا بە تووڕەیی پێی وت: "سەد جارم پێ وتوویت هیچ کاتێك لێرەدا چاوەڕێم مەکە، بەهەرحاڵ، لەو بێ شەرمیەی دوێنێتەوە لام سەیرە هێشتا ڕووی ئەوەت ماوە بمبینیت"

کوڕە لاوەکە لێی پاڕایەوە "تکات لێدەکەم لێم زویر مەبە"

ڕۆزینا بێدەنگی کرد "وس! وابزانم دەتەوێ لێرەیش گۆبەنێکمان بۆ بنێیتەوە" گەڕایەوە کە بڕوات.

"ئەگەر حەزت بە گۆبەن نییە بوەستەو قسەم لەگەڵدا بکە!"

ڕۆزینا چ ڕێگایەکی دی لە پێش نەبوو، نەخۆشەکان لە هەموولاوە لە هاتوچۆدا بوون و جارجارە سستەرێك یان پزیشكێك بە بەروانکەیەکی سپییەوە بەلایاندا تێدەپەڕین، ڕۆزینا نەیدەویست لێی بڕوانن، بۆیە ناچاربوو بوەستێ و سیمایەکی بێ دەربەستانە لە خۆ بگرێت.

لەسەر خۆ وتی: "تۆ چیت گەرەکە؟"

"هیچ، بەس ئەوەندەم گەرەکە تۆ لێم خۆش بیت، لەوکارەی کردم بەهەق پەشیمانم، وەڵێ سوێندم بۆ بخۆ کە هیچتان لە بەینا نییە"

"پێشتر پێم وتوویت هیچ لە نێوان من و ئەودا نییە"

"سوێندم بۆ بخۆ"

"کەر مەبە، لەبارەی ئەم جۆرە بێ عەقڵیانەوە من بڕوام بە سوێند نییە"

"چونکە شتێکتان لە بەینایە!"

"پێم وتیت هیچمان لە بەینا نییە، ئەگەر بڕوا ناکەیت ئیدی قسە لەسەرکردنی زیادەیە، ئەو تەنیا هاوڕێیەکی کۆنمە، پێشم وا نییە هاوڕێیەتی شتێکی خراپ بێت، ڕێزم بۆی هەیە، زۆریش شانازی بەو دۆستایەتییەوە دەکەم"

کوڕەکە وتی: "تێدەگەم، سەرزەنشتت ناکەم"

"ئەو سبەی لێرە کۆنسێرتی هەیە، هیوادارم دیسان دوامان نەکەویت"

"ئەگەر سوێند بخۆیت هیچتان لە بەینا نییە دواتان ناکەوم"

"چەند جارت پێ بڵێم سوێند خواردن لەسەر شتی وا بێ نرخە؟ بەڵام سوێندی ئەوە دەخۆم ئەگەر لەسەر ئەم مناڵبازاڕییەت بەردەوام بیت هەتا ماوم هەرگیز قسەت لەگەڵدا ناکەم"

لاوەکە بە غەمبارییەوە وتی: "ڕۆزینا، ئەمە هەمووی لەبەر ئەوەیە کە خۆشم دەوێیت"

ڕۆزینا بە دەنگێکی ساردو وشکەوە وتی: "منیش تۆم خۆش دەوێت، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە لەسەر ڕێگای گشتیدا گوڵمەزت بۆ بنێمەوە"

"تۆ منت خۆش ناوێت، تۆ شەرمت بە من دێت"

"قسەی قۆڕ مەکە"

"قەت حەز ناکەیت لەگەڵتابم، یان لەگەڵما بێیت بۆ شوێنێك.."

ڕۆزینا دیسان بێدەنگی کردەوە، چونکە دەنگی لێ بەرزکردبووەوە، "وس، ئەگەر باوکم پێکەوە بمانبینێت دەمکوژێت، پێم وتوویت وەك هەڵۆ بە دوامانەوەیەو چاودێری دەکات، وەلێ ئیتر دەبێت ئێستا بڕۆم"

لاوەکە توند دەستی گرت و وتی: "جارێ مەڕۆ"

ڕۆزینا نائومێدانە چاوی لە بنمیچەکە بری.

کوڕە لاوەکە وتی: "ئەگەر ببینە هاوسەر مەسەلەکە دەگۆڕێت، باوکت ناتوانێت ڕێگامان پێبگرێت، بۆ خۆمان خێزانێك پێکەوە دەنێین"

ڕۆزینا بە توندی وتی: "من خێزانم ناوێت، پێش ئەوەی منداڵم ببێت خۆم دەکوژم"

"بۆ؟"

"چونکە من هەر منداڵم ناوێت"

لاوەکە دیسان وتی: "خۆشم دەوێیت، ڕۆزینا"

ڕۆزینا وتی: "بۆیە وام لێ دەکەیت کە خۆم بکوژم، وانییە؟"

لاوەکە سڵەمییەوە، پرسی: "خۆکوشتن؟"

"بەڵێ خۆکوشتن"

"ڕۆزینا!"

"تۆ وام لێ دەکەیت خۆم بکوژم، گوێم لێ بگرە، من دڵنیام تۆ وام لێدەکەیت خۆم بکوژم"

لاوەکە بە زەلیلیەوە وتی: "ئەتوانم ئەمشەو بێمە لات؟"

ڕۆزینا وەڵامی دایەوە "نەخێر، ئەمشەو نا" وەلێ پاشان بۆ ئەوەی هێوری بکاتەوە لەسەرخۆ وتی: "بەڵام کاتێکی دی دەتوانیت تەلەفۆنم لەگەڵدا بکەیت، فرانتا[5]، لە یەك شەممە بەدواوە"و وەرگەڕا کە بڕوات.

لاوەکە پێی وت: "ڕاوەستە، شتێکم بۆ هێناویت، لەباتی ئەوە" پێچراوەیەکی بچووکی دایە.

ڕۆزینا لێی وەرگرت و هەنگاوی خێرای نا.

—6—

"ئایا دکتۆر سکریتا ئەو مرۆڤە سەیرو دەگمەنەیە کە وا خۆی دەردەخات؟"

یاکوب وەڵامی دایەوە: "لەوساوەی بوومەتە هاوڕێی من بەردەوام ئەم پرسیارەم لەخۆم کردووە".

ئۆلگا وتی: "ئەو کەسە نائاساییانەی دەتوانن بڕوا بە خەڵکی بێنن کە ڕێز لە هەڵسوکەوتی سەیریان بگرن، ژیانێکی خراپ بەسەرنابەن، دکتۆر سکریتا لەگێژی و حەواس پەرتیدا سەرت بە سووڕ دێنێت، لەناوەڕاستی گفتوگۆدا لە بیری دەچێت قسە لەسەر چی دەکات، لەسەر شەقام ڕادەوەستێ تا لەگەڵ یەکێکدا قسە بکات و پێش ئەوەی بزانێت چی ڕوودەدات، دوو سەعات لە

بەرنامەی کاری عیادەکەی دوا دەکەوێت، کەچی کەس ناوێرێت ڕقی لێ هەڵگرێت، چونکە پزیشکی باش وەك مرۆڤێکی سەیر و تایبەتمەند بە ڕەسمی ناسراوەو، تەنیا کەسانێکی ڕەمەکی و بێ نەزاکەت دان بەو هەقی تایبەتمەندییەدا نانێن"

"سەیر بێت یان نا، بەلای منەوە پزیشکێکی چاکە"

"دەشێت وا بێت، هەرچەندە هەموو ئێمە وا هەست ئەکەین کە پزیشکایەتی بۆ ئەو کارێکی لاوەکییە، وەگیر کەوتنێکی ناچارییە کە کاتی بەرنامەی گرنگتری لێ دەگرێت، بۆ نموونە بڕیارە بەیانی تەپڵ لێبدات"

یاکوب قسەکەی پێ بڕی "کەمێك ڕاوەستە، تۆ تەواو لەوە دڵنیایت؟"

"تەنیا شتێك دەتوانم پێتی بڵێم ئەوەیە کە پۆستەریان بە هەموو شوێنێکدا هەڵواسیوە کە کلیمای ترومپیت ژەنی بەناوبانگ و دکتۆر سکریتایش وەك تەپڵ لێدەر سبەینێ کۆنسێرتێك سازدەکەن"

یاکوب وتی: "شتێکی سەیرە، سکریتا گەورەترین کەسی خەیاڵاوییە تا ئێستا ناسیبێتم، بەڵام پێدەچێ هیچ خەونێکی نەیەتەدی، پێشان لە سەردەمی زانکۆدا، کە بینیم زۆر بێ پارە بوو، هەمیشە دەستی خاڵی و خەونی بە پرۆژەی دەوڵەمەند بوونەوە دەدی. ئەوسا نەخشەی بۆ ئەوە دەکێشا توولەی ڕاویی بەخێو بکات، چونکە یەکێك پێی وتبوو هەر توولەیەك لە نەژادی ویلز بێت دەتوانێت بە چوار هەزار کرۆنی بفرۆشێت، ئەو حسابی هەموو شتێکی کردبوو، دێڵە سەگ لە ساڵێکا دووجار دەترەکێت و هەر جارەی پێنج توولەی دەبێت، واتا دە توولە لە ساڵێکدا، دەچوار هەزاری واتا چل هەزار کرۆن، ئەمانەی بە وردی لێك دابووەوە، زۆریش هەوڵیدابوو سۆزی چێشتکەری خوێندکاران بەلای خۆیدا ڕابکێشێت قەولی لێوەربگرێت پاشماوەی خواردنەکان بداتە توولە سەگەکان، تێزی بۆ دووهاوڕێی

خوێندکاری نووسی تا لە بری ئەوە سەگەکانی بەرنەدەرێ و بیانگەڕێنن. ڕێ بە هیچ ئاژەڵێك نەدەدرا بڕواتە خەوگاکەوە، بەڵام ئەوەندەی گوڵ و شیرینی بۆ ژنە بەڕێوەبەرەکە برد کە بەڵێنی دایە لە یاسای قەدەغەکردندا سەگی لێ ئاوارتە بکات، زیاد لە دوومانگ ئەمەی کرد، هەموو شتێکی بۆ سەگەکانی ئامادەکرد، وەلێ ئێمە هەموومان ئەوەمان دەزانی ئەوەی دەیکات بێجگە لە خەوو خەیاڵ چیتر نییە، بۆ کڕینی دێڵێك پێویستی بە چوار هەزار کرۆن بوو، کەسیش پارەی بە قەرز نەدەدایە، کەس بڕوای پێ نەدەکرد کە جیدی بێت، هەموو بەچاوی پیاوێکی خەیاڵاوی لێیان دەڕوانی، پیاوێکی لە ڕادەبەدەر بە ئاگاو داهێنەر لە بواری خەیاڵ پەروازیدا"

"شتێکی زۆر سەرنج ڕاکێشە، وەلێ تێناگەم تۆ بۆ ئەمەندەت خۆش دەوێت، ئەو تەنانەت هەست بە بەرپرسیاریەتی ناکات، هەرگیز ئامادەی کاتی دیاریکراو نابێت، ئەو بەڵێنەی ئەمڕۆ دەیدات سبەی لەبیری دەکات"

"ئەمە تۆزێ بێ ویژدانی تیایە، لە ڕاستیا، ئەو جارێك چاکەیەکی گەورەی لەگەڵ مندا کرد، لە هەموو ژیانما کەس چاکەی وای لەگەڵدا نەکردووم"

یاکوب دەستی بە گیرفانی هێلەکەکەیدا کرد و پارچە کاغەزێکی زەردو زواڵی پێچراوەی دەرهێنا، لەسەرخۆ و بەوردی کردییەوە، حەبێکی ڕەنگ شین باوی تیابوو.

ئۆلگا لێی پرسی "ئەمە چییە؟"

"ژەهرە"

یاکوب خۆشی لەو چرکەساتە پڕ لە پرسیارەی کچە هات و لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

"پانزە ساڵە ئەم حەبەم هەڵگرتووە، دوای ساڵێك زیندانی شتێك فێربووم، زیندانیی هەر هیچ نەبێت دەبێت ئەو ڕاستیە بزانێت کە خۆی فەرماندەی

مەرگی خۆیەتی، دەتوانێت کات و شوێنی بۆ دیاری بکات، کە ئەو بڕوایەت هەبوو تاڕادەیەك توانای ئەوەت دەبێت بەرگەی هەموو شتێك بگریت. هەمیشە ئەوەت لاڕوونە هەر وەختێکت بەشیاو زانی دەتوانیت دەستبەرداری ژیان ببیت"

"ئەم حەبەت لە بەندیخانە هەبوو؟"

"بەداخەوە نا، بەڵام هەر ئەوەندەی کە هاتمە دەرێ ئامادەم کرد"

"ئەوە ئەوکاتە بوو کە ئیدی پێویستت پێی نەمابوو!"

"لەم وڵاتەدا هیچ کاتێك ئەوە نازانیت کەی ئەوەت بۆ پێش دێت، بێ لەوە، لە دیدی مندا ئەمە کارێکی ئەخلاقییە، بڕوام وایە هەر کەسێك بگاتە تەمەنی باڵقبوون دەبێت حەبێکی ژەهری بدەنێ، لەگەڵ ئەم دیارییەدا ڕێورەسمێکیش ساز بکرێت، ئەم کارە بۆ ئەوە نییە خەڵکی بۆ خۆکوژی هەڵنێیت، بە پێچەوانەوە، بۆ ئەوەیە بتوانن بە ئاسوودەیی و دڵنیاییەکی زۆرترەوە بژین، بۆ ئەوەیە هەموو بەو بڕوایەوە بژین کە گەورە و سەروەری ژیانی خۆیانن"

"چۆنت دەستکەوت؟"

"سکریتا لە سەرەتادا وەك کیمیاییەك لە تاقیگایەکدا کاری دەکرد، پێش ئەو ڕووم لە یەکێکی تر نا، بەڵام ئەو ڕای وابوو ئەرکی ئەخلاقیانەی وای فەرمان پێدەکات داواکارییەکەم ڕەت بکاتەوە، سکریتا بێ هیچ دوو دڵییەك حەبەکەی بۆ دروست کردم"

"دەشێت لەبەر ئەوە بێت خۆی بە تەواویی مرۆڤێکی نائاساییە"

"ڕەنگە، وەلێ زیاتر لەبەر ئەوە بوو کە لە من گەیشتبوو، دەیزانی من کەسێکی هیستیری نیم کە بمەوێت خۆم بکوژم، لە لۆژیکی من گەیشتبوو، دەمەوێت ئەمڕۆ حەبەکەی بدەمەوە، ئیتر پێویستیم پێی نییە"

"کەواتە هیچ مەترسییەك نەماوە؟"

"سبەی بە یەکجاری ئەم وڵاتە جێ دێڵم، داوایان لێکردووم لە زانکۆیەکی دەرەوەدا دەرس بڵێمەوەو دەوڵەتیش ڕێگای چوونە دەرەوەی پێداوم"

ئاخریی هەواڵەکە گەیشت، یاکوب تەماشای ئۆلگای کرد و بینی زەردەخەنەی هاتۆتێ، ئۆلگا دەستی گرت: "بەڕاست؟ مەحشەرە! بۆ تۆم زۆر پێ خۆشە"

شادمانییەکەی ئۆلگا هێند سەرنج ڕاکێش بوو کە یاکوب وای هەست کرد ئەویش دەیەوێت بۆ شوێنێکی دوور بڕوات و لەوێدا بەختەوەر بژی. سەری لە ڕەفتاری ئۆلگا سووڕما، چونکە هەمیشە لەوە دەترسا ئۆلگا پابەندی بێت و پابەندییەکەیشی لایەنی عاتیفی هەبێت، پێی خۆشبوو وا دەرنەچوو، وەلێ هەر لە هەمان کاتیشدا دڵی ڕەنجا.

هەواڵەکەی یاکوب وا ئۆلگای ڕاکێشا بوو ئاگای لەو پارچە کاغەزە زەردو زواڵە لوٚچ کراوەی سەرمێزەکەیان نەما کە حەبە ڕەنگ شین باوەکەی تیابوو، یاکوبیش ناچاربوو بەدرێژی باس و خواسی کارە تازەکەی بۆ بگێڕێتەوە.

"مـن زۆر دڵخۆشـم بـە پێشـکەوتنی کارەکـەت، تـۆ بـەردەوام لـێرە وەك گومـانلێکراوێك تەماشـا دەکرایـت. تەنانـەت ڕێیـان لێدەگرتـی لـە بـواری پسپۆڕییەکەی خۆتدا کاربکەیت، بەم حاڵەیشەوە هەمیشە ئامۆژگاری ئەوەمان دەکەن دەبێـت وڵاتەکـەتت خـۆش بوێـت، باشـە وڵاتێـك ڕێگـای کـارکردنت لێ بگرێت چۆن دەتوانیت خۆشت بوێت؟ من ئەمەت بەڕاستی پێدەڵێم، من هیچ پەیوەندییەکەم بەم وڵاتەی خۆمەوە نییە، ئایا من هەڵەم؟"

یاکوب وەڵامـی دایـەوە "نازانم، بەڕاستیی نـایزانم، مـن دان بـەوەدا دەنێـم هەمیشە هەستێکی تایبەتیم بەرانبەر بەم وڵاتە هەبووە"

ئۆلگا دەسـتی پێکـردەوە "ڕەنگـە هەڵـە بێـت، بـەڵام مـن هەسـت بـە هیـچ پابەندییەك ناکەم، دەتوانم چ جۆرە پابەندییەکم بە ئێرەوە هەبێت؟"

"تەنانەت یادەوەرییە خەماوییەکانیش، جۆرە پابەندییەکت هەر لا دروست دەکات"

"پابەندی بەچییەوە؟ بە هەڵهاتنی مانگ لە شوێنێکی بەرزی تایبەتییەوە؟ لەبەر ئەوەی بەرێکەوت لەوێ لەدایك بووین؟ من تێناگەم چۆن مرۆڤ دەتوانێت دەم لە ئازادییەوە بدات و کەچی لە کۆت و پێوەندی ئەم جۆرە بەهایانەدا بێت، بەهەرحاڵ، کە زەوی وشك و بێ فەرپێت ڕەگ بە دەردی درەخت ناخوات، درەخت تەنیا لە شوێنێکدا دایکی ڕەسەنی خۆی دەدۆزێتەوە کە سەر زەمینەکەی شێدارو بە پیت بێت"

"ئەی تۆ چی؟ تووشی ئەو پیت و فەڕە هاتوویت؟"

"بەگشتی، بەڵێ، ئێستا کە بەم دواییە ڕێگای خوێندنیان پێداوم، پێم باشە، دوای زانست دەکەوم و باقیەکەی تری هیچ، ئەم هەل و مەرجەی ئێستایش من دروستم نەکردووەو لێیشی بەرپرسیارنیم، بەڵام بەڕاست پێم بڵێ تۆ کەی دەڕۆیت؟"

"سبەینێ"

توند دەستی یاکوبی گرت "وا زوو؟ تۆ کە ئەم هەموو چاکەیەت لەگەڵ مندا کردووەو بۆ خواحافیزی لێکردنم ئەم هەموو ڕێگایەت بڕیوە، نابێت کەمێك زیاتر بمێنیتەوە؟ تکات لێدەکەم"

هەموو شتەکان پێچەوانەی پێش بینییەکانی بوو، ڕەفتاری ئۆلگا نە لە ڕەفتاری کچێکی دەکرد کە بەنهێنی عاشقی بووبێت و نە کچۆڵەیەك کە بۆنی باوك و فەرزەندیی بدات، ئۆلگا بەسۆزو بە جۆرێکی مانادارەوە دەستی لەناو دەستی نا، لە چاوەکانی ڕاماو دووبارە وتی: "ئەوەندە پەلەت نەبێت، حەیفە هەر ئاوا بە وشك و برنگی ماڵئاواییمان لێبکەیت و بڕۆی"

یاکوب سڵەمییەوە، وتی: "بزانم چۆن ئەبێت، سکریتاش پێی خۆشە زیاتر بمێنمەوە"

ئۆلگا وتی: "دەبێت بمێنیتەوە، کاتێکی کەممان بە دەستەوەیە بۆ ئەوەی پێکەوە بین، ئێستا دەبێت بڕۆمەوە بەلای ئاوەکانزاییەکانەوە"

کەمێك وەستاو پاشان پێی وت بڕیاری داوە نەگەڕێتەوە بۆ لای ئاوەکانزاییەکان و لای یاکوب بمێنێتەوە.

یاکوب وتی: "نا، نا، ئەو کارە مەکە، تەندروستیت لە هەموو شتێك گرنگترە، خۆم تا ئەویّ دێم لەگەڵتا"

ئۆلگا بەخۆشیەوە وتی: "باشە" دەرگای کەنتۆرەکەی کردەوەو بۆ دۆزینەوەی شتێك هەموو لایەکی سەروبن کرد.

حەبەشین باوەکە هێشتا لەسەر مێزەکە بوو، ئۆلگا، تەنیا کەسێك بوو کە بە دڵنیاییەوە یاکوب ڕازی دڵی خۆی بۆ درکاند بوو، ئۆلگا پشتی لەو و ڕووی لە کەنتۆرەکە بوو، وا بەبیری یاکوبدا هات کە ئەو حەبە شین باوە بەشێکە لە تراژیدیای ژیانی، تراژیدیە خەماویەکان، لە یادکراوو تا ڕادەیەك بێ بەهاکان. بە خۆی وت ئێستا چاکترین کاتە بۆ کۆتایی پێهێنانی ئەم چیرۆکە بێ بەهاکان، ماڵئاوایی کردنێکی بە پەلەو بەجێهێشتنی. دیسان حەبەکەی لە کاغەزەکەی پێچایەوەو خستیەوە گیرفانی.

ئۆلگا جانتایەکی گەورەی لە کانتۆرەکە دەرهێنا، خاولییەکی قەدکراوی تێخست، دەرگای کانتۆرەکەی داخست و بە یاکوبی وت: "بابڕۆین".

-7-

تەنیا خوا ئەزانێت چەند بوو ڕۆزینا لە ناو باخەکەدا دانیشتبوو، پێدەچوو بە کورسییەکەوە نووسابێت، ڕەنگە هۆی ئەوەبێت کە بیریشی، نائومێدانە لە کارکەوتبێت.

تا دوێنێش بڕوای بە قسەکانی ترومپیت ژەنەکە کردبوو، نەك لەبەر خۆشی قسەکانی، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە باوەڕ پێکردنی ئاسانترین ڕێگای هەڵهاتن بوو، ئەو دەیتوانی بە ویژدانێکی ئاسوودەوە لە شەڕێکدا کە لە سەرووی توانای ئەوەوە بوو خۆی کەنار بگرێت، وەلێ کە ئێستا هاوکارەکانی گاڵتەیان بە سادەییەکەی دەکرد، دووبارە کەوتەوە گومان و نەفرەت لێکردنی، شتێك لە ناخیدا پێی دەگوت هێند بە هۆش وزرنگ نییە ئەوی دەست بکەوێت.

بێ ئەوەی حەوسەڵەیەکی هەبێت ئەو بەستەیەی فرانتا دابوویە کردییەوە، کراسێکی شینی کاڵی تیا بوو، ڕۆزینا زانی کراسی خەوە، ئەو کراسی خەوەی کە فرانتا پێی خۆشبوو هەموو شەوێك، بە درێژایی تەمەنی ڕۆزینا، لەبەریدا ببینێت. هێند تەماشای کرد تا وای هاتە بەرچاو کراسەکە لە دەریاچەیەکی شیندا، دەریاچەیەکی پڕ لە خۆشەویستی، لە گۆمی ئەوین و وەفاداریا نقوم بوو.

کامیانی زیاتر خۆش نەدەیوست ؟ ئەو پیاوەیئەمی نەدەویست، یان ئەوەی کە دڵی بۆ ئەم لێی دەدا؟

بەو جۆرە، بەو دوو نەفرەتیەوە کە توانای پێ نەهێشتبوو، بێ ئاگا لەوەی چی لە دەوروبەریا ڕوو دەدات، لەسەر کورسییەکە دانیشت، لە پاڵ شۆستەی باخچەکەدا ماشێنێك و، لە دوایەوە کامیونێکی سەوزی بچووك وەستا، دەنگی هەرا و زەنا و وەڕینی سەگی لێوە دەهات، دەرگای ماشێنەکە کرایەوەو

پیاوێکی پیر کە بازوبەندێکی سووری بە قۆڵەوە بەستبوو لێ هاتە خوارێ، ڕۆزینا بەبێ تاقەتی و بێ حەوسەڵەییەوە تەماشای کرد.

پیاوەکە هاوارێکی کردو فەرمانێکیدا، پیرێکی تر دابەزی، ئەویش شریتێکی بە قۆڵیەوە بەستبوو، دارێکی درێژ کە ئەڵقەیەکی تەل بەوسەریەوە بەسترابوو بە دەستیەوە بوو، چەند پیاوێکی تریش کە هەموو بازوبەندی سوورو داری درێژی ئەڵقەداریان بە دەستەوە بوو، یەك بەدوای یەکدا دابەزین.

ئەو پیاوەی پێش ئەوان دەرکەوتبوو بەدەنگی بەرز کەوتەوە فەرمان دەرکردن، هاوڕێ سەیر و سەمەرەکانی بە دواییەکدا کەوتنە پشوو بە و وریا بە. پاشان ڕابەرەکە بە دەنگێکی ناخۆش فەرمانێکی داو پیرەکان ڕژانە ناو باخەکەوە، لەوێدا ڕیزەکەیان تێکداو هەرکەس بە لایەکدا کەوتە گەڕان، هەندێکیان لەسەرخۆ بە ڕاڕەوەکاندا دەڕۆیشتن و، هەندێکی تریان بە ناوچیمەنەکەدا، باخەکە پڕبوو لەو پیرەمێردانەی دەگەڕان و لەو منداڵانەی یارییان دەکرد، منداڵەکان هەموو بەسەرسامییەوە کە نیشانەی باوەڕنەکردن بوو وەستان و تەماشای پیاوەکانیان دەکرد.

ڕۆزینایش سەرئەنجام وازی لە ڕامانە غەماویە هێناو کەوتە تەماشاکردنیان، لەنێو گرووپی شریتە سوور لە قۆڵەکاندا باوکی ناسییەوە، بێ ئەوەی سەیری پێ بێت بە تەوسەوە لێی ڕوانین..

تووتەڵە سەگێك لەناو چیمەنەکەدا، بەدەوری دەوەنێکدا دەهات و دەچوو، یەکێك لە پیاوە پیرەکان هەستاو بەرەو سەگەکە چوو، سەگەکە وەستاو بەسەر سووڕماوییەوە تەماشای کرد، پیاوەکە دار دەستەکەی بۆ درێژکرد تا ئەڵقەی تەلەکە بکاتە ملی، بەڵام دارەکە درێژ و دەستی پیرەمێردەکە لاوازبوو، پیرە نەیتوانی ئامانجەکەی بپێکێت، ئەڵقەی تەلەکە بە جۆرێکی سەیر بە سەرسەری سەگەکەوە دەلەرییەوەو سەگەکەیش لە دیمەنەکە ڕامابوو.

لەم کاتەدا شریت سوور لە قۆڵێکی دی بۆ کۆمەکی کردنی هاوڕێکەی هات. ئەو دەستی بەهێزتر بوو، دوای کەمێك سەگەکە خۆی لەناو ئەڵقەکەدا بینیەوە. پیرەمێردەکە داردەستەکەی ڕاکێشا، تەلەکە لە ملە کوڵکنەکەی گیربوو، سەگەکە کەوتە قروسکە قروسك، دوو پیرەکە، کە سەگەکەیان لە چیمەنەکەوە بەرەو ماشێنە وەستاوەکان دەبرد، پێکەنین، دەرگا گەورەکەی کامیونەکەیان کردەوە، دەنگی وەرپینێکی زۆر لە ناوەوە هات و، ئەوانیش سەگەکەیان خستە ناو ماشێنەکەوەو دەرگایان توند داخست.

ڕۆزینا هەموو ئەو شتانەی بینی، وای هەستکرد ئەوە ڕەنگدانەوەی چیرۆکە غەماوییەکەی خۆیەتی: ژنێك بوو لە ناو دوو دنیادا گیری خواروبوو، دنیای کلیما کە ئەمی نەدەویست، دنیایەکیش کە ئەم لێی هەڵدەهات (دنیای پەستیی، بێزارکەر، شکست و خۆبەدەستەوەدانی فرانتا) ئەمانە هێند بێ بەزەییانە بەدوایەوە بوون، دەتوت دەیانەوێت ئەویش بەزۆر بە تەلێکی ئاسن کێش بکەن.

منداڵێکی تەمەن نزیك بە دوانزە ساڵ لە ڕاڕەوێکی بە لم داپۆشراودا ڕاوەستابوو، بێ ئومێدانە هاواری لە سەگە ونبووەکەی ناو بنچکەکان دەکرد؛ لە بری سەگەکە سەروکەللەی باوکی ڕۆزینا بە دارەکەی دەستیەوە لەناو بنچکەکانەوە دەرکەوت، منداڵەکە زوو کڕبوو، ترسا بانگی سەگەکەی بکات، چونکە دەیزانی پیرەمێردەکە بە زۆر لێی دەستێنێت، بۆیە بە پەلە لە دەستی ڕایکرد. وەلێ پیرەکە کەوتە دوای، پیرەی داربەدەستی باوکی ڕۆزینا و منداڵەکە بە پاڵ یەکەوە ڕایاندەکرد. منداڵەکە دایە گریان، پاشان پێچێکی پێداو بە پێچەوانەی ئەوەوە کەوتەوە هەڵاتن، باوکی ڕۆزیناش وایکرد، دیسان پێکەوە کەوتنەوە ڕاکردن.

سەگێکی پێ کورتی بە نەژاد ئەڵمانی هێدی هێدی لەناو بنچکەکانەوە دەرپەڕی، باوکی ڕۆزینا داردەستەکەی بۆ درێژکرد، بەڵام سەگەکە خۆی لە ئەڵقەکە لاداو بەرەو لای منداڵەکە چوو، منداڵەکە هەڵیگرت و خستیە باوەشی، پیاوە پیرەکانی تر بۆ هاوکاریکردنی باوکی ڕۆزینا هاتن و سەگە پێ کورتەکەیان بەزۆر لە باوەشی منداڵەکە دەرهێنا، منداڵەکە دایە پڕمەی گریان، هاواری دەکرد و لە بەرگرییەکی نائومێدانەدا بوو، پیرەمێردەکان ناچاربوون هەردوو دەستی لە پشتەوە بادەن و دەمی بگرن، چونکە هاوارکردنەکەی سەرنجی هاتوچۆکەرانی ڕادەکێشا کە دەوەستان و تەماشایان دەکرد و نەیاندەوێرا هیچ بڵێن.

ڕۆزینا لە بینینی باوکی و هاوڕێکانی بەتەنگ هات، وەلێ دەتوانێت بۆ کوێی تر بچێت؟ لە ژوورەکەیدا بێجگە لە چیرۆکێکی پۆلیسی نیوە ناتەواو کە حەزی لێ نەدەکرد هیچی تری نەبوو خۆی پێوە خەریك بکات، فیلمی سینەماکەی پێشتر دیبوو، هۆڵی دانیشتنی تەلارەکەی ریچموند تەلەفزیۆنێکی کۆنی لێ بوو کە دیمەنترین شتی ئەوێبوو، تەلەفزیۆنەکەی هەڵبژاردو هەستا، هاواری پیرەمێردەکان کە لە هەموو لایەکەوە دەنگی دەدایەوە، جارێکی دی لەو ژیانە ئارام و بەنرخەی کە تازە لە هەناویدا چرۆی کردبوو بە ئاگای هێنایەوە، ئەو شتە پیرۆزەی گۆڕیبووی وشەوقی دابوویە، هەر ئەو لەو دەمارگیرە گەلۆرانەی جیاکردبووەوە کە بەدوای سەگدا ڕایاندەکرد. ئیدی لەوە دڵنیابوو کە نابێت دەست هەڵبگرێت، نابێت خۆی بە دەستەوە بدات، چونکە لە منداڵدانیدا تاقە ئومێدێك تاقە کلیلی دەرگای ئایندەی هەڵگرتبوو.

کە گەیشتە کۆتایی پارکەکە یاکوبی بینی، لە پیادە ڕێیەکی بەردەم ساختمانەکەی ریچموندا وەستابوو تەماشای کۆکردنەوەی سەگەکانی دەکرد، پێشان تەنیا جارێك، چەند سەعاتێك لەسەر نان خواردن دیبووی، بەڵام لە

بیری نەکردبوو، ڕۆزینا زۆر ڕقی لە نەخۆشێك دەبووەوە لە ژوورەکەی پاڵیا دەژیاو، ئاسایی هەر ئەوەندەی کەمێك دەنگی ڕادیۆ بەرزبوایەتەوە بە مستەکۆڵە بە دیوارەکەیدا دەکێشا، بۆیە ڕۆزینا هەرشتێك پەیوەندی بەم دراوسێیەوە هەبوایە زۆر بە توندی بەرەنگاری دەبووەوە.

ڕقی لە دەموچاوی ئەم پیاوە بوو، بە لایەوە دەموچاوێکی پلار ئامێزە، ئەویش ڕقی لە هەموو پلارێکە. هەمیشە وای دەخاتە بەرچاو کە پلار -هەر جۆرە پلارێك- وەك پاسەوانێکی چەکدار وایە لە بەردەرگای هاتنە ژوورەوەیدا ڕادەوەستێت، بەوردی لێی دەڕوانێت و بە سووکایەتی پێکردنەوە خۆی لە پێشوازی لێکردنی دەگرێت. ویستی بە سەری بەرزو، شانی ڕێك و، بە فیزی مەمکی قوت و شکۆی سکە بەرزبووەکەیەوە بە پاڵ یاکوبدا تێپەڕێت.

لە ناکاوێکدا پیاوەکە (ڕۆزینا بە لاچاو تەماشای دەکرد) بە ئاوازێکی لە سەرخۆو میهرەبانەوە وتی: "وەرە ئێرەوە.. وەرە.. وەرە ئێرەوە"

ڕۆزینا لە پێشا لەوە نەگەیشت کە بۆ بانگی دەکات، سەیری لە دەنگە میهرەبانەکەی هات و نەیزانی چی بەرانبەر بکات، بەڵام دوایی گەڕایەوەو بینی سەگێکی بولداگی خڕوخەپان بە ڕوویەکی ناشرین بەڵام ئینسانیەوە بە دواوەیەتی.

سەگەکە بەدەم دەنگی یاکوبەوە چوو، یاکوب ملی گرت "لەگەڵ منا وەرە ئەگینا تووشی کێشەیەك دێیت" سەگەکە سەری بڕواپێکردنی بۆ پیاوە بەرزکردەوە، زمانی وەك ئاڵایەکی بچووکی شادی دەشەکایەوە.

چرکە ساتێکی پڕ لە سووکایەتی، پێکەنین هێنەر و بێ مانا، بەڵام لەگەڵ ئەمانەیشدا ڕۆزینا لەوە دڵنیابوو کە: پیاوەکە نە سەرنجی جوانیەکەی دابوو نە لە لووت بەرزییەکەی، وای زانیبوو قسەکانی لەگەڵ ئەویەتی، وەڵێ لە

ڕاستیا ئەو لەگەڵ سەگەکەدا دەدوا، لێی نزیک کەوتەوەو لەسەر پلیکانەی بەردەم ساختمانەکەی ریچموند وەستا.

لەوبەر شەقامەکەوە دوو پیرەمێرد بە خێرایی بەرەو لای یاکوب هاتن، ڕۆزینا کە نەیتوانی لایەنگریی پیرەمێردەکان نەکات، لە چاوەڕوانی کردنێکی دوژمن کارانەدا کەوتە سەیرکردنیان.

ئەگەرچی پیرێکیان هاواری کرد: "هەر ئێستا ئەو حەیوانە بەرەڵا بکە" بەڵام یاکوب ملی سەگەکەی گرت و بەرەو لای پلیکانەی ساختمانەکەی برد، پیرێکی تریان لەسەر قسەکە ڕۆشت: "بەناوی یاساوە" یاکوب گوێی پێنەدان و بەردەوام بوو لەسەر ڕۆیشتنەکەی. بەهەرحاڵ، یەکێك لەو داردەستانەی لەپشت سەرییەوە درێژکرابوو، بەر تەنیشتی کەوت، ئەڵقەی تەلەکەیش بەسەر سەری بوڵداگەوە بەشێوەیەکی سەیر سەرو خواری بوو، یاکوب داردەستەکەی فڕاندو فڕێی دایە سەر زەوییەکە.

سێیەم پیرەمێرد بە ڕاکە ڕاکە گەیشت، هاواری کرد "تۆ دەتەوێت کارمەندەکان لە ئەرکی خۆیان بکەیت: من پۆلیس ئاگادار دەکەم"

پیرەمێردێکی دی دەنگی بێزاریی لێ هەڵبڕی: "بەناو باخەکەدا دەسووڕایەوە، بەناو یاریگاکەیشدا کە بۆ سەگ قەدەغەیە! میزی بەسەر لمەکەدا کرد کە تایبەتە بۆ مناڵ! کامیان گرنگترن، مناڵ یان سەگ؟"

ڕۆزینا لەسەر پلیکانەکانەوە تەماشای ئەم دیمەنەی دەکرد، لە خۆبایی بوونێك کە تا ئەوکاتە تەنیا لە سکیا هەستی پێدەکرد هەموو گیانی داگرت و توانایەکی یاخیگەرانەی پێ بەخشی، لەوساتەدا یاکوب بەسەر پلیکانەکاندا بەرەولای ئەودەچوو، ڕۆزینا وتی: "ئەو سەگە بۆی نییە بچێتە ژووری"

یاکوب کەمە کاردانەوەیەکی پیشاندا، وەلێ ئیدی لەوەدا نەمابوو ڕۆزینا پاشەکشە بکات، لەبەردەم دەرگا گەورەکەی ساختمانەکەی ریچموندا هەردوو

قاچی بڵاوکردەوەو وەستا، دووبارە بە یاکوبی وت: "ئێرە تایبەتە بە نەخۆشەوە نەك سەگ، قەدەغەیە سەگ لێرە بێت"

یاکوب بەدەم لە باوەشکردنی سەگەکەوە ویستی بەزۆر بە پاڵیا تێپەڕێت، وتی: "خانمەکە، داردەست و ئەڵقەی تەلەکەت لە کوێیە؟"

ڕۆزینا پلارەکەی یاکوبی بە هەند وەرگرت، پلارێکی نەفرەتی کە بەردەوام وای دەهاتە بەرچاو بە زۆر بەرەو ڕووی دەکرێتەوەو ئەمیش نایەوێت، لەداخا هەردوو چاوی کەوتنە پڕیشك هاویشتن، توند گەردن بەندی سەگەکەی گرت، هەردووکیان کەوتنە ڕاکێشانی گەردن بەندەکە، هەریەکە بە لایەکدا.

یاکوب مەچەکی ڕۆزینای گرت و لە پڕا هێند بە توندی گەردن بەندەکەی لە دەستیکردەوە کە ڕۆزینا تلی خوارد.

ڕۆزینا لە پشتەوە هاواری بەسەردا کرد "گرەو ئەکەم تۆیش لەوانەیت کە گالیسکەی منداڵان پڕ لە توولە سەگ دەکەن!"

یاکوب گەڕایەوەو ڕقێکی کوت و پڕی ڕووت نیگای هەردووکیانی پێك گەیاند.

—8—

بوڵداگ بەناو ژوورەکەدا مڵ و مووشی بوو، دەتوت لەوە بێ ئاگایە هەر ئێستا لە مەترسییەکی گەورە ڕزگاری بووە، یاکوب لەسەر قەرەوێڵەکە ڕاکشا، نەیزانی چی لەگەڵ سەگەکەدا بکات، خۆشیدەویست، حەیوانێکی میهرەبان و هێور دەهاتە بەرچاو، لە ڕاستیا ئەو جۆرە هەست بە ئاسوودەییکردنە ئازادەی کە سەگێك لە ژوورێکی نائاشناو لەگەڵ پیاوێکی بێگانەدا وازوو دەیکات، نیشانەی گەمژەییە. دوای ئەوەی چوار گۆشەی ژوورەکەی پشکنی، پەڕییە سەر قەنەفەکەو لەپاڵ یاکوبدا ڕاکشا، یاکوب سڵەمییەوە، وەلێ بێ بەرگریکردن

ئەم دۆستایەتیەی قبووڵ کرد، دەستی بە پشتی سەگەکەدا هێناو لە گەرمای لەشی ئەو حەیوانە تامی چێشت، ئەو هەمیشە سەگی خۆشویستووە، سۆزی سەگ، دۆستایەتیە ڕاستیەکەیان، فیداکارییان و لە هەمان کاتدا هەرگیز ناتوانیت بە تەواویی لێیان بگەیت. هەرگیز مرۆڤ بەڕاستی لەوە ناگات کە لە بیرو دڵی ئەم باڵێۆزە دڵ سادەو شادو دنیای سەیرو نادیاری سروشتدا چی ختوورە دەکات.

پشتی سەگەکەی خوراند و بیری لەو دیمەنەی پێشوو کردەوە کە دیبووی. لەبەرچاویا پیرەمێردەکان بەدارە درێژەکەی دەستیانەوە هەر لەو پاسەوانانەی زیندان، لێکۆڵەرەوەو هەواڵگرانە دەچوون کە بە پەرۆشەوە بەدوای وشەیەکی سیاسی دراوسێکەیاندا دەگەڕێن بۆ ئەوەی تووشیان بکەن، هۆی ئەم کارە ناشیرینانەیان چییە؟ توندو تیژی؟ بێگومان، بەڵام ئارەزووی ڕێك و پێکیشە، ئارەزووی گۆڕینی دنیای ئینسانیە بە دنیایەکی ناسروشتی و ناجۆر کە تیایدا هەموو شتێك زۆر بەچاکی دەچێتە ژێر کۆنترۆڵی بەرنامە سازییەوەو دەبێتە پاشکۆی سستمێکی ناکەسایەتیەوە، ئارەزووی سستم لە هەمان کاتدا ئارەزووکردنی مەرگە، چونکە هەمیشە ژیان ئاشبەتاڵ پێکردنی سستمە، یان بە جۆرێکی دی: ئارەزووی سستم چاکترین پاساوی ڕەوایی پێدانە بۆ شەڕ ئەنگێزی و تووندوتیژیی مرۆڤ.

یاکوب کەوتەوە بیرکردنەوە لەو کچە قژ زەردەی ویستی ڕێی پێ بگرێت، هەستی بە ڕقێکی لە کوڵ کرد، ئەو لە پیرەمێردە داربەدەستەکان تووڕە نەبوو، ڕەگەزەکەیانی دەناسی، ئەو هەرگیز گومانی لەوە نەدەکرد، کە ئەم جۆرە کەسانە هەن و، دەبێت بەردەوامی بەژیانی خۆیان بدەن و تا کۆتایی تەمەنیشی هەر بەدوایەوە بن و سووسەی بکەن. بەڵام ئەم کچە، ئەمە چیرۆکێکی ترە، ئەو مایەی شکستێکی هەمیشەییەتی، ئەو جوان

بوو،دەرکوتنی لەسەرشانۆ بۆ ئەوە نەبوو کە بەدوایەوە بێت و لێی بگەڕێت، بەڵکو وەك تەماشاکەرێك دەرکەوتبوو کە نمایشەکەی بەدڵ بووبێت و لەگەڵ سووسەکەرەکاندا هاو سۆزبێت، هەمیشە یاکوب لەوە دەترسا تەماشاکەر گیانی یارمەتیدانی پیاوکوژی تیا دروست بێت و هاوکاریی دڵسۆزانەی بکات بۆ لە داونانی قوربانییەکان. چونکە بە مروری زەمان پیاوکوژەکان گۆڕاون بۆ مرۆڤی ئاسایی هاوڕێ، بەڵام قوربانییەکان بۆنی ناخۆشی خانەدانیان لێدێت، گیانی جەماوەر کە سەردەمانێك لەگەڵ گیانی قوربانییە چەوساوەکاندا یەکێك بوو ئێستا لەگەڵ گیانی داماوی چەوسێنەرەکاندا بووە بەیەك، لەم سەدەیەی ئێمەدا، ڕاوی مرۆڤ ڕاوی چینە خاوەن ئیمتیازەکانە: ئەوانەی کتێب دەخوێننەوەو سەگیان هەیە.

یاکوب لەژێر دەستیا هەستی بە گەرمیی لەشی سەگەکە کرد و بەخۆی وت: ئەو کچە قژ زەردە بە پەیامێکی نهێنی لەوەی ئاگادارکردەوە کە ئەم چارەنووسی لەم سەرزەمینەدا نەماوەو، هەمیشە ئەم کچەیش -پەیامبەری خەڵکی- لەسەرخۆ ئەم بۆ لای ئەوانە دەبات کە ئەڵقەیەك لە کۆتایی دارەکەی دەستیاندایە. یاکوب سەگەکەی لە ئامێزگرت و بەخۆیەوەی قرساند، بیری کردەوە نابێت سەگەکە بێ بەرگری لێکردن بەرەڵا بکات، دەبێت وەك یادگارییەکی چەوساندنەوەو ئازار، وەك یەکێك بە سەلامەتی گیانی دەربازکردبێت ببات بۆ دەرەوەی وڵات. پاشان وای هاتە بەرچاو بە جۆرێك ئەم بەستەزمانە خۆش خوڵقەی پەناداوە دەڵێی هەر بەڕاستیی هەڵاتوویەکی دەست پۆلیسەو، لە ناکاوێکیشدا ئەم کارەی خۆی بە سەیر و پێکەنین هێنەر زانی.

لە دەرگا دراو سکریتا هاتە ژوورێ "کەمێك درەنگ هاتوویتەوە، هەموو پاش نیوەڕۆ چاوەڕێم کردیت، لەکوێ بوویت؟"

"لەگەڵ ئۆلگا بووم و پاشانیش..." ویستی باسی سەگەکەی بۆ بکات، وەلێ سکریتا درێــژەی بـە قسـەکانی خۆیـدا: "دەبـوو بمزانیایـە، دنیایـەك بـاس و خواسمان هەیە دەبوو پێکەوە لێی بکۆڵینەوەو تۆیش کات بە فیڕۆ دەدەیت، مـن بــە بــارتلیفم وت تـۆ ئامـادەیت و ئــەویش هــەردووکمانی بانگهێشــتی ئاپارتمانەکەی خۆی کردووە"

لەوکاتـەدا سـەگەکە لەسـەر قەنەفەکـەوە بــازی دایــە خــوارێ. چـووە لای سکریتاوە، لەسـەر هـەردوو پاشووی وەسـتاو هـەردوو دەسـتی پێشەوەیشـی لەسەر سنگی دکتــۆر دانـا، سـکریتا دەسـتی بـە ملـی سـەگەکەدا هێنـاو بـێ سەرسووڕمان وتی: "سلاو بابیس،[6] سلاو چ سەگێکی دلۆڤانیت.."

"ناوی بابیسە؟"

سکریتا وەڵامـی دایـەوە "بەڵێ" ئەوەیشـی ڕوونکردەوە سەگی یـەکێك لـە میوانخانەکانی ئەو دەوروبەرەیەو هەموو خەڵکی ئەو ناوە دەیناسن، چونکە حەزی لە بەرەڵاییە.

سـەگەکە زانـی بـاس باسـی ئـەوەو پێـی خۆشـبوو، کەوتـە کلکـە لـەقێ و ویستی سەروچاوی سکریتا بلێسێتەوە.

دکتۆر سکریتا وتی: "تۆ دەروون ناسێکی زۆر چاکیت، دەبێت کەسایەتی بارتلیفم بۆ شی بکەیتەوەو لێی بکۆڵیتەوە، نازانم چۆنـی لێ نزیك بکەومەوەو، نەخشەیەکی گەورەیشم بۆ هەردووکمان هەیە"

"مەبەستت تابلۆ پیرۆزەکانە؟"

سکریتا وتی: "خوا تابلۆی پیرۆز بېڕێت! نەخشەی گەورەترم لـە بیردایـە، حەز ئەکەم لە جێی کوڕی خۆیم دابنێ"

"تۆ بکاتە کوڕی خۆی؟"

"حەز ئەکەم و زۆر زۆریشم لا گرنگە، چونکە ئەگەر بمکات  بە کوڕی خۆی ڕەگەزنامەی ئەمریکایی وەردەگرم"

"دەتەوێت بڕۆیت؟"

"نا، نامەوێت بڕۆم، لە تاقیکردنەوەی کارێکی بەر فراواندام و نامەوێت بیوەستێنم، ئەوەیان باسێکی ترە کە دەمەوێت ئەمڕۆ لەگەڵ تۆدا قسەی لەسەر بکەین،  چونکە لە بارەی ئەو تاقیکردنەوەوە پێویستیم بە یارمەتیتە، دەربارەی ڕەگەزنامە ئەمریکاییەکەیش لەوەدا مەسەلەکە گرنگە کە پاساپۆرتی ئەمریکاییم هەبێت و ئیدی دەتوانم سەفەر بە هەموو دنیادا بکەم، ئەگەر هاونیشتمانیەکی ئاسایی وڵاتی خۆمان بیت دەبێت هەتا ماویت لێرە گیر بخۆیت و بۆ هیچ جێگایەك نەچیت، من کوژراوی سەفەری ئایسلاندم"

"بۆ لەم هەموو وڵاتانەدا ئایسلاند؟"

سکریتا وتی: "چونکە ئایسلاند  چاکترین جێگایە کە بەئازادیی ڕاوی تیا بکەیت" لەسەر قسەکانی ڕۆشت "تەنیا  کێشەیەکی بچووك هەیە کە بارتلیف حەوت ساڵ لە من گەورەترە، دەبێت  ئەوەی بۆ ڕوون بکەمەوە کە کردنمی بە کوڕی خۆی تەواو کارێکی یاساییەو پەیوەندی بەوەوە نییە باوکی ڕاستەقینەم بێت، لەڕووی نەزەرییەوە ئەگەر تەمەنی لە منیش  کەمتر بێت هەر دەشێت لەجێی باوکم بێت، هیوادارم لەم مەسەلەیە تێ بگات، ئەگەرچی ژنێکی زۆر گەنجی هەیە، ژنەکەی یەکێك بوو لە نەخۆشەکانم، بڕیارە دوو سبەی بێتە ئێرە، بۆ پێشوازی لێکردنی لە فرۆکەخانە کڤیتا دەنێرمە شار"

"کڤیتا لە نەخشەکەت بەئاگایە؟"

"بێگومان، پێم وت دەبێت بەهەر نرخێك بووە هەوڵی دۆستایەتی خەسووی ئایندەی بدات"

"ئەی ئەمریکاییەکە چی؟ ئەو لەبارەی پێشنیازەکەتەوە چی دەڵێت؟"

"لێی تێناگەم، پێ دەچێت باش لە مەسەلەکە نەگات، بۆیە پێویستم بە تۆیە هەرچۆنێك بێت بتوانم لێی نزیك ببمەوە"

سکریتا تەماشای سەعاتەکەی کردو وتی بارتلیف چاوەڕێیان دەکات.

"ئەی بابیس چۆن؟"

"جارێ پێم بڵێ ئەولێرە چی ئەکات؟"

یاکوب باسەکەی بۆ هاوڕێکەی گێڕایەوە کە چۆن گیانی سەگەکەی ڕزگارکردووە. بەڵام سکریتا هێند نوقمی بیرکردنەوەی خۆی بوو ئاگای لە قسەی ئەو نەمابوو، دوای تەواوبوونی قسەکانی یاکوب وتی: "ژنی بەڕێوەبەری میوانخانەکە یەکێکە لە نەخۆشەکانم، دوو ساڵ پێش ئێستا منداڵێکی جوانکیلەی بوو، ئەوان بابیسیان زۆر خۆش دەوێت و دەبێت بەیانی بۆ ئەوێی بەریت، بۆ ئەوەیش لێمان هەڵنەپێچێت حەبێکی خەو لێ خستنی دەدەمێ"

لوولەیەکی شووشەی لە گیرفانی دەرهێناو حەبێکی نایە سەر لەپی دەستی، سەگەکەی گرت، دەمی کردەوەو حەبێکی بۆ ناوگەرووی هەڵدا. وتی: "هەر ئێستا خەوی زۆر خۆش دەبینێت" و یاکوبی لە ژوورەکە بردە دەرەوە.

—9—

بارتلیف خۆش هاتنی هەردوو میوانەکەی کرد و یاکوب چاوی بەم لاو ئەولای ژوورەکەدا گێڕا، بەرەو لای تابلۆی قەشە ڕیشنەکە چوو، بە بارتلیفی وت: "دیارە تۆ شێوەکاریت"

"بەڵێ، ئەمە سانت لازاروسە، قەشەیەکی پشتیوانمە"

یاکوب پرسی: "بۆ شەبەنگەکەیت بە شین کردووە؟"

"ئەم پرسیارەتم پێ خۆشە، خەڵك ئاسایی بێ ئەوەی لەبارەی ئەوەوە کە دەیبینن شتێك بزانن تەماشای تابلۆی نەقاشی دەکەن، بۆیە شەبەنگەکەم بە ڕەنگی شین کردووە چونکە لە ڕاستیا هەموو شەبەنگەکان ڕەنگیان شینە"

یاکوب سەرسووڕماویی خۆی دەربڕی و بارتلیف لەسەری ڕۆشت: "ئەوانەی شەیدای عەشقی خوداین ئاسوودەییەکی قووڵی ڕۆحیان خەڵات دەکرێت کە کاریگەرییەکەی دەرەوەیش ڕووناك دەکاتەوە، ڕووناکی ئەوشادییە خوداییە هێورو ئارامەوە ڕەنگی شینی ئاسمانی هەیە"

یاکوب قسەکەی پێ بڕی: "ببوورە با لە مەبەستتان باشتر تێبگەم، ئایا بەڕاستیی تۆ لەو باوەڕەدایت شەبەنگەکان شتێکی بالآترین لە سەمبولی گرافیك؟"

بارتلیف وەڵامی دایەوە: "بەڵێ، بێگومان، هەڵبەتە من وای بۆ ناچم کە شەبەنگەکان هەمیشە لە حاڵی پرشنگدانابن، یان قەدیسەکان وەك گلۆپی سەیار بەدەوری دنیادا بگەڕێن، هەڵبەتە ئەمە وا نییە، تەنیا لە چرکە ساتە تایبەتییەکانی شادمانییەکی زۆری دەروونیدایە کە ڕووناکییەکی ڕەنگ شین دەدرەوشێتەوە، لە سەدە بەراییەکانی دوای مەرگی مەسیحدا، ئەو سەردەمانەی قەدیسەکان زۆر و خەڵکێکی زۆریش لە نزیکەوە دەیناسین، لەبارەی ڕەنگی شەبەنگەکانەوە هەموو دنیا وەك یەك وا بوون، دەتوانیت ببینیت کە ڕەنگی شەبەنگی هەموو تابلۆ و نەخشی دیوارەکانی ئەوکاتە شین بووە، تەنیا لە سەدەی پێنجەم و بەدواوە بوو نیگار کێشەکان وردە وردە ڕەنگی تری لە بابەتی نارنجی یان زەردیان بۆ شەبەنگ بەکارهێنا. لە سەردەمی قوتیەکاندا هەمیشە ڕەنگی شەبەنگەکان تەنیا ڕەنگی ئاڵتوونی بوو، چونکە ڕەنگی ئاڵتوونی بۆ ڕازاندنەوە جوانترو، هێزی دنیایی و شکۆمەندیی

کڵێسای زیاتر دەردەخست. بەڵام ئەم شەبەنگە لەو شەبەنگە ڕاستەقینانە نەدەچوو کە لە کڵێسەکانی سەرەتای مەسیحیەتدا هەبوون".

یاکوب وتی: "من ئەمەم نەدەزانی" و، بارتلیفیش بەرەولای دۆڵابی مەشرووبەکەی چوو، لە میوانەکانی پرسی حەزیان لە چ جۆرە خواردنەوەیەکە، هەموویان داوای کۆنیاکیان کرد و، بارتلیف بەدەم تێکردنی سێ پێکەوە ڕووی لە دکتۆر سکریتا کردو وتی: "هیوادارم ئەو باوکە بەدبەختە لە بیرنەکەیت، مەسەلەکە زۆر گرنگە بۆ من"

سکریتا خانە خوێکەی خۆی لەوە دڵنیاکرد کە هەموو شتێك بەدڵی ئەو ئەبێت. لەوێدا یاکوب پرسی لە بارەی چییەوە دەدوێن، دوای ئەوەی بابەتەکەیان بۆ ڕوونکردەوە (هەقە ئافەرینی ئەو دووانە بکەین کە جوامێرانە نهێنیەکەیان پاراست: ناوی هیچ کەسێکیان نەهێنا)

یاکوب هاودەردیی خۆی لەگەڵ ئەو باوکە نەناسەدا بۆ دەرخستن.

"کام لە ئێمە بەو ئەزموونە ناخۆشەدا تێنەپەڕیوە! ئەمە یەکێکە لە تاقیکردنەوەکانی ژیان، ئەوانەی خۆ دەدەنە دەستەوەو بە پێچەوانەی ویستی خۆیانەوە دەبنە باوك هەتا ماون باجی شکستەکە دەدەن، ئەوانە وەك هەموو دۆڕاوێك بەدبەخت دەبن و پێیان خۆشە کەسانی تریش تووشی هەمان چارەنووس بێن"

بارتلیف بەسەرسووڕماویەوە وتی: "هاوڕێی ئازیز، تۆ چۆن لەبەردەم باوکێکی بەختیاردا قسەی وا دەکەیت؟ ئەگەر دوو سێ ڕۆژی تر لێرە بمێنیتەوە منداڵێکی زۆر جوانی من دەبینیت و ئەوسا لەم قسانەت پاشگەز دەبیتەوە"

یاکوب وتی: "پاشگەز نابمەوە، چونکە تۆ بە پێچەوانەی ئارەزووی خۆتەوە نەبوویتەتە باوك"

"ئەمە تەواو ڕاستە. من بە ویستی خۆم و ویستی دکتۆر سکریتا بوومەتە باوک"

سکریتا بەخۆشییەوە سەری پشتگیری لێکردنی ڕاوەشاندو ئەوەیشی درکاند کە سك پڕیی کڤیتای ژنی دڵخۆشی کردووەو، لەبارەی بە باوك بوونیشەوە تەواو ڕای لەگەڵ یاکوبدا جیاوازە، هەروەها وتی: "تاقە شتێك کە لە بارەی ئەوە خستنەوەوە کەمێك گومانی پێ پەیدا دەکات هەڵبژاردنی ناهوشیارانەی باوك و دایکە، هەندێك لە ناشیرینترین مرۆڤی دنیا وا هەست دەکەن بەهەر نرخێك هەیە دەبێت منداڵیان ببێت، ئەوانە لەو وەهمەدا دەژین، کاتێك لەگەڵ منداڵەکانیاندا ناشیرینی بەش دەکەن، قورسایی ناشیرینیەکەیان لەسەر کەمتر دەبێتەوە"

بارتلیف ئەم دیدەی دکتۆر سکریتای بە ڕایەکی ڕەگەز پەرستانەی جوانناسی دایە قەڵەم: "با ئەوەمان لە بیر نەچێت کە دەموچاوی سوکرات زۆر ناشیرین بووە، گەلێکیش لە عاشقە ناودارەکان لە لەش و لاری تەواو جوان بەهرەمەند نەبوون، گەلێك جار ڕەگەز پەرستیی جوان ناسین نیشانەی بێ ئەزموونییە، ئەوانەی بە قووڵی چێژیان لە دنیای خۆشەویستی وەرنەگرتووە، تەنیا لەسەر ڕووی دەرەوەو ڕواڵەتی ژنان قەزاوەت دەکەن، بەڵام ئەوانەی کە بەڕاستیی ژن دەناسن لەوە بە ئاگان چاوی ئێمە تەنیا بەشێکی هەرە بچووکی ئەوە دەبینێت کە ژن دەتوانێت پێمانی ببەخشێت، دکتۆر سکریتا، کاتێك پەروەردگار گیانی خۆشەویستی و ئەوە خستنەوەی بەخشیە مرۆڤ، ناشیرینی و جوانی پێکەوە مەبەست بوو، هەرچۆنێکە، من باوەڕم وایە کە پێوانەی جوان ناسی لە خواوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو لە شەیتانەوەیە، لە بەهەشتا چ جیاوازییەك لەنێوان ناشیرینی و جوانیدا نییە"

یاکوب کەوتەوە قسەکردن و وتی سەرنجەکانی لە بارەی جوان ناسییەوە هیچ پەیوەندی بەوەوە نییە کە ئەو حەز ناکات ببێتە باوك، لەسەر قسەکانی ڕۆیشت: "وەڵێ من دەتوانم دە بەڵگەی تر لەسەر ئەوە بهێنمەوە کە بۆچی من دژی بە باوك بوونم"

بارتلیف وتی: "بەردەوامبە، پەرۆشی گوێ گرتنم"

یاکوب کەمێك بیری کردەوە: "یەکەم، من خۆشیم لە دایکایەتی نایەت، سەردەمی نوێ، پەردەی لەسەر ڕووی هەموو ئەفسانەکان هەڵماڵیوە، دەمێکە منداڵیی سەردەمی بەرائەتی خۆی لە دەستداوە، فرۆید پەی بە ئارەزووی سێکسیی منداڵان بردو مەسەلەی ئۆدیبی تەواو بۆ ڕوون کردینەوە، تەنیا جوکاستا[7] یە کە لە نێو ڕووپۆشدا ماوەتەوەو، چ کەسێك هێند بوێر نییە کە ئەو ڕووپۆشە بدڕێنێت، دایکایەتی ئاخر و گەورەترین تابۆیە کە مەترسیترین نەفرەتی ژیانی لە خۆیدا شاردۆتەوە، هیچ پێوەندێك بە ئەندازەی پێوەندیی نێوان دایك و مناڵەکانی بەهێز نییە، ئەو پێوەندە بۆ هەمیشە منداڵ ئیفلیج دەکات و، کاتێك کە منداڵیش گەورە دەبێت، ناخۆشترین ئازاریی خۆشەویستی بۆ دایکی فەراهەم دێنێت. من ئەوە دووبارە دەکەمەوە کە دایکایەتی نەفرتەو نامەوێت بەشداریی تیا بکەم".

بارتلیف وتی: "بەردەوامبە"

یاکوب بە کەمێك دوو دڵییەوە وتی:

"هۆیەکی تریش بۆ ئەوەی کە حەزم بە زۆربوونی دایك نییە، ئەوەیە من لەشی ژنم خۆش دەوێت، ناتوانم بێز لەوە نەکەمەوە کە چۆن مەمکی خۆشەویستەکەم دەبێتە کیسەی شیر"

بارتلیف وتی:

"بێگومـان دکتۆرەکـەمان ئـەوە دەسـەلمێنێت کـە هەڵسـوکەوتی کـادرە پزیشکییەکان لەگەڵ ئەو ژنانەی منداڵیان دەبێت دڵسـۆزانەترە لـەو ژنانـەی بڕیاری لە باربردنیان داوە، سستەرەکان لەگەڵ ئەوەشدا دەشـێت ڕۆژێـك لـە ڕۆژان خۆیان تووشی هەمان هەڵوێست ببن، بەلاّم بە چاوی سووکەوە لەو ژنانە دەڕوانن کە منداڵ لەبارخۆیان دەبەن. وەلیٚ نەفرەتێکە زۆر بەهێزترە لە لۆژیك، چونکـە بـیری منداڵبـوون حوکمـی سروشـتە، لەبـەر ئەمـە ئەگـەر بتـەوێت پاساوێکی لۆژیکیانـە بـۆ ڕاگەیاندنـەکانی گەشـەکردنی کۆمـەڵ بدۆزیتـەوە، کـارێکی بـێ هـوودە دەکـەیت. ئایـا کـە کڵێسـا بنـەما ئاکارییـەکانی کۆمـەڵ ڕادەگەیـەنێت هیچ گوێتـان لـەدەنگی مەسیح دەبێت؟ یـان وا دەزانن ڕوانگـەی ڕەسمیـی کۆمۆنیسـتی لـەبارەی گەشـەکردنی کۆمەڵـەوە ڕەنگدانـەوەی بـیری مارکسـە؟ بـە تـەنیا ئـارەزووی پارێزگـاریکردن لـە ڕەگـەزی مـرۆڤ سـەربەرەو ئەنجامێك دەکێشـێت کـە دەسـتنانە گەرروویـەتی تـا ڕادەی خنکـاندنی، بـەلاّم ڕاگـەیاندن بـۆ ئـەو پارێزگاری لێکردنـە هـەر بەردەوامـە، خـەڵکیی کـە وێنـەی دایکێك دەبینن منداڵەکەی لە باوەشدایە، یان منداڵێك پێدەکەنێت دەکەونـە گریان، من ئەم شتانە تێکم دەدەن، کە خۆم دێتە بەرچاو وەك ملیۆنان باوکی گـەمژەی تـر، بـە زەردەخەنەیـەکی گەلۆرانـەوە بەسـەر بێشـکەی منداڵێکـدا چەماوەمەتەوە، لەرزم لێدێت"

بارتلیف وتی: "بەردەوامبە"

"بێگومـان، دەبێـت بـیر لـەوەیش بکەمـەوە، کـە منداڵەکـەم لـە چ دنیایـەك دەهاوم. لە چاوتروکانێکدا دەڕواتە قوتابخانە و لـەوێ مێشکی پڕدەکەن لەو درۆو دەلەسـانەی لـە هـەموو تەمـەنمدا دژایـەتیم کـردوون، ئایـا دەبێـت مـن تەماشـاکەری منداڵەکـەم بم کـە چـۆن وردە وردە دەبێتـە دەبـەنگێك وەك دەبەنگەکانیتر؟ یان دەبێت میراتیی عـەقڵی خۆمـی بدەمـێ تـەنیا بـۆ ئـەوەی

بەچاوی خۆم ئەو کێشمەکێش و ململانێ کۆنانە ببینم کە بەرەو ڕووی ئەویش دەبنەوە؟

بارتلیف وتی: "بەردەوامبە"

"بێگومان دەبێت بیر لە خۆیشم بکەمەوە، لەم ولاتەدا باوك و دایك لەسەر گوێڕایەڵی نەکردنی منداڵەکانیان و منداڵەکانیش لەســەر ســەرپێچی بـاوك و دایکیان سزا دەدرێن، زۆرن ئەو مێردمندالانەی لەبەر ئەوەی باوك و دایکیان خۆشیان نەویستوون لە قوتابخانە دەرکراون، زۆریشن ئەو باوك و دایکانەی تەنیا لەبەر ئەوەی مەترسیی لە ڕێی منداڵەکانیاندا نەهێڵن خۆیان ترسنۆك دەرچوون، لەم ولاتەدا ئەوەی دەیەوێت ئازادی خۆی بپارێزێت دەبێت بیر لەوە نەکاتەوە منداڵی هەبێت"

یاکوب ئەمانەی وت و بێدەنگی دایگرت.

بارتلیف وتی: "تۆ تەنیا پێنج بەڵگەت بۆ هێناوینەتەوە، دەبێت پێنجی تریش بێنیت تا بکاتە دە بەڵگەکە"

یاکوب وتی: "بەڵگەکەی دی هێند سەنگینە بە تەنیا خۆی بە پێنج بەڵگە دەچێت. کە تۆ بوویت بە باوك یان دایك واتا ژیانی مرۆڤت بەرەهایی (موتڵەق) قبووڵە، کە من بووم بە باوکی منداڵێك وەك ئەوە وایە بە دنیام ڕاگەیاندبێت کە: من هاتوومەتە دنیاوە، چێژم لە ژیان وەرگرتووە، ئەمەندەیشم لا خۆش بووە کە بە پێویستی بزانم یەکێکی وەك خۆم بخەمەوە"

بارتلیف پرسی:

"بۆ تۆ ژیان بە جوان نازانیت؟"

یاکوب ویستی وردەکارتر بێت، بە پارێزەوە وتی: "تاقە شتێك من بیزانم ئەوەیە کە ناتوانم تەواو لە ناخی دڵمەوە بڵێم: مرۆڤ بوونەوەرێکی مەزنە و پێم خۆشە نەوە بخاتەوە"

دکتۆر سکریتا وتی: "ئەمە هۆی ئەوەیە تۆ ژیانت تەنیا لە لایەنێکەوە ئەزموون کردووە، ئەویش ڕووە ناشیرینەکەیەتی، هەرگیز نەتزانیوە چۆن ئەژیت، ئەتوانم بڵێم بەردەوام تۆ وات بیرکردۆتەوە ئەرکێکت لەسەرە کە دەبێت لە سەختترین شوێنی ژیاندا بیت، تەواو لە چەقی چالاکییەکاندا، ئەو چالاکییەیش کە تۆ پەرۆشی بوویت چی بووە؟ سیاسەت، سیاسەت، کەم بایەخترین و کەم نرخترین لایەنی ژیانە، سیاسەت کەفێکی پیسە بەسەر ڕووبارەوە، لەکاتێکدا ژیانی ڕاستەقینە لە قووڵایی ڕووبارداییە، لێکۆڵینەوە لەسەر ئاوسیی ژن هەزاران ساڵە هەیە، ئەمە مێژوویەکی ڕاستەقینەو مەقبووڵە، بە ئەندازەی نووکە دەرزییەکیش فەرق ناکات بەڕێکەوت دەسەڵات بەدەست چ حکوومەتێکەوەیە، من کە دەستکێشە لاستیکەکەم دەکەمە دەست و بەر منداڵدانی ژنێك دەکەوێت، زۆر لە تۆ لە حەقیقەتەوە نزیکترم، تۆیەك لە پێناوی خێری مرۆڤدا زۆری نەمابوو ژیانت بەخت بکەیت"

یاکوب کە مەبەستی نەبوو وەڵامی سەرکۆنەکردنی هاوڕێکەی بداتەوە، سەری قایل بوونی لەقاند، سکریتا بینی بە قسەوە گرتبوو، وتی: "ئەرخەمیدس بەهێڵە بازنەییەکانیەوە، مایکڵ ئانجیلۆ بە بەردێکەوە، پاستۆر بە لوولەکانی تاقیکردنەوەیەوە، ئەمانە، ئەو کەسانەن ژیانی مرۆڤیان گۆڕی و مێژووی ڕاستەقینەیان دروستکرد، لە حاڵێکدا کە سیاسەتمەدارەکان...) سکریتا دەستی سووکایەتی پێکردنی ڕاوەشاند.

یاکوب وتی: "لە حاڵێکدا سیاسەتمەداران چی؟ من وەڵامی ئەم پرسیارە ئەدەمەوە. هونەر و زانست مەیدانی ڕاستەقینەی مێژوون، لەکاتێکدا سیاسەت بەڕاستی تاقیگایەکی بچووکەو تاقیکردنەوەی دەگمەن لەسەر مرۆڤ دەکات، وەك مشکی تاقیگا مرۆڤ دەردەهاوێت، پاشان، ئەوانەیان کە شەیدای چەپڵەڕێزان و ئافەرین لێکردنن و سێدارە ترسی بۆ بریون، ڕسوا بوون و

ناچارن کەسانی دی ڕسوا بکەن، بەرزیان دەکەنەوەو دەیانخەنە سەر شانۆ، منیش، چ وەك لێکۆڵەرەوەو چ وەك ئاژەڵێکی تاقیکراوە، بوومەتە بەشێك لەو تاقیگایانە، دەزانم هیچ بەهایەکی نوێم بەدی نەهێناوە (هاوکارەکانیشم چ بەهایەکی نوێیان بەدی نەهێناوە) بەڵام وا هەست دەکەم زۆر لەخەڵکی دی زیاتر شارەزاییم لە خودی مرۆڤدا پەیداکردووە"

بارتلیف وتی: "تێت دەگەم، تەنانەت لەگەڵ ئەوەیشدا کە هەرگیز دەوری لێکۆڵەرەوەیەکم نەدیوەو هەمیشە دەوری بەرازۆکەیەکی هیندیم[8] بینیوە، ئەو تاقیگایانەی باست لێوە کردن دەیانزانم، لە ئەڵمانیا بووم کە جەنگ هەڵگیرسا، ئەو ژنەی خۆشم دەویست دامیە دەست گستابۆوە، ئەوان وێنەی منیان لەگەڵ ژنێکی ترداو دەست لەناو دەست پیشانی ژنە کە دابوو، وێنەکە برینداری کردبوو، وەك دەزانن خۆشەویستیەکی بریندارکراو زۆر جار ڕق و نەفرەتی لێدەکەوێتەوە، بەم هەستە نائاساییەوە کە بەر ڕەتی خۆشەویستی کەوتم خرامە زیندانەوە، ئایا ئەمە مەحشەر نییە خۆت لە چنگی گستابۆدا ببینیتەوەو ئەو ڕاستیەیش بزانیت ئەمە خەڵاتی پیاوێکە دڵدارەکەی زۆری خۆش ویستووە؟"

یاکوب وتی: "بەڕاستیی ئەوەی لە مرۆڤدا بێزارم دەکات ئەو ستەم و سووکایەتی و تەنگ بینیەیە کە لە ژێر دەمامکی هەست و سۆزدا خۆی دەشارێتەوە. مرۆڤێك دەبێتە هۆی مردنت و فرمێسکی گەرمیش بۆ ئەو عەشقە ناکامە دەڕێژیت، بۆ ژنێکی زۆر ئاسایی دەڕۆیتە سەر سێدارەو، دڵنیایت دەورێك لە تراژیدیایەکی هێند ناوازەدا دەبینیت کە تەنیا لە توانای شەکسپیردایە بینووسێت"

بارتلیف وەك بڵێی گوێی لە یاکوب نەبووبێت، لەسەر قسەکانی ڕۆشت: "دوای کۆتایی جەنگ، ژنەکە بەدەم فرمێسك ڕشتنەوە هاتە لام، پێم وت هەرگیز مەترسە، بارتلیف پیاوێکی تۆڵەسێن نییە"

یاکوب وتی: "لەم ڕووەوە بیری شا هیرۆدم[9] دەکەوێتەوە، چیرۆکەکە دەزانن، ئەو پێدەچوو بزانێت کێ لە ئایندەدا دەبێتە پاشای جوولەکە، لە ترسی ئەوەیش کە تاج و تەختەکەی لە دەست نەچێت، هەموو منداڵانی کوشت، من لە بارەی هیرۆدەوە بە تەواویی بیروباوەڕێکی جیاوازم هەیە، هەرچەندە بەکەمێك خەیاڵیشی دەزانم، من هیرۆد بە پیاوێکی بلیمەت، عاقڵ و مەزن دەزانم کە بۆ ماوەیەکی زۆر لە تاقیگای سیاسەتدا قوتابیو، لەبارەی دنیاو مرۆڤەوە زۆرشت فێربووە، هیرۆد لەوە گەیشتبوو کە نەدەبوو هەرگیز مرۆڤ دروست بێت. لەڕاستیا ئەم گومانە، وەك دێتە بەرچاو، ئەوەندە ناجۆروخەتاکارانە نەبووە، ئەگەر من هەڵە نەبم، تەنانەت خودی پەروەردگاریش دوای تێفکرینی زیاتری لە ڕەگەزی مرۆڤ، بیری لەوە کردەوە ئەم مەخلووقەی خۆی لەناوبەرێت".

بارتلیف ڕازی بوو: "ئەمە ڕاستە، ئەم مەبەستە لە کتێبی دروست بووندا نووسراوە: "ئەو مرۆڤەی خۆم دروستم کردووە لەناوی دەبەم.. لە دروست کردنەکەی پەشیمانم"

ڕەنگە ئەمە چرکە ساتی لاوازیی خوا بووبێت کاتێك کە ڕێگای بە نووح دا پەنا بەرێتە بەر کەشتیەکەی تا مێژووی نوێی مرۆڤایەتی تۆماربکات، ئایا دەتوانین باوەڕی تەواومان بەوە هەبێت خوا هەرگیز لەو لاوازییەی خۆی پەشیمان نەبووبێتەوە؟ بەڵام تازە بۆ پەشیمان بوونەوە یان پەشیمان نەبوونەوە کات زۆری بەسەر چووبوو، خوا کە ناتوانێت بەردەوام لە

بڕیارەکانی پەشیمان بێتەوە، دەشێت بیرەکەی خستبێتە سەری هێرۆدەوە، ئایا دەتوانین شیمانەیەکی وا ڕەت بکەینەوە؟"

بارتلیف شانی هەڵتەکاندو هەر بێدەنگ بوو.

"هیرۆد پاشا بوو، تەنیا لەخۆی بەرپرس نەبوو، ئەو نەدەبوو وەك من بە خەیاڵی ڕاحەتەوە بەخۆی بڵێت: لێگەڕێ خەڵکیتر چییان پێخۆشە بیکەن، من نامەوێت منداڵم ببێت. هیرۆد پاشا بوو دەیزانی بڕیار نەك هەر تەنیا بۆ خۆی، بەڵکو بۆ زۆری تریش لە ئەستۆی ئەودایە، ئەو بەناوی هەموو ڕەگەزی ئادەمیزادەوە بڕیاریدا مرۆڤ واز لە دووبارەکردنەوەی خۆی بهێنێت. بەم جۆرە بوو ڕەشە کوژی منداڵان ڕوویدا، ئەوەی هانی هیرۆدی دا بۆ ئەم کارە ئەو هۆکارە ئابڕووبەرانە نییە لە کۆندا دراونەتە پاڵی، بەڵکو لە شەریف ترین بیروباوەڕەوە ئیلهامی وەرگرتبوو، یەعنی، ڕزگارکردنی جیهان لە چنگی مرۆڤایەتی"

بارتلیف وتی: "ئەم ئەنجام گیرییەتانم دەربارەی هیرۆد بەدڵە، بەڕاستیی هێندم بەدڵە کە لەمەودوا لەبارەی ڕەشەکوژی بێ تاوانەکانەوە وەك ئێوە بیربکەمەوە، بەڵام ئەوە لە یاد نەکەیت ئەوکاتەی هیرۆد بڕیاری نەهێشتنی ڕەگەزی مرۆڤیدا، منداڵێك لە بەیت لەحم چاوی بە دنیا هەڵهێنا کە لە ژێر چەقۆکەیدا خەلەستبوو، ئەو منداڵە گەورە بوو، بەخەڵکی وت تەنیا شتێك ژیان پڕ لە بەها دەکات: یەکتری خۆشویستن. ڕەنگە هیرۆد بلیمەتترو بە ئەزموونتر بووبێت، بەڕاستییش مەسیح گەنج و دەشێت لە بارەی ژیانەوە شتێکی وای نەزانیبێت، ڕەنگە هەموو ڕێنماییەکانی بە لاوی و بێ ئەزموونی ئاڕاستە کردبێت، بابڵێین ڕەفتاری هەرزەکارانە، لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا ئەو لەسەر هەق بوو"

یاکوب بە توندی پرسی: "هەق؟ کێ سەلماندوویەتی ئەو لەسەر هەق بێت؟"

بارتلیف وەڵامیدایەوە: "هیچ کەس، کەس شتی وای نەسەلماندووە، لە ئایندەیشدا کەس شتی وا ناسەلمێنێت. مەسیح ئەوەندە باوکی خۆشدەویست نەیدەتوانی بەرهەمەکەی باوکی بەخراپ بێتە بەرچاوی، خۆشەویستیی ڕابەری مەسیح بوو، نەك لۆژیك، هەر لەبەر ئەمەیشە ئێمە تەنیا لە ڕێی دڵمانەوە دەتوانین داوەریی لەسەر ناکۆکییەکەی نێوان هیرۆدو مەسیح بکەین، بە ئینسان بوون بەهای هەیە یان نا؟ من هیچ بەڵگەیەکم پێ نییە، بەڵام لەگەڵ وەڵامەکەی مەسیحدام کە دەڵێت بەڵێ" بەدەم زەردەخەنەوە پەنجەی بۆلای دکتۆر سکریتا ڕاهێشت "هەر لەبەر ئەم هۆکارەیە هاوسەرەکەم هێناوەتە لای پزیشکێکی شارەزامان کە بەڕای من یەکێکە لە شاگردە تایبەتییەکانی مەسیح، چونکە دەزانێت چۆن موجیزە بنوێنێت و منداڵدانی نووستوو بە ئاگا بێنێتەوەو ژیانی تازەیان پێ ببەخشێت، من بە سلامەتی ئەو دەخۆمەوە"

—10—

هەمیشە یاکوب وەك باوکێك ڕەفتاری لەگەڵ ئۆلگادا کردبوو، پێی خۆشبوو ئۆلگا وەك "گەورەیەکی بەڕێز" لێی بڕوانێت، ئۆلگا ئەوەی دەزانی لە ژیانی یاکوبدا ژن زۆرەو هەڵسوکەوتی لەگەڵیاندا تەواو جیاوازە کە ئەم ئیرەییان پێ دەبات، بەڵام ئەمڕۆ، بۆ یەکەمین جار، بیری بۆ ئەوەچوو بەڕاستیی لە یاکوبدا جۆرێك لە پیریەتی هەیە. لە ڕەفتاریا هەمان ئەو تۆزە بۆنە کۆنینەیە هەیە کە لاوەکان لە کەسانی لەخۆیان گەورەتردا دەیبینن. ئەمە خەسڵەتی پیرەکانە کە لەبارەی سەختیی ڕۆژگاری خۆیانەوە لاف و گەزاف لێبدەن و

ڕابووردووی تاڵیان بکەنە مۆزەخانە بۆ ئازارەکانیان (ئەفسووس ئەو مۆزەخانە غەم ئەنگێزانە ئاسایی زۆرکەم تەماشاکەر بۆلای خۆیان ڕادەکێشن)

ئۆلگا ئەوەی دەزانی ئەو کەرەسەیەکی سەرەکی و زیندووی مۆزەخانەکەی یاکوبەو، ئەو پەیوەندی فیداکاری و سەخاوەتمەندیەی یاکوب لەگەڵیدا دەیکات بۆ ئەوەیە بینەران بکاتە گریان.

ئەمڕۆ لەگەڵ بەنرخترین کەرەسەی بێ گیانی نمایشکراوی مۆزەخانە ئاشنا ببوو، حەبی شین باوی ئەمڕۆ کە پێشتر یاکوب بە بەرچاویەوە لە کاغەزە ئاڵتوونیەکەدا دەریهێنا، لەوەی کە بە هیچ جۆرێك کاری لێنەکرد سەری سووڕما، لەوە گەیشت یاکوب زۆر ئازاری پڕ لە مەترسیی ئەزموون کردووەو بە جیدی بیری لە خۆکوشتن کردۆتەوە، بەڵام ئەو ئەزموونانەی هێند بەسۆزەوە دەگێڕایەوە کە مایەی پێکەنین بوو. ئەو پێچانەوە بە پارێزەی لەو جۆرە کاغەزە زەردو زواڵەدا، وای دەردەخست ئەڵماسێکی بەنرخی شاراوە ئاشکرا دەکات. بەڵام لەوە نەدەگەیشت بۆچی یاکوب لەکاتی ئازار چەشتنی زۆردا، کاتێ ئەوەی ڕاگەیاند کە هەر مرۆڤێکی پێگەیشتوو، لەهەر هەل و مەرجێکدا دەبێت کۆنترۆڵی مەرگی خۆی لەدەستی خۆیدا بێت، کەچی ئێستا بڕیاریداوە ژەهرەکە بگێڕێتەوە بۆ دکتۆر سکریتا. دەشێت دوای دەرچوونی لە وڵات تووشی شێرپەنجە یان نەخۆشیەکی ترسناکی تر بێت و ژەهری پێویست بێت. نا، تەواو بەلای یاکوبەوە ئەوە دیاربوو کە حەبەکە نەك تەنیا چارەسەرێکی بەکەڵك، بەڵکو ڕەمزێکی پیرۆز بوو بەپێی ڕەوشی ئایینی دەبوو بگەڕێتەوە لای کاهینی گەورەو ئەمەیش شتێکی بێ ماناو هیچ و پووچ بوو.

لە گەرماوی ئاوەکانزاییەکانەوە دەهات و بەرەو لای ساختمانەکەی ریچموند دەڕۆشت، لەگەڵ گشت نیەتە خراپەکانیدا بە تاسەوە چاوەڕێی یاکوبی دەکرد، پێی خۆشبوو سووکایەتی بە مۆزەخانەکەی بکات و زیاتر

ژنێك بێت نەك كەرەسەی نمایشی شانۆیی. كە یاداشتی سەردەرگاكەی بینی تیا نووسرابوو یاكوب و سكریتا لە ئاپارتمانەكەی تەنیشت لای بارتلیفن و دەبێت ئەمیش بۆ دیدەنیان بڕواتە ئەوێ كەمەكێك نائومێد بوو، لەوە دەچوو ئەوانەی دەچووە لایان بە تەنگی بێنن، ئەسڵەن بارتلیفی نەدەناسی و دكتۆر سكریتایش گوێی پێ نادات و وەك مرۆڤێكی ئاسایی مامەڵەی دەكات.

هەرچۆن بوو بارتلیف هێنایەوە سەرخۆی، زۆر بەڕێزەوە خۆشهاتنی لێكرد، لۆمەی سكریتایشی كرد بۆ تا ئەو كاتە ژنێكی وا سەرنج ڕاكێشی پێ نەناساندووە.

سكریتا وەڵامێكی زبری دایەوە كە یاكوب كچەكەی بەو سپاردووەو ئەویش هەر بە ئانقەست ئۆلگای بە بارتلیف نەناساندووە، چونكە دەزانێت هیچ ژنێك خۆی لەبەردا ناگرێت.

بارتلیف ئەم پۆزشەی بە خۆشییەوە وەرگرت، تەلەفۆنەكەی هەڵگرت و داوای لە ڕێستووڕانەكە كرد شێویان بۆ بنێرێت.

دكتۆر سكریتا وتی: "جێی باوەڕكردن نییە ئەم هاوڕێیەمان، لەم جێگا دوورە دەستەدا كە تەنانەت میوانخانەیەكی تیا نییە داوای خواردنێكی باش بكات، ئەم ئاوا ژیانێكی باش بەسەر دەبات.

بارتلیف دەستی بۆ پاكەتێك جگەرەی سەر ئاوەڵا كرد كە پڕبوو لە نیو دۆلاریی زیوی ئەمریكی و لەپاڵ تەلەفۆنەكەدا دانرابوو، زەردەیەك گرتی و وتی: "پێویستە مرۆڤ دەست و دڵی كراوە بن..."

یاكوب وتی قەت كەسی وەك بارتلیفی نەبینیووە وا زۆر بڕوای بە خوا هەبێت و لە هەمان كاتیشدا زۆریش چێژ لە ژیان وەربگرێت.

بارتلیف وتی: "ئەمە نیشانەی ئەوەیە دەشێت تۆ هەرگیز مەسیحیەکی ڕاستەقینەت نەناسی بێت، وشەی ئینجیل واتا (مزگێنی) چێژ لە ژیان وەرگرتن گرنگترین میراتی مەسیحیە"

بەلای ئۆلگاوە ئیدی کاتەکە لەباربوو تا ئەویش سەربکێشێتە ناوگفتوگۆکەوە "هەمیشە مامۆستاکانم جەختیان لەسەر ئەوە دەکرد کە مەسیحیەکان ژیانی سەر زەوی تەنیا بە دەربەندی فرمێسك دەزانن و، بە تاسەوە چاوەڕێی ئەو ژیانە ڕاستەقینەیەن کە لە دوای مردنەوە دەست پێدەکات"

بارتلیف وتی: "خانمە ئازیزەکەم، هەرگیز باوەڕ بە مامۆستایان مەکە".

ئۆلگا لەسەری ڕۆشت "ئەوان ئێمەیان وافێر دەکرد کە ئەرکی ڕاستەقینەی قەدیس ئەوەیە پشت لە ژیان بکات، ئەوان لە بری یەکدی خۆشویستن، لەخۆیان دەدا، لەباتی گفتوگۆ لەگەڵ یەکتردا خۆیان لە خەڵوەتدا زیندانی دەکرد، لەبری ئەوەی بە تەلەفۆن داوای شێو بکەن، بنج و پرزە گیایان کاوێژ دەکرد"

"ئۆلگای خۆشەویست، تۆ هەرگیز لە مانای ڕەفتاری قەدیسەکان تێناگەیت، ئەوان مرۆ گەلێك بوون بێ حەد چێژیان لە ژیان دەکرد، زۆر بەشێوازی تایبەتی دەستیان بۆ ئەو لەزەتانە دەبرد، بەڕای تۆ بالاترین لەزەت کە مرۆڤ بتوانێت بەدەستی بێنێت چییە؟ تۆ ناتوانیت پەی بەم وەلامە بەریت، لەبەر ئەوەی وەك پێویست ڕاستگۆنیت، ئەمە سەرزەنشت نییە، چونکە ڕاستگۆیی بەستراوە بە خۆناسینەوە، خۆناسینیش بەرهەمی تەمەنە، بۆیە کچێك گەنجایەتی لێ ببارێت چۆن دەتوانێت ڕاستگۆبێت؟ ناتوانێت، چونکە دەروونی خۆی ناناسێت، وەلێ ئەگەر خۆی بناسیایە لەگەڵما هاوڕا دەبوو کە گەورەترین چێژ وەرگرتن لە ژیان ئەوەیە ڕێزی لێبگریت"

ئۆلگا وەڵامی دایەوە کە ئەو دەتوانێت وێنای لەزەتی گەورەتر بکات.

بارتلیف وتی: "باوەڕناکەم، تۆ تەماشای ئەو غاردەرە بەناوبانگە بکە کە لەم دواییەدا ناوی لە هەموو هەواڵەکاندا هەبوو، ئەوەی سێ میدالیٚ ئۆڵەمپیکی لەسەریەك بردەوە، ئایا ئێوە وای دەبینن مرۆڤێك بێت تەرکی دنیای کردبێت؟ ئەو بەناچاری وازی لە تێکەڵی و هاوڕێیەتی، خۆشەویستی و گەلێك شایی و ئاهەنگ هێناوەو سەعات و ڕۆژی داوەتە پێوەو بەردەوام بەدەوری یاریگادا ڕایکردووە. بەرنامەی ئاسایی وەرزشکارەکان زۆر لە ڕژێمی قەدیسەکانمان دەچێت. سانت ماکاریوسی[10] خەڵکی ئەسکەندەرییە کاتێك لە بیاباندا دەژیا، زۆرجار زەمیلەیەکی پڕ لە لم دەکرد، دەیخستە سەرپشتی و چەند ڕۆژێك بەردەوام ئەوەندە ئەو بیابانە بێ کۆتاییە دەگەڕا تا هێند شەکەت دەبوو لە پێ دەکەوت، لەم حاڵەدا، لە دیدی غاردەری ئۆڵەمپیك و ماکاریوسی ئەسکەندەرییەوە خەلاتەکەیان ئەوەندە ناوازە بوو کە ماندوو بوون و زەحمەتەکەیانی قەرەبوو دەکرد، ئایا دەزانیت گوێ بیستی چەپڵەو ئافەرین لە یاریگایەکی گەورەی ئۆڵەمپیکدا چ مانایەکی هەیە؟ لەزەتی لەوە گەورەتر هەر نییە، سانت ماکاریوس زۆرباش دەیزانی بۆ زەمیلە لم دەخاتە سەرپشتی، زۆری نەخایاند دەنگی ئەو ڕێچکە شکێنەی کە لەوەوبەر کەس نەیکردبوو لەو سەفەرە دووردرێژانەی بیابانیدا هەموو دنیای مەسیحیەتی گرتەوە، سانت ماکاریوسیش ڕێك وەك ئەو غاردەری ئۆڵەمپیکەکان وایە: دوای ئەوەی لە ڕاکردنی پێنج هەزار مەتریدا سەرکەوت نۆرە هاتە سەر ڕاکردنی دە هەزار مەتری، دوای ئەوەیش کە لەودا سەرکەوت ئیتر تا نەگەیشتە دوا پلەی سەرکەوتن دەستبەردار نەبوو، ئەم تینویەتی ناو دەرکردنە تێربوونی نییە، سانت ماکاریوس وەك نەناسراوێك چووە دێری تابیسە[11] وەو داوای کرد وەك قەشەیەکی ئاسایی وەری بگرن، تا ڕۆژوی چل ڕۆژە دەستی پێکرد ئارامی

گرت و، ئیتر کاتی ناوبانگ و شانازییەکەی هاتبوو. لەکاتێکدا ئەوانیتر بە دانیشتنەوە بە ڕۆژو بوون، ئەو هەرچل ڕۆژەکە بە پێوە وەستا، ئەم جۆرە سەرکەوتنە لای ئێوە تەنانەت جێی بیر لێکردنەوەیش نییە. یان تەماشای شەمعونی[12] پیرۆزی ستوون نشین بکەن. لە ناوەڕاستی بیاباندا ستوونێکی بۆ خۆی دروستکرد سەکۆیەکی بە ئەندازەی وەستانی خۆی لەسەر بوو، هەموو پاشماوەی تەمەنی بەسەر ئەو ستوونەوە وەستا، هەر لەو حاڵەدا دنیای مەسیحیەت بەو ئەنجامەی کە جێی بڕوا نیە، بەو دەستکەوتەی کە وا دەهاتە بەرچاو لە سەرووی توانای مرۆڤەوەیە، زۆر بەشەوق و تاسەوە پێشوازی لێکرد، شەمعونی پیرۆز یوری گاگارینی سەدەی پێنجەم بوو، ئایا دەتوانن خۆشیی سانت ئانی پاریسی[13] لەو کاتەدا کە لەڕێگای دەستەیەك لە بازرگانەکانی خەڵکی گال[14]ەوە بیستی شەمعونی پیرۆز ئاگای لە ژیانی هەیەو لەسەر ستوونەکەوە دوعای بۆکردووە بەرجەستە بکەن؟ لە دیدی ئێوەوە بۆچی ئەو ئەمەندە ئارەزووی لە ڕێکود (ژمارەی پێوانەیی) شکێنی بوو؟ لەبەر ئەوەی پەیوەندییەکانی خۆی بە ژیان و شتەکانی ئەم دنیاوە بڕیبوو؟ هێند ساکار مەبن! باوکانی کڵێسا لە فیزو خۆپەسەندی زۆری شەمعونی پیرۆز تەواو ئاگاداربوون، ئەویان ڕووبەڕووی ئەزموونێك کردەوە، بەناوی دەسەڵاتی ڕۆحییەوە داوایان لێکرد لە ستوونەکەی بێتە خوارێ و واز لە هەوڵی ڕێکود شکاندن بێنێت. چ زەبرێك بەر شەمعونی پیرۆز کەوت! وەلێ ئەو ئەوەندە بە ئاوەز یان حیلەبازبوو کە فەرمانەکەی قبووڵکرد، باوکانی کڵێسا دژی کارەکەی ئەو نەبوون، تەنیا ئەیانویست لەوە دڵنیابن لووت بەرزییەکەی لە سەرووی فەرمان بەجێهێنانییەوە نییە، کە بینیان بە غەمبارییەوە لە جێگا بڵندەکەیەوە دێتە خوارێ، فەرمانیان پێدا دووبارە

سەربکەوێتەوە. بەم جۆرە شەمعونی پیرۆز تا سەرە مەرگ بەسەر سەری ستوونەکەی خۆیەوە ماو خۆشەویستی و ئافەرینی جیهانیشی پێبڕا"

ئۆلگا بە قووڵی گوێی گرتبوو، بەڵام بەدوا قسەکانی بارتلیف پێکەنینی لێپڕژا.

بارتلیف وتی: "ئەم تینویەتییە زۆرە بۆ ناوبانگ دەرکردن نەك پێکەنین هێن بەڵکو کارت لێدەکات. ئەو مرۆڤەی تینووی ئافەرین لێکردنە بە خەڵکەوە دەنووسێت، وا هەست ئەکات تەواو وابەستەیانە، ناتوانێت بێ ئەوان بژی، شەمعونی پیرۆز لەو سەرەوە، بە تەنیا لەسەر یەك مەتری چوارگۆشە بوو، بەڵام لەگەڵ هەموو ڕەگەزی مرۆڤدا لە ڕازونیازدا بوو، لە خەیاڵی خۆیدا ملیۆنان چاوی پڕ لە تاسەی دەبینی کە لێی ڕاماون و ئەمەیش دڵی خۆش دەکرد. ئەمە نموونەی خۆشویستنی هاوڕەگەزو خۆشویستنی ژیانە. ئۆلگای خۆشەویست، تۆ نازانیت شەمعونی پیرۆزی ستوون نشین تا ئەمڕۆ چ کاریگەرییەکی بەهێزی لەسەر ئێمە داناوە، تا هەنووکە لە ناخی هەمووماندا ئامادەگیەکی نەمرو بەهێزی هەیە"

لە دەرگا دراو پێش خزمەتەکە لە کاتێکدا عەرەبانە دەستیە پڕ لە خواردنەکەی بەرەوپێش ڕادەدا هاتە ژوورێ. سفرەکەی ڕاخست و کەوتە ڕازاندنەوەی سەرمێزەکە. بارتلیف دەستی بۆ پاکەتە جگەرەکە بردو مستێك پارەی کردە گیرفانی پێش خزمەتەکەوە. هەموو دەستیان بە خواردن کردو پێش خزمەتەکەیش لە پشتیانەوە وەستابوو، پەرداخەکانی پڕ لە شەراب دەکردن و خواردنی جۆراو جۆری بۆ دادەنان.

بارتلیف لە بارەی جۆراوجۆریی خواردنەکانەوە ستایشی کرد و سکریتا وتی دواجاری لە یاد نییە کە بەم ئیشتیهایەوە خۆراکی لەم جۆرەی خواردبێت "ڕەنگە بۆ دواجار کە زۆرم لە خواردن چێژ وەرگرتبێت ئەو کاتە بووبێت

هێشتا دایکم مابوو و چێشتی بۆ لێدەنام، بەڵام ئەوسا زۆر بچووك بووم، لە پێنج ساڵیدا هەتیوکەوتم، ئەو دنیایەی فرێدرامە ناوی دنیایەکی سەیرو تامی خۆراکەکەیشی سەیر بوو، تەنیا لە دنیایەکی پڕ لە خۆشەویستیدا لەزەت لە خواردن دەبەیت"

بارتلیف بەدەم هەڵگرتنی پارچەیەك گۆشتی مانگاوە بە چنگاڵەکەی دەستی وتی: "ئەمە زۆر ڕاستە"

"منداڵی تەنیا ئیشتیهای خواردنی نییە، تا ئێستایش کە بیرم دەکەوێتەوە نە دایکم هەیەو نە باب، ئازارم لە دەروون دەگەڕێ، من لەم دنیایەدا زۆرخراپ تێکەوتم، بەڵام بڕوام پێبکەن ئامادەم دەستی ڕاستم ببەخشم و باوکێك بۆ خۆم پەیدا بکەم"

بارتلیف وتی: "تۆ پەیوەندییەکانی خێزان زۆر بە زێدەڕەویی وەردەگریت، هەموو کەس نزیك و ئازیزتانن، قسەکانی مەسیحتان لەبیرنەچێت کاتێك ویستیان بیگەڕێننەوە لای دایك و براکانی، ئەو ئاماژەی بۆ هاوەڵەکانی کردو وتی: "دایکم و براکانم لێرەن"

دکتۆر سکریتا وەڵامی دایەوە "لەگەڵ ئەوەیشدا، کڵێسا بە هیچ جۆرێك مەبەستی نەبوو پەیوەندیی خێزانی لاواز بکات یان لە بری ئەو جۆرێك لە ژیانی سۆشیالیستی ئازاد دابنێت"

"کڵێسا مەسیح نییە، ئەگەر ڕێگایشم پێ بدەن دەڵێم بەلای منەوە سانت پۆڵ[15] نەك تەنیا هاوڕێی مەسیح نەبوو بەڵکو ڕێنماییەکانیشی شێواندبوو، ئەو گۆڕانە کتوپڕە لە شاوولەوە[16] بۆ پۆڵ- ئایا تا ڕادەیەکی زۆر ئەو دەمارگیرە توندڕەوانەمان نەدیوە کە لە شەوو ڕۆژێکدا لە بیروڕایەکەوە دەچنە سەربیروڕایەکی ؟ تکایە کەس پێم نەڵێت ئەنگێزەی دەمارگیری عەشقە! ئەوانە مامۆستای ئاکارن کە لە ژێر لێوەوە دە فەرمانی خۆیان دەردەکەن، بەڵام

مەسیح مامۆستای ئاکار (ئەخلاق) نەبوو. تەنیا ئەو قسانەی بهێننەوە یاد کە لەسەر ڕێز نەگرتنی تەواوی لە شەممەی پیرۆز[17] سەرزەنشتیان کرد "شەممەی پیرۆزیان بۆ مرۆڤ دروست کردووە، نەك مرۆڤ بۆ شەممەی پیرۆز" مەسیح ژنانی خۆشدەویست! ئایا دەتوانیت لە بیری خۆتدا سانت پۆڵ وەك دڵدارێك بەرجەستە بکەیت؟ سانت پۆڵ لەسەر خۆشەویستی ژن ئێمە مەحکووم دەکات، بەڵام مەسیح نا، من کە ژنم خۆش دەوێت، زۆریشیانم خۆش دەوێت، هەروەها لە خۆیشمدا کە ئەوان منیان خۆش دەوێت، هیچ کەموکوڕییەك نابینم"

بارتلیف خۆشیی لە خۆی دەهات و زەردەخەنەی کەوتبووە سەر لێو: "هاوڕێیان، ژیانی من ڕەحەت و ئاسوودە نەبووە، زۆرجاریش ڕووبەڕووی مەرگ بوومەتەوە، بەڵام یەزدان لە یەك لایەنەوە بۆ من بەخشندە بووە: ژنی زۆرم ناسیوەو خۆشیان ویستووم"

شێو تەواو ببوو، پێش خزمەتەکە کەوتبووە پاککردنەوەی مێزەکە کە جارێکی تر لە دەرگا درایەوە. لێدانێکی هێور و شەرمنانە، دەتوت یەکێك چاوەڕێی ڕێگەپێدانە، بارتلیف وتی: "فەرموو وەرە ژووری" دەرگا کرایەوەو کیژۆڵەیەکی تەمەن نزیك بە پێنج ساڵ هاتە ژووری، کیژۆڵەکە کراسێکی قۆڵ سپی فشی لەبەردا بوو. شریتە پان و سپیەکەی کەمەربەندی بە گرێیەکی گەورەی پەروانەیی لە دواوە بەسترابووەوە و هەر لەدوو باڵ دەچوو، چڵێك گوڵ -گوڵە کەوێ-ی بەدەستەوە بوو، کە بینی ژوورەکە پڕە لە خەڵك و هەموو وەستاون و چاویان لەو بڕیوە، بێ دەنگ وەستاو نەیوێرا بەرەوپێش بچێت. بارتلیف هەستاو بە زەردەخەنەوە وتی: "مەترسە فریشتەکەم، وەرە پێشێ"

منداڵەکە وەك زەردەخەنەکەی بارتلیف هانی دابێت، بە پێکەنینەوە بۆلای چوو، بارتلیف گوڵەکەی لێوەرگرت و ناوچەوانی کچۆڵەکەی ماچ کرد.

هەموو ئەوانەی دیمەنەکەیان بینی، بە پێش خزمەتەکەیشەوە، سەریان سوورما. منداڵەکە بەو گرێ پەپوولەییەوە بەڕاستیی لە فریشتەیەکی باڵدار دەچوو، بارتلیفیش کە چڵە گوڵەکەی بە دەستەوە بوو بۆ پێشەوە نووشتا بووەوە، بە یەکێك لەو پەیکەری قەدیسانەی سەردەمی باروك دەچوو کە گۆڕەپانی شارۆچکە دوورەکانیان پێ دەڕازاندەوە.

گەڕایەوە سەر میوانەکانی. "هاوڕێ ئازیزەکانم، چێژم لەم دیدارەتان بردو هیوادارم ئەمشەو ئێوەیش بە قەدەر من خۆشتان لێ گوزەرا بێت، پێم خۆشە تا درەنگانێك لەگەڵتاندا بم، بەڵام خۆتان دەبیبینن کە ناتوانم، ئەم فریشتە خۆشەویستە هاتووە بەدوامدا و ئێستا کەسێك چاوەڕێمە، پێم وتن ژیان زۆری ئازار پێ چەشتووم، بەڵام لە رووی خۆشەویستی ژنانەوە بەختەوەر بووم"

بارتلیف بە دەستێکی گوڵە کەوێکەی نایە بان دڵیو، دەستەکەی تری خستبووە سەرشانی کیژۆڵەکەو سڵاوی بۆ هەمووان دەکرد، لەبەر چاوی ئۆلگادا، خۆ نواندنێکی پێکەنین هێنەر بوو، بەوەیش دڵخۆش بوو بارتلیف دەڕوات و خۆی و یاکوب بە تەنیا دەمێننەوە.

بارتلیف گەڕایەوەو دەستی منداڵەکەی گرت و بەرەو لای دەرگاکەی برد، بەڵام پێش ئەوەی لە ژوورەکە بڕواتە دەرێ دەستی بۆ پاکەتی جگەرەکە بردو گیرفانی پڕکرد لە دراوە زیوییەکە.

**-11-**

هەر ئەوەندەی پێش خزمەتەکە دەفرو بوتڵە خاڵییەکانی خستە ناو عەرەبانە دەستیەکەوە و لە ژوورەکە چووە دەرێ، ئۆلگا وتی:

"بەهەرحاڵ، ئەو کیژۆڵەیە کێ بوو؟"

سکریتا وەڵامی دایەوە: "پێشتر هەرگیز نەمدیوە"

یاکوب وتی: "بەڕاستیی لە فریشتەیەکی چکۆلانە دەچوو"

ئۆلگا پێکەنی: "فریشتەیەکی دەلاڵ؟"

"بەڵێ، دەلاڵ، فریشتەی شەخسیی ئەو ڕێك دەبێت وابێت"

سکریتا وتی: "فریشتە بێت یان نا من ئەوە نازانم، بەلاّم پێم سەیرە هەموو خەڵکی ئەم ناوچەیە دەناسم و پێشتر هەرگیز ئەوم نەدیوە"

یاکوب زەردەیەك گرتی: "کەواتە تەنیا لێکدانەوەیەك هەیەو هیچی تر، ئەو کچۆڵەیە هی ئەم دنیایە نییە"

ئۆلگا وتی: "کەواتە چ فریشتە بێت و چ کچی کارەکەرەکانی پاککردنەوە، من گرەو لەسەر شتێك دەکەم، ئەو دڵدارەی چاوەڕێی ئەم بێت هەر نییە، ئەو کابرایەکی خۆ پەسەندەو ناتوانێت دەست لە هاش و هووش هەڵبگرێت"

یاکوب وتی: "من خۆشم دەوێت"

ئۆلگا وەلاّمێکی تووڕەی دایەوە: "بەهەر حاڵ، ئێستایش ئەیلێمەوە کە ئەو خۆپەسەندترین مرۆڤی سەر ئەم زەمینەیە. بەلامەوە سەیر نییە ئەگەر سەعاتێك پێش ئەم دیدارەمان مشتێك پارەی دابێتە کچۆڵەکەو داوای لێکردبێت لە فلان وەخت و سەعاتدا بە چڵی گوڵێکەوە خۆی بە ژووڕێدا بکات، کەسە ئایینیەکان بۆ نمایش کردنی شانۆی موجیزە ئاسا توانایەکی زۆریان هەیە"

دکتۆر سکریتا وتی: "هیوادارم هەق بە ئێوە بێت، بڕوانن، ئاغای بارتلیف گەلێك نەخۆشەو هەموو شەوێکی عەشق و ڕابواردنی بەرەو مەترسی گەورەی دەبات"

"بڕوانە. کەواتە من لەسەر هەقم، تەواوی ئەو ئاماژانەی دەربارەی ژن دای خۆ هەڵکێشان بوو"

سکریتا وتی: "خانمی ئازیز، من پزیشك و هاوڕێی ئەوم، بەڵام هێشتا لەم بابەتە دڵنیا نیم، هیچ نازانم"

یاکوب پرسی: "بەڕاستیی نەخۆشییەکەی ترسناکە؟"

"ئەی بۆ وەك بزانیت لەبەرچی لە ساڵ زیاترە لەم ئاوەکانزاییانەدا ماوەتەوە؟ خێزانەکەی کە بارتلیف زۆری خۆش دەوێت تەنها جارجارەیەك دێتە ئێرە"

یاکوب وتی: "ئێرە بە بێ ئەو غەم ئەنگێزە"

لە ڕاستیشدا هەرسێکیان لە پڕاو لەو ئاپارتمانە ساردەدا هەستیان بە بێ کەسی کردو حەزیان نەدەکرد لەوە زیاتر لەوێدا بمێننەوە.

سکریتا لەسەر کورسییەکەی هەستا: "خاتوو ئۆلگا دەگەیەنینە ماڵەوە و دوایی خۆمان کەمێك پیاسە دەکەین. هێشتا زۆر شت ماوە دەبێت لە بارەیانەوە قسە بکەین"

ئۆلگا بەرهەڵستی کرد "هێشتا من خەوم نایەت!"

سکریتا بە گرژییەکەوە وتی: "کات کەمێك تێپەڕیوە، من وەك پزیشکتان فەرمانن پێدەکەم بڕۆنە ناو جێگاوە"

هەموو ساختمانەکەی ریچموندیان بەجێهێشت و بەرەو ئەو لای پارکەکە چوون. ئۆلگا لە ڕێگادا فرسەتی هێناو بە گوێی یاکوبدا چرپاندی: "دەمویست ئەمشەو لەگەڵ تۆدا بەتەنیا بم.."

یاکوب هەر شانی هەڵتەکاند، چونکە سکریتا ویستی‌خۆی تێکەڵ بە دەسەڵات کردبوو. کچەکەیان گەیاندە تەلاری مارکس و یاکوب لەبەردەم هاوڕێکەیدا، تەنانەت بەپێی عادەتیش، کچەی ماچ نەکرد، نائومێدیی لە دەموچاوی ئۆلگادا بینیو، بەداخیش بوو لەوەی کە ئازاری داوە.

سکریتا کە لەگەڵ هاوڕێکەیدا بە تەنیا مانەوە پرسی:

"ئێستا ئەڵێی چی؟ گوێت لێبوو بە ئاشکرا وتم من پێویستیم بە باوکە، بەردییش بوایە بۆم دەهاتە گریان، وەلێ ئەو هەرچەنەی لەسەر سان پوڵ دەدا، بەڕاست تێگەیشتنی ئەو مەسەلەیە ئەوەندە بۆ ئەو سەختە؟ دوو ساڵە لە مێشکی دەئاخنم من هەتیوم، تایبەتمەندییەکانی گوزەرنامەی ئەمریکاییم بۆ باسکردووە، دەربارەی زۆر لایەنی جیاوازیی منداڵ هەڵگرتنەوە هەزاران قسەم بۆ کردووە، من هەر لە دەمێکەوە چاوەڕێی ئەوە بووم لەوە بگات من بکات بە کوڕی خۆی"

یاکوب وتی: "ئەو زۆر حەزی بە خۆیەتی"

سکریتا بە ڕەزامەندییەوە وتی: "بەڵێ، هەروایە"

یاکوب بە توندی وتی: "ئەگەر بەڕاستی نەخۆش بێت ئیدی ناتوانیت سەرزەنشتی بکەیت" لەسەر قسەکانی ڕۆشت "هەڵبەت ئەگەر وەك تۆ وتت بەو ئەندازەیە نەخۆشییەکەی ترسناك بێت"

سکریتا وتی: "لەوەیش خراپترە، شەش مانگ لەمەوبەر تووشی خوێن بەربوونێکی تازەو زۆر سەخت بوو، لەوەودوا ئیتر نەیوێرا ئێرە بەجێ بهێڵێتو، لێرە وەك زیندانییەك ژیان بەسەر ئەبات، ژیانی بە موویەکەوە بەندەو خۆیشی ئەمە دەزانێت"

یاکوب بە دەم بیرکردنەوەوە وتی: "کەواتە ئەبوو تۆ زۆر زوو لەوە تێبگەیشتیتایە کە ڕێگای ناڕاستەوخۆ مانایەکی نییە ، چونکە ئامارژەکانت لەسەر ئەو شتانەی پەیوەندییان بە خۆیەوە هەیە ناگاتە ئەنجام. دەبوو ئەوەی دەتویست ڕێك و ڕاست و بێ پێچ و پەنا پێت بوتایە. بێگومانم ڕازی دەبوو، چونکە پێی خۆشە خەڵکیی بەختەوەر بکات، ئەم کارە لەگەڵ ئەو وێنایەدا گونجاوە بۆ خۆی هەیەتی، ئەو دەیەوێت خەڵکیی شادمان بکات"

سکریتا لە ناکاوێکدا وەستاو بە سەرسوورمانەوە وتی: "تۆ بلیمەتیت! مەسەلەکە بە ئەندازەی هێلکەکەی کریستوف کۆلمبس سادەیەو، تۆ بە تەواوی ڕاست ئەکەیت، تەنیا لەبەر ئەوەی داوەریەکی نادروستم لە بارەی ئەوەوە کرد دوو ساڵ لە تەمەنم بە گەمژەیی تێپەڕاند. بە منگەمنگ کردن و پێچ و پەنا دوو ساڵم بە هەدەر چوو! ئەمەیش نکوولی تۆی تیایە، چونکە دەبوو زۆر پێش ئێستا ڕێنماییت بکردمایە"

"بۆ لێت نەپرسیم!"

"دوو ساڵ زیاترە تۆ نەهاتوویتەتە ئێرە"

دوو هاوڕێ، چوست و چالاك لە پارکە تاریکەکەدا پیاسەیان دەکردو هەوای پاکی پاییزیان هەڵدەمژی.

سکریتا وتی "من ئەوم کردووەتە باوکی خۆم، کەواتە هەقە ئەویش من بکات بە کوڕی خۆی"

یاکوب قایل بوو.

سکریتا دوای بێدەنگییەکی زۆر کەوتەوە قسە "دەزانیت من گرفتاری چیم؟ کەسانێکی گەلۆر لە دەوروبەرمدان، ئایا لێرە کەسێك دەست دەکەوێت بتوانم داوای ڕێنمایی لێبکەم؟ کەسانی هوشیار لە تەریکیەکی تەواودا لە دایك دەبن، مرۆڤایەتی بەشێوەیەکی سەرسووڕهێنەر مرۆڤی گەمژە دەخاتەوە، مرۆڤ چەند دەبەنگ بێت زیاتر حەزی لە نەوە خستنەوەیە، کەسانی باش بەزۆری منداڵێك دروست دەکەن و باشتریشیان -وەك خۆت- دەگەنە ئەو ئەنجامەی کە ئەسڵەن منداڵیان نەبێت. ئەمە کارەساتە، من هەمیشە دنیا بینییەك لە خۆما پێدەگەیەنم تیایدا مرۆڤ نەك لەناو بێگانەدا، بەڵکو لە ناو برای خۆیدا لەدایك بێت"

یـاکوب بـێ ئـەوەی لـە ئـەنجام گیرییـەکانی سـکریتا تایبەتمەندییـەك بدۆزێتەوە گوێی بۆ قسەکانی تەکاندبوو، سکریتا بەردەوام بوو.

"مەبەسـتم تـەنیا قسـەی ڕووت نییـە، مـن سیاسـەتمەدارنیم، پزیشـکم و وشەی برا بۆ من مانای ڕاستیی هەیە! براکان کەسانێکن بە لایەنی کەمەوە باوکێك یان دایکێکی هاوبەشیان هەیە. هەموو منداڵەکانی سلێمان هەرچەندە لەسەد دایکی جیابوون، بەلاّم برای یەکدی بوون، ڕەنگە کارێکی ناوازە بێت! تۆ وا بیرناکەیتەوە؟"

یاکوب هەوای فێنکی شەوی هەڵمژی و نەیزانی چ وەلاّمێك بداتەوە.

سـکریتا بـەردەوام بـوو: "هەڵبەتـە ناچـارکردنی خـەڵك لەسـەر ئـەوەی کۆنترۆڵی ژیانی سێکسی خۆیان بکەن لەبەر ئەو سەرنجانەی کە پەیوەندییان بە منداڵ بوونەوە هەیە کارێکی دژوارە، بەلاّم هەرچۆنێك بێت ئەمـە ئەسڵی مەسـەلەکە نییـە، دەبێـت سـەدەی بیسـتەم بـۆ چارەسـەرکردنی مەسـەلەی زاووزێیەکی عاقلاّنەی ڕەگەزی مرۆڤ ڕێگای تازە پەیدا بکـات. نـاتوانین بـۆ هـەتا هەتایـە لەسـەر بەهەڵـە وەرگرتنـی خۆشەویسـتی لەگـەڵ منـداڵ بوونـدا بەردەوام بین"

یاکوب بەم بیروباوەڕە قایل بوو.

سکریتا وتـی: "تۆ تـەنیا پـەیوەندیت بـەوەوە هەیـە کـە خۆشەویسـتی لـە وەچـە خستنەوە جیابکەیتەوە، بەلاّم من زیاتر مەبەسـتم ڕزگـارکردنی وەچـە خستنەوەیە لـە خۆشەویستـی، دەمـەوێت تـۆ لـە نەخشـەکەم ئاگـاداربیت، مـن پرۆژەی لوولەی تۆوم دروست کردووەو تۆوەکەیش هی خۆمە"

یاکوب گوێ قولاّغ بوو.

"تۆ ئەڵێی چی؟"

"بیرۆکەیەکی ناوازەیە".

"وا نییه؟ به سوود وەرگرتن لەم شێوازە ژمارەیەکی زۆری ژنانی نەزۆکم ڕزگارکردووە. ئەوەت لە بیر نەچێت گەلێك لەو ژنانە بەهۆی نەزۆکی مێردەکانیانەوەیە کە منداڵیان نابێت. لە سەرانسەری کۆماردا مشتەری گەلێکی زۆرم هەن، بۆ لەوەیش لە چوار ساڵی ڕابوردوودا بەرپرسی تاقیکردنەوە ئاساییەکانی نەخۆشیی ژنانە بووم لەم ناوچەیەدا، هیچ کارێك لەوە ئاسانتر نییە سرنجێك هەڵبگریت، پڕی بکەیت لە مادەی ژیان بەخش و لە ژنانی بدەیت"

"تا ئێستا خاوەنی چەند منداڵیت؟"

"چەندین ساڵە ئەم کارە دەکەم، بەڵام ژمارەی تەواویان تەنیا بە تەخمین دەزانم، هەندێك جار لە باوکایەتی خۆم بەدگومانم، چونکە نەخۆشەکانم لەگەڵ مێردیاندا دەخەون بێوەفاییم لەگەڵدا دەکەن. بێجگە لەمە، ئەوان دەگەڕێنەوە شارۆچکەی خۆیان و زۆرجار تەنانەت هەواڵی ئەوەم پێ ناگەیەنن کە چارەکردنەکانم سەرکەوتوون یان نا، دەسەڵاتم بەسەر نەخۆشەکانی ئەم هەرێمەدا زیاترە"

سکریتا بێدەنگ بوو، یاکوبیش خۆی دایە دەست خەیاڵی ناسکی شاعیرانە. نەخشەکەی سکریتا لەولایەنەوە کە تایبەتمەندیەتی دیارو بۆ چارەسەری خەیاڵیانەی هاوڕێ کۆنەکەیەتی، کاری تێکردو هێنایە جۆش و وتی: "ڕەنگە ئەم هەموو منداڵە لەم هەموو دایکە شتێکی زۆر سەیر بێت..."

سکریتا کەوتەوە قسە: "هەموویشیان برای یەکترن"

هەر دەڕۆیشتن و هەوای خۆشیان هەڵدەمژی، لە دواییدا سکریتا وتی:

"دەزانیت، زۆرجار بەخۆم دەڵێم لەگەڵ ئەوەیشدا لەم ئەستێرە کۆنەماندا زۆرشت هەیە حەزی پێناکەین، بەڵام ناتوانین لەبەرپرسیارییەتیمان هەڵبێین. من لەوە بەتەنگ دێم ناتوانم بە ئازادیی بەسەر ئەم زەویەدا بگەڕێم. وەلێ

هەرگیز شوێنی لەدایك بوونم بۆ هەمیشە جێ ناهێڵم، هەرگیزیش خراپەی ناڵێم، دەبێت پێشان خراپەی خۆم بڵێم، هەریەکێك لە ئێمە بۆ چاککردنی وڵاتەکەمان چیمان کردووە؟ بۆ ئەوەی بێ ئاژاوەو ئاوەدان بێت چیمان کردووە؟ بۆ ئەوەی بیکەینە وڵاتێك کە بەڕاستیی هەستی دڵنیایی تیا بکەین چیمان کردووە؟"

دەنگی سکریتا نەرم و گونجاوتر بوو "نیشتمان.. مرۆڤ تەنیا لەنێو هاوڕەگەزەکانی خۆیدا هەست بە ئاسوودەیی و ئاسایش دەکات، چونکە پێت وتم دەتەوێت لێرە بڕۆیت، گەیشتمە ئەوئەنجامەی دەبێت بەشداریی پلانەکەم بکەیت. لوولەیەکی تاقیکردنەوەم بۆ کەنار خستوویت. تۆ لە دەرەوەی وڵات لە شوێنێکی زۆر دوور دەبیت، بەڵام لەم حاڵەدا مناڵی تۆ لەم وڵاتەدا چاو دەکەنەوەو، دەیشبینیت کە لە ماوەی دە، بیست ساڵی تردا ئێرە دەبێتە چ وڵاتێکی جوان و خۆش"

مانگ بە ناوەڕاستی ئاسمانەوە بوو (تا دوا شەوی چیرۆکەکەمان هەر بەپێوە دەبێت، تا بەڕاستیی بتوانین ناوی چیرۆکی مانگی لێ بنێین" دکتۆر سکریتایش یاکوبی تا تەلاری ریچموند ڕەوانە کرد. وتی: "سبەی مەڕۆ"

یاکوب وەڵامی دایەوە: "دەبێت بڕۆم، چاوەڕێمن" بەڵام دەیزانی کە ڕەنگە کاری تێ بکرێت.

سکریتا وتی: "قسەی هیچ دەکەیت، شادمانم ئەگەر پرۆژەکەمت بەدڵ بووبێت، سبەینێ لەبارەی تەواوی وردەکارییەکانیەوە قسە دەکەین"

* * *

1-Yakup.

2-Olga.

3-Kveta.

4-Hegel.

5-Franta.

6-Bobis.

7-Jocasta دایکی ئۆدیبە کە قەدەر لەگەڵ کوڕەکەیدا کردنیە ژن و مێرد و کاتێك بەو ڕاستییەی زانی خۆی کوشت. و. ف.

8-بەرازۆکەی هیندی گیانداریکی بچووکی گیاخۆرە، تووکی وردو لمۆزی پانو پێی کورتە، مێچکەیان دوو گوانووی هەیەو هەرجارە شەش بێچوو دەزێت، لە ئەمریکاوە بۆ شوێنی تریان گواستۆتەوە، لە تاقیگاکاندا بۆ مەبەستی فیزیۆلۆژیو باکتریۆلۆژی تاقیکراونەتەوە.

(فەرهەنگی عەمید)

9-King Herod

مەبەست هیرۆدی یەکەمی شای جولەکەی فەڵەستین و لە خاچدەری حەزرەتی مەسیحە، ڕۆمەکان دەیانپاراست و "ڕەشە کوژی منداڵان" لە ئەستۆی ئەودایە. و. ف

10-Saint Makerioes.

11-Tabis.

12-Saint Simeon.

13-Saint Anne of paris.

14-Gaul.

15-Saint Paul.

16-Saul.

17-Sabbath.

**-1-**

بەیانی، ئەوکاتەی کە خانمی کلیما لەماڵ بەدەر دەکەوت، هێشتا مێردەکەی لەناو جێگادا بوو.

لێی پرسی: "کاتی هەستانت نەهاتووە؟"

کلیما باوێشکی داو وەرچەرخا، وەڵامی دایەوە "بۆ دەبێت پەلە بکەم؟ ئەو دەبەنگانە ئەوە ناهێنن"

کلیما بە هاوسەرەکەی ڕاگەیاندبوو، لەماوەی چەند ڕۆژی پێشووی سازدانی کۆنفرانسە بێزارکەرەکەدا ڕوویان لێ ناوەو بەڵێنیان لێوەرگرتووە بەشێکی کاتی ئازادی خۆی بۆ تیپە مۆسیقیە ئارەزوومەندەکان تەرخان بکات. بڕیارە شەوی پێنج شەممە لەگەڵ دکتۆرێکی عاشقی جازو ئارەزوومەندێکی تردا لە ناوچەی ئاوەکانزاییەکاندا ئاهەنگێك ساز بکات. کلیما جوێنی دەداو دەکوڵا، وەلێ خانمی کلیما تەماشایەکی کردو زۆر چاك لەوە گەیشت کە تووڕەییەکەی ساختەیەو هەموو ئەو کۆنسێرتەی لێی دەدوێت لە فێڵێك تێنا پەڕێت بۆ شاردنەوەی نەخشەیەکی عاشقانەی خۆی. ڕووی کلیما بۆ ئەو کتێبێکی کراوە بوو، هەرگیز نەیدەتوانی شتێك بشارێتەوە، لەبەر ئەوە، کاتێك کەوتە جوێندان و خۆی خستە سەر لایەکەی تری، ژنە یەکسەر لەوە گەیشت مێردەکەی ئەمەی لەبەر ئەوە نەکردووە چونکە خەواڵوو بووە، بەڵکو بۆ ئەوەیە ڕووی خۆی بشارێتەوەو نەهێڵێت ئەو بەوردی لە دەموچاوی بڕوانێت.

ژنە بەرەو لای کارەکەی لە ماڵ چووە دەرێ، دوای ئەوەی نەخۆشیی وای تەنگ پێ هەڵچنیبوو نەیدەتوانی بەرانبەر بە ڕووناکیی شانۆ خۆی بگرێت، کلیما وەك کاری سکرتێری لە شانۆدا دایمەزراندو، کارێکی خراپیش نەبوو،

بەردەوام لەگەڵ خەڵکانێکی دیاردا هەڵسوکەوتی دەکردو، لە ئەنجامدانی بەرنامەی کارەکانیشیدا ئازادییەکی فرەی پێدرابوو.

گەیشتە نووسینگەکەی، لە پشت مێزی نووسینەوە دانیشت تا چەند نامەیەکی ئیداری بنووسێت، بەڵام هەستی کرد بیری پەرتە.

هیچ شتێك ناتوانێت وەك ئیرەیی پێبردن (حەسادەت) تەواوی وجودی مرۆڤ کۆنترۆڵ بکات، بەڕاستیی مردنی پێش ساڵێکی دایکی بۆ کامیلا کارەساتێکی زۆر لە هەوەس بازییەکانی ترومپیت ژەنەکە سەختتر بوو، ئەگەرچی بێ ئەندازە دایکی خۆشدەویست، بەڵام ئازاری لەو کەمتر بوو. خەمی لە دەستدانی دایکی گەلێك ڕەهەندی هەبوو: لەو ئازارەدا، تاسە، خەم، لۆمەو تەنانەت زەردەخەنەیەکی هێوریش هەبوو، ئەو ناخۆشیە ئاسوودەییەکی تێگەڕاند: بیری کامیلا لە تابووتی دایکییەوە چووە سەر منداڵیی خۆی، دوورتریش بۆ سەردەمی منداڵیی دایکی، بیری بەرەو دەیان کردەی تر چوو، ئایندەیەکی تەواو کراوەو مێردێکی وەفادار کە دڵخۆشیی دەداتەوەو لە پاڵیدایە (بەڵێ، لەو ڕۆژە ئاوارتەییانەدا کلیما مایەی دڵدانەوەی بوو)

بە پێچەوانەوە، خەمێك کە لە ئیرەییەوە هاتبێت پەرە ناسێنێت، بەڵکو وەك درێل لە خاڵێکدا سوور دەخوات، مردنی دایکی دەرگایەکی بەرەو ئایندە کردبووەوە (ئایندەیەکی جیاواز، بێ دایك، بەڵام لە ڕابوردو کاریگەرتر) ئەو ناخۆشییەی لە بێ وەفایی مێردەکەیەوە سەرچاوەی گرتووە هیچ دەرگایەك ناکاتەوە، هەموو شتێك تاقە وێنایەکی رووتی هەیە. (هەمیشە ئامادەیە) لەشە خیانەت کارەکەی، لەسەر کۆنەکردنێکی ڕووتدا (هەمیشە ئامادە) کۆببووەوە، کامیلا دوای مەرگی دایکی دەیتوانی گوێ لە مۆسیقا بگرێت و، تەنانەت بخوێنێتەوە. بەڵام کە ئیرەیی هێرشی دێنا نەیدەتوانی هیچ کارێك ئەنجام بدات.

کە کلیما ئاماژەی بۆ سەفەرەکەی خۆی کرد کامیلا وای بە بیردا هات بڕواتە ئاوەکانزاییەکان و ڕاست و دروستی کۆنسێرتە گومانلێکراوەکە بزانێت، بەڵام ئەم بیرەی خستە لاوە، چونکە دەیزانی کلیما کە هەست بە ئیرەیی بکات زۆر بەتەنگ دێت، وەلێ ئیرەیی وەك ماتۆڕی کێبڕکێ لە دەروونیا دەسووڕاو نەیدەتوانی خۆی لەبەر هەڵنەگرتنی تەلەفۆنەکە بگرێت، خۆی وا خەڵەتاند کە بێ هیچ مەبەستێکی تایبەتی، تەنیا لەبەر بێ حەوسەڵەیی و بیری پەرتی لە نووسینی نامەکاندا تەلەفون بۆ وێسگەی ئاسن دەکات.

زانی شەمەندەفەر سەعات یانزەی بەیانی لە وێستگە بەڕێ دەکەوێت، خۆی وا هاتە بەرچاو لە پیادەڕەوی شارۆچکەیەکی نەناسدا بەزەحمەت هەنگاو دەنێت، بە دوای پۆستەرێکدا وێڵە ناوی کلیمای لەسەر نووسراوە، لە نووسینگەی ئاوەکانزاییەکان پرسیاردەکات ئایا ئاگایان لەو کۆنسێرتە هەیە کە بڕیارە مێردەکەی لەوێ سازی بکات. تێدەگات کۆنسێرتی لەو بابەتە لە بەرنامەدا نییە، ئەوسا لە پێ کەوتوو، بە هیلاکی و خیانەت بینینەوە دەگەڕێتەوە ماڵێ، پاشان ئەوەی هێنایە بەرچاوی کە سەر لەبەیانیی ئەو ڕۆژە، بۆ ئاگاداربوون لە وردەکاریی بەرنامەکە کلیما دەخاتە ژێر فشارەوەو، ئەو لە بارەی کۆنسێرتەکەوە قسەی بۆ دەکات، ئەو تەماشای دەموچاوی دەکات، گوێ لە چیرۆکە ساختەکانی دەگرێت و درۆ ژەهراوییەکانی بە لەزەتێکی تاڵەوە دەنۆشێت.

بەهەرحاڵ، زوو کەوتە سەر کۆنەی خۆی: کاری وا بۆ ئەو ناشێت، نابێت ڕۆژ و هەفتە لە چاودێری و خەیاڵی ئیرەیی پێ بردندا بەخت بکات، دەترسا ئەوی لە دەست بچێت و، سەرئەنجامیش هەر ئەو ترسە مێردەکەی لێ دوور دەخاتەوە.

بەڵام دەنگێکی تر بە سادەییەکی ئازاراوییەوە وەڵامی دایەوە: تێکرا، مەسەلەکە شوێن کەوتن و چاودێری ئەو نییە، کلیما وتی کۆنسێرتێك سازدەکات و، ئەویش بە تەواویی بڕوای پێکرد، لەبەر ئەوەیش بە ڕاستیی ئیرەییەکەی واز لێ هێناوە، بێ ئەوەی کەمە گومانێکی هەبێت بڕوای بە قسەکانی کردووە! مەگەر نەیوتبوو چوونی ئەوێی پێ ناخۆشەو، شەوو ڕۆژێك مانەوە لەوێ بێزارکەرە؟ هەر لەبەر ئەوە دەیویست دوای بکەوێت تا لەوێ سەرسامییەکی خۆش و غافڵگیرانەی بۆ دروست بێت. لە کۆتایی کۆنسێرتەکەدا کلیما بە دڵێکی ڕەنجاوەوە بەرانبەر بە خەڵکەکە دەوەستێ و سڵاودەکات، بیر لەو سەفەرە دوورودرێژو ناخۆشە دەکاتەوە لە گەڕانەوەی ماڵەوەیدا تووشی دێت و، لە ناکاودا ئەم لە خوار تەختەی شانۆکەوە دەردەکەوێت، کلیمایش بەسەرسامییەکی دڵخۆشکەرەوە دەیبینێت و پاشان پێکەوە دەدەنە قاقای پێکەنین.

چووە ژووری سەرۆك و ئەو نامانەی دایە کە بەگران نووسیبونی، لە شانۆدا خۆشەویست بوو، ئەو ژنی مۆسیقارێکی ناودار و خۆیشی میهرەبان و خاکی بوو، ئەو خەمانەی کە زۆرجار بە ڕوویەوە دەردەکەوتن، هەموو بەشدارییان تیا دەکرد، سەرۆکیش زۆر هەوڵی ئەوەی بوو لەگەڵیدا میهرەبان بێت، بۆیە زوو داواکاری مۆڵەت وەرگرتنەکەی پەسەندکرد، کامیلا بەڵێنیدا دوانیوەڕۆی هەینی بگەڕێتەوەو ئەوەندە لە نووسینگەکەدا بمێنێتەوە تا هەمووکارەکانی تەواو دەکات.

-2-

سەعات دە بوو ئۆلگا دەستی بە بەرنامەی ئاسایی ڕۆژانەی خۆی کرد، متیلێکی سپی گەورەو کلیلی لە ڕۆزینا وەرگرت. پاشان چووە کابینەکەی خۆیەوە، جلەکانی داکەندو هەڵیواسین، متیلەکەی وەك چارشێوێك لە خۆیەوە پێچا، دەرگای کابینەکەی داخست، کلیلەکەی دایەوە بە ڕۆزیناو چووە ساڵۆنەکەی پاڵی کە حەوزی تیابوو، متیلەکەی دایە سەر پەرژینەکەدا و بە پەیژە فلزیەکەدا چووە خوارێ بۆ لای ئەو ژنانەی لە حەوزەکەدا مەلەیان دەکرد، حەوزەکە گەورە نەبوو، بەلأم ئۆلگا دەیزانی، مەلە بۆ تەندروستی ئەو کەڵکی زۆرە، بۆیە چووە ئاوەکەوەو هەوڵیدا سووکە مەلەیەك بکات، ئەمە شەپۆلێکی دروستکردو دەمی ژنێکی قسەکەری پڕ کرد لە ئاو، ژنەکە بە تووڕەییەوە بەسەر ئۆلگایدا قیژاند "چیتە؟ ئەمە حەوزی مەلەکردن نییە"

ژنان بەدەوری حەوزەکەدا وەك بۆقی زل زل دانیشتبوون، ئۆلگا لێیان دەترسا، هەموویان لەو بەتەمەنتر، زلتر و قەڵەوتر بوون، بە زەبوونییەوە لە نێوانیاندا دانیشت، متی کردو ناوچاوی بەیەکدادا.

لە ناکاوێکدا گەنجێکی کورتە بالأی لەبەردەرگای هۆڵەکەدا بینی، پانتۆڵێکی جینزی شین و چاکەتێکی کۆنی لەبەردا و لە پاڵ دەرگاکەدا وەستابوو.

هاواری لێهەستا: "ئەو کوڕە لێرە چی دەکات؟"

هەموو ژنەکان بەرەو ئەو شوێنەی ئۆلگا ئاماژەی بۆ کردبوو ڕوویان وەرگێڕاو کەوتنە پێکەنین و تریقانەوە. ڕۆزینا هات و بە دەنگی بەرز وتی: "سینەماییەکان هاتوون، بۆ فیلمە هەواڵیەکان وێنەتان دەگرن"

ژنان دیسان کەوتنەوە تریق و هوڕ.

ئۆلگا بە بێزارییەوە وتی: "ئەمە چ بێ ماناییەکە!"

ڕۆزینا وتی: "مۆڵەتی ڕەسمیان پێیە"

ئولگا بە ڕقەوە وتی: "گرنگ نییە، کەس مۆڵەتی لە من وەرنەگرتووە"

کوڕە گەنجەکە کە چاکەتی کۆنی لەبەردا و ئامێرێکی ڕووناک پێوی بە ملیدا هەڵواسیبوو لە حەوزەکە نزیک بووەوە، بە بزەیەکەوە کە بەلای ئۆلگاوە سووکایەتی پێکردن بوو لێی ڕوانی.

"خانمەکەم، ملیۆنەها کەس کە تۆ بەسەر پەردەی سینەماوە دەبینن ئاگایان لە خۆ نامێنێت"

ژنان بە قاقای پێکەنینێکی دی وەڵامیان دایەوە، ئۆلگا مەمکی بە هەردوو دەستی شاردەوە (کارێکی گران نەبوو، چونکە مەمکەکانی، وەك دەزانین، لە دوو قۆخ دەچوون)

دوو پیاو جینز لەبەری تریش هاتن، باڵابەرزەکەیان وتی: "خانمەکان، تکایە با ڕەفتارتان تەواو ئاسایی بێت، وەك ئێمە هەر لێرە نەبین"

ئۆلگا متیلەکەی لەسەر پەرژینەکە هەڵگرت، بەپەلە لە خۆیەوە پێچاو چووە کەنار حەوزەکەوە کە کاشی کرابوو، متیلەکە بە تەواوی تەڕببوو.

کوڕە لاوە چاکەت لەبەرەکە بە سەریدا هاواری کرد:

"ئاه، تۆ بۆ کام دۆزەخ دەچیت؟"

ڕۆزینا بانگی ئۆلگای کرد "بەگوێرەی بەرنامە دەبێت پانزە دەقیقەی تر لە حەوزەکەدا بیت!"

لە دوایەوە دایانە پێکەنین "تەریقیە!"

ڕۆزینا وتی: "دەترسێت یەکێك جوانی و بێ خەوشیەکەی لێ بدزێت"

دەنگێك لە حەوزەکەوە هات "شازادە خانمە!"

پیاوە باڵا بەرزەکە لەسەرخۆ وتی: "ئەوەی نایەوێت دەر بکەوێت دەتوانێت بڕوات"

ژنێکی قەڵەو بە دەنگێکی ناسکەوە وتی: "هیچمان نییە شەرممان پێی بێت، هەموومان فریشتەی دەریاین!"
ڕووی ئاوەکە لە پێکەنیندا لەرزی.
لەو کاتەدا کە ئۆلگا هەنگاوی فراوانی بەرەو کابینەکەی خۆی هەڵدێنا، ڕۆزینا ڕەخنەی گرت "هەقی نەبوو بڕوات، دەبوایە چارەکێکی تر بمایەتەوە"

—3—

هیچ کەس ناتوانێت لەسەر بەد ئەتواری سەرزەنشتی ڕۆزینا بکات، بەلام ئەی بۆ وا تووڕە بوو کاتێك ئۆلگا نەیویست لەبەرکامێرادا دەربکەوێت؟ بۆ لەگەڵ ئەو ژنە بە مێردو پیرو قەڵەوانەی لەگەڵ هاتنی پیاوەکاندا بە تریق و هوڕ پێشوازییان لێکردن هەستی هاودەردی و دەربەستی کرد؟ ئەی ئەو ژنانە بۆ وا شادو دڵخۆش بوون؟ بێگومان بۆ ئەوە نەبوو پیاوەکان بخەنە ژێر کاریگەریی جوانی خۆیانەوە و فریویان بدەن، نا، ئەوان جوان نەبوون و زۆریان ڕق لەو کچە لاوانە بوو کە سەرنجیان ڕادەکێشا، بۆیە پێیان خۆشبوو لەشیان، کە لەباری سێکسییەوە کەڵکیان لێ بڕابوو دەربخەن، تەنیا وەك سووکایەتی پێکردنێکی گاڵتەجاڕانە بە سروشتی ژنی ڕووت، حەزیان دەکرد لە شکۆمەندی جوانیی ژن کەم بکەنەوە، چونکە دەیانزانی لە دوا لێکدانەوەدا کەم تا زۆر لەشەکان وەك یەکتر وان، لەشی ناشیرین ئەم مەبەستە بەگوێی پیاودا دەچرپێنێت تا تۆڵەی خۆی لە جوانی بکاتەوە: بڕوانە، حەقیقەتی لەشی ژن، کە لای تۆ زۆر سەرسووڕمێنە، ئەمەیە کە دەیبینیت! ئەم مەمکە گەورەو شل و شاوە هەمان ئەو مەمکەیە کە وەك شێت عاشقی بوویت.

ئەو بێ ئابڕووییە پڕ لە شادمانییەی ژنە بە شووەکانی ناو حەوزەکە، ئاهەنگی سەرکەوتنی مەرگ و تیاچوونی گەنجی بوو، کە بە هۆی ئامادە

بوونی قوربانیەکەوە، کە کچە جوانەکە بوو، سەرکەوتنەکە زیاتر کەوتەوە، کە ئۆلگا خـۆی لـە متیلەکـەوە پێچـا، ژنـان وایـان لێکدایـەوە ئـەوکارە بەرهەڵستیکردنی ئاهەنگە پۆخڵەکەیانەو هەر بۆیە تووڕەبوون.

ئەی ڕۆزینا بۆ؟ ئەو نە قەڵەو بوو نە پیر، لەڕاستیا لە ئۆلگایش جوانتر بوو، ئەی بۆ هاوهەستی ئۆلگا نەبوو؟

ئەگەر ڕۆزینا، بڕیاری ئەوەی دابوو خۆی لە شەڕی منداڵەکە ڕزگار بکات، ئەگـەر لـەوە دڵنیـابوو شادوخۆشـبەختانە لەگـەڵ کلیمـادا بـژی، بێگومـان کاردانەوەیەکی زۆر پێچەوانەی دەکرد، کە ژن بزانێت خۆشەویستیی پیاو ژن لـە مێگەلایـەتی دەردێنێـت، بـەم پێوانەیـە دەبـوو ڕۆزینـا تـامی خۆشـی بـێ هاوتایی خۆی بچەشتایە. لەو ژنە قەڵەوانـەدا سیمای دوژمـن و لـە ئۆلگـادا وێنـەی خوشـکی خـۆی بدۆزیایەتـەوە. دەبـوو هیـوای خۆشـبەختی بـۆ بخواسـتایە، وەك چـۆن جوانـی بـە ڕووی جوانـیو، بەختـەوەری بـە ڕووی بەختەوەرییو عەشق بەڕووی عەشقەوە پێدەکەنێت.

وەلێ ڕۆزینا شەوی پێشتر زۆر کەم و خراپ نووستبوو، گەیشـتبووە ئـەو ئەنجامەیش ناتوانێت لە خۆشەویستی کلیما دڵنیابێت، بۆیە دەرچوونی لـە پەیمانی مێگەلی وەك وەهم و خەیاڵ دەهاتنە بەرچاو، تەنیا شتێکی ئەو چرۆ چکۆلەیەی ناوسکی بوو کە کۆمەڵگاو داب و نەریت دەیانپاراست، تاقە شتێك کـە هـەیبوو هاوچارەنووسـییەکی شایسـتە بـوو لەگـەڵ ژنـاندا، هاوچارەنووسییەك کە بڕیاریان دابوو بەرگری لێبکەن.

ژنانی نێو ئەو حەوزانە نموونەی ژنیەتی دنیابوون؛ ژنیەتی منداڵ بوون، سسـتەری کـردن، گەشـەکردن و پـەژموردە بوونـی هەمیشـەیی، ژنیەتیـەك پێکەنینی بەو چرکەساتە ڕاگوزەرە دێت کە ژن بڕوای بەوە هەبێت خۆشیان دەوێت و خۆیشی بەبێ هاوتا بزانێت.

لـەنێوان ئـەو ژنـەدا کـە بـڕوای بـەبێ هاوتـایی خـۆی هەیــەو، ئەودەســتە خوشـکانەی لـە پشـت پـەردەی ژنیەتیـەکی ئاسـاییەوە خۆیــان شــاردۆتەوە، چـاوەڕوانی هیـچ جـۆرە ئاشـتییەك نـاکرێت. ڕۆژینـا بـە دوای شــەوێکی بــێ خــەویو دڵــپڕوێندا، بڕیــاری تــەواوی ئــەوەیدا بڕواتــە بــەرەی ژنایەتیــەکی نەمریی و جیهانییەوە. (ئەمە نەگبەتیی ترومپیت ژەنەکە بوو)

—4—

یاکوب ماشێنی دەئاژووت، بابیس لە پاڵیا دانیشتبوو، جارجارە هـەوڵی لستنەوەی دەموچاوی ئەدا، دوای ئـەوەی دوا خـانووی شـاریان بەجێهێشـت هەندێك تەلاری چەند چینی و بە هەیبەت دەرکەوتن. خانووی ئەم ئاپارتمانانە لەناکاودا و لە پێش ساڵێکەوە پـەیدا بوون و لەبەرچاوی یاکوب زۆر ناشیرین دەیـاننواند، ئـەو خانووانـە لـەنێو ئـەو دیمەنـە دڵگیرە سەوز ڕەنگـەدا لـە چـەند گسـکێك دەچـوون لـەنێو باخەکـەوە سـەریان دەرهێنـا بێـت. یـاکوب دەسـتی بەسەری سەگەکەدا هێناو سەگەیش هێدی و ئارام چاوی لە دنیا سەوزەکەی دەرەوە بڕیبوو، یاکوب بیری کردەوە خوا چاکی کردووە هەستی جوانناسی نەخستۆتە مێشکی بچووکی سەگەوە.

سەگەکە (ڕەنگە هەستی بەوە کردبێت یاکوب بیر لـەو دەکاتـەوە) جارێکی دی دەموچاوی ئەوی لستەوەو، یاکوب بەخۆی وت وڵاتەکەی نە چاکتر دەبێت و نە خراپتر، وەلێ پێکەنین هێنترو بێ ماناتر دەبێت، سەردەمانێك ڕاوە مرۆڤی دیبـوو وا ئێسـتایش ڕاوە سـەگ دەبینێـت. وای هەسـت دەکـرد جـارێکی دی هـەمان نمایشـنامە لەگـەڵ هونــەر پیشــەی تــردا دەبینێــت، دەوری پۆلیــس خانەنشینە پیرەکـان دەیـانبینی و دەوری زیندانیـە سیاسـییەکان بوڵداگێـك و، سەگێکی دووڕەگی ئاسایی و سەگێکی پێ کورت دەیبینێت.

بیری کەوتەوە چەند ساڵێك لەوەوبەر دراوسێکانی پایتەختی، پشیلەکانیان لەبەر ماڵی خۆیاندا، بە زمان بڕاوی و، دەست و پێ بەستراوی‌و مێخ بەچاودا کراوی بینیبووەوە. منداڵەکانی دراوسێ یاریی گەورەکانیان دەکرد.

یاکوب دەستی بەسەری بابیسدا هێناو ماشێنەکەی لە بەردەم میوانخانەکەدا وەستاند. کە لە ماشێنەکە دابەزی وایزانی سەگەکە یەکسەر بە خۆشییەوە بەرەو دەرگای ماڵەکەی ڕادەبێت، وەلێ بابیس بە دەوری یاکوبدا هەڵدەبەزی و حەزی بە یاری بوو، بەڵام بەدەنگی بەرز هاواری "بابیس" کراو سەگەکە خێرا بەرەو لای ژنێك کە لە بەردەم دەرگاکەدا وەستابوو تێی تەقاند.

ژنە بە سەگەکەی وت: "تۆ سەگێکی بەرەڵایت و بە کەڵك نایەیت" بەدەنگێك وەك داوای پۆزش بکات لە یاکوبی پرسی ئاخۆ سەگەکە سەرئێشەی بۆ دروست نەکردووە؟

کە یاکوب ئەوەی بۆ ڕوونکردەوە چۆن شەوی لەگەڵ سەگەدا بەسەربردووەو ئەمڕۆیش تەنیا بۆ ئەوەی سەگەکە بگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی هاتۆتە دەرێ، ژنەکە زۆری سوپاسکردو بەگەرمی داوای لێکرد بچێتە ماڵەوە. تا لە ژوورێکی تایبەتیدا کە پێدەچوو بۆ میوانی تایبەت تەرخان کرابێت بحەسێتەوەو، خۆیشی بە ڕاکردن بەدوای مێردەکەیدا چوو.

دوای کەمێك لەگەڵ پیاوێکی گەنجدا گەڕایەوە، پیاوەکە لەسەر کورسییەکی پاڵ یاکوبدا دانیشت و دەستی لە دەستی نا "تۆ زۆر مرۆڤێکی بە بەزەییت کە ئەم هەموو ڕێگایەت تەنیا لەبەر بابیس بڕیووە، سەگێکی بەرەڵایە، هەمیشە لە گەڕاندایە، بەڵام خۆشمان دەوێت، برسیت نییە؟"

یاکوب وتی: "بەڵێ، سوپاست دەکەم" ژنە بە پەلە خۆی کوتایە چێشتخانەکە، یاکوب باسی ڕزگارکردنی بابیسی لە دەست تیپە خانەنشینە داربەدەستەکانی بۆ کرد.

پیاوە گەنجەکە بەسەرسووڕماوییەوە وتی: "حەرامزادەکان!" و بەدەنگی بەرز هاواری لە ژنەکەی کرد: "وەرە بۆ ئێرە، حەز ئەکەم دوا هەواڵی زۆڵەکانی شار بژنەویت"

ڤیرا بە سینیەکەوە کە شۆربای لەسەر و هەڵمی لێ هەڵدەستا گەڕایەوە، کورسییەکەی نزیك خستەوەو، یاکوب بە ناچاری ڕووداوی ڕۆژی پێشووتری دووبارە بۆ گێڕانەوە. سەگەکە لە ژێر مێزەکە دانیشت و پشت گوێی خوراند.

کە یاکوب شۆرباکەی تەواو کرد، پیاوە هەستاو دەورییەك گۆشتی بریانی و کفتەی لە چێشتخانەکە بۆ هێنا.

یاکوب لە پاڵ پەنجەرەکە دانیشت، خۆشحاڵ بوو، پیاوەکە جوێنی بە حەرامزادەکانی "ئەو خوارە، ناوشار" دەدا. (پێی خۆشبوو پیاوەکە میوانخانەکەی بەو بەرزییەوە بە کێوی پیرۆزی ئولەمپ دەهاتە بەرچاو) ژنەکەی کوڕە منداڵێکی دوو ساڵەی هێنایە ژوورەوە: "بەو بەڕێزە بڵێ سوپاسی دەکەم، ئەو بابیسی دووبارە بۆ هێناویتەوە"

منداڵەکە بڵمە بڵمێکی کردو بۆ یاکوب پێکەنی. خۆر دەدرەوشایەوەو گەڵا زەردەکان لەسەر زەوی دەرەوەی پەنجەرەکە لەسەرخۆ دەجووڵان، دنیا هێور و میوانخانەکە دوور لە هەراو زەناو پڕ لە هێمنی بوو.

ئەگەرچی یاکوب هیچ حەزی بە منداڵ بوون نەدەکرد، بەڵام منداڵی خۆشدەویست، وتی: "کودیلەیەکی جوانتان هەیە"

ژنە وەڵامی داوە "منداڵێکی جوان و سەیرە، خوا ئەزانێت ئەم لووتە گەورەیەی لە کوێوە هێناوە"

یاکوب زوو بیری هاوڕێکەی کەوتەوەو وتی: "دکتۆر سکریتا پێی وتووم تۆ یەکێك بوویت لە نەخۆشەکانی"

پیاوە گەنجەکە بە پەرۆشەوە پرسی: "دکتۆر دەناسیت؟"

"کۆنە هاوڕێمە"

دایکە گەنجەکە وتی: "بەڕاستیی منەتباری ئەوین"

یاکوب لە دڵی خۆیدا وتی زۆر لەوە دەچێت ئەم منداڵە یەکێك بێت لە ئەنجامە سەرکەوتووەکانی سکریتا لەبارەی خستنەوەی نەوەوە.

پیاوە لاوەکە بە ڕێزەوە وتی: "ئەو پزیشك نییە، سیحربازە"

یاکوب بیری کردەوە لەو دنیا ئارام و بەیت لەحم[1] ئاسایەدا، ژن و مێردو منداڵەکەیان لە خێزانی پیرۆز دەچن و منداڵەکەیان نەك لە نەوەی باوکێکی مرۆڤ بەڵکو لە ڕەچەڵەکی پزیشکێکی ئاسمانییە.

منداڵە لووت زلەکە بڵمەبڵمێکی تری کردو پیاوە گەنجەکە چاوی خۆشەویستیی تێبڕی، پاشان گەڕایەوە لای ژنەکەی "کێ چوزانێت؟ ڕەنگە یەکێك لە باووباپیرانی دووری تۆ لووتی زل بووبێت"

یاکوب پێکەنی، چونکە کتوپڕ پرسیارێکی سەیری بە بیردا هات: ئایا کڤیتای ژنی سکریتا، هەر بەو سرنجە شووشەیە سکی پڕبووە؟"

باوکە لاوەکە پێکەنی "بۆ ناشێت وابێت؟"

یاکوب وەڵامی دایەوە "ڕاست دەکەیت، ئەمە دڵدانەوەیەکی باشە ئێمە وابیر بکەینەوە دەمێکە مردووین و بەخاك سپێراوین و لە هەمان کاتدا لووتمان لەسەر زەوی پیاسەی خۆی دەکات"

هەموو تێر پێکەنین و، یاکوب لەبیری ئەوەدا کە دەشێت سکریتا باوکی ئەم منداڵە بێت هێدی هێدی نوقمی ناو دنیای خەونێکی سەیر بوو.

–5–

فرانتا پارەی لەو ژنە وەرگرت کە تازە یەخچاڵەکەی بۆ چاك کردبوو، لەماڵ وەدەرکەوت، بەرەو دەرەوەی شار سواری ماتۆڕە بە وەفاکەی بوو، بۆ ئەوەی

نووسینگەی پاراستن و چاودێری ناوچەکەی لە کارەکانی خۆی ئاگادار بکات، سەعات دوو کارەکەی تەواو بوو، دیسان ماتۆڕسیکڵەکەی خستەوە گەڕو بەرەو ئاوەکانزاییەکانی ئاژووت، لە پارکەکەدا ماشێنێکی کروکی سپی بینی، ماتۆڕەکەی لە پاڵیا وەستاندو لە لای ڕیزە دارەکەوە بەرەو هۆڵی کۆبوونەوە چوو. چونکە هەستی وای پێ دەگوت ڕەنگە ترومپیت ژەنەکە لەوێ بێت.

هۆی ئەم چوونەی نە لەبەر خۆ پەسەندی و نە بۆ ڕکەبەرایەتی کردن بوو، بۆ گۆڵمەزنانەوەیش نەبوو، بە پێچەوانەوە، مەبەستی بوو هەستەکانی دامرکێنێت، خۆی چکۆلە بکاتەوە، خۆی بداتە دەستەوە، بە خۆی وت خۆشەویستیەکەی هێند گەورەیە دەیەوێت لە پێناویدا بەرگەی هەموو شت بگرێت. ئەویش تەواو وەك شازادەکانی ناو چیرۆکی فریشتەکان کە لە پێناوی شازادە خانمدا هەموو ڕەنج و ناخۆشییەك دەچێژن، لەگەڵ ئەژدیهادا دەجەنگن، ئۆقیانووس تەی دەکەن، ئەمیش ئامادەی هەموو تاقیکردنەوەیەکی پاڵەوانییەتی بوو.

بۆ ئەمەندە سووك بوو؟ بۆ لە بری ئەوە تەماشای دەوروبەری خۆی ناکات و بەدوای کچانێکدا ناگەڕێت کە لە ناوچەی ئاوەکانزاییەکاندان و زۆر لە ڕۆزینا سەرنج ڕاکێشترن؟

فرانتا لە ڕۆزینا منداڵتر بوو، هەر گەنجی و بێئەزموونی تووشی کێشەی کردبوو، کە پێدەگاو گەورە دەبێت ئەوسا لە حەقیقەتی دنیای بێبار تێدەگاو کە ژنێکی لە دەست دەچێت، ژنانی تری دێنە جێگا. بەڵام هێشتا فرانتا شتێك لە بارەی زەمانەوە نازانێت. بە منداڵی لە دنیایەکی نەگۆڕدا دەژیا جۆرێك بوو لە ئەبەدیەتێکی سەقامگیر، هێشتا هەر هەمان ئەو باوك و دایکەی ماوەو، ڕۆزینا کە ئەوی کردۆتە پیاو، وەك گومەزی ئاسمان، ئەو تاقە ئاسمانەی کە هەیە، سێبەری بەسەردا کردووە، ژیان بەبێ ڕۆزینا مردنە.

فرانتا دوێنێ گوێڕایەڵانە بەڵێنی دابووە ڕۆزینا جاسووسی بە سەرەوە نەکات و ڕاستگۆیانە بڕیاری دابوو خۆی لێ لابدات، لە دڵی خۆیدا وتی ئەو تەنیا ترومپیت ژەنەکەی لامەبەستەو، لە دووگەڕانی ئەویش بەڕاستیی پەیمانشکێنی نییە، هەڵبەت هەر ئەو کاتە لەوە گەیشت ئەمە تەنیا پاساوو بەهانەیەو بە دڵنیاییەوە ڕۆزینا ڕەفتارەکانی مەحکوم دەکات. بەڵام هۆکارەکەی ئەم شتێك بوو بەهێزتر لە هەر بیروبڕیارێك، شتێکی بەهێزی وەك تلیاك کێشان: دەبوو ئەو پیاوە ببینێت، دەبوو دیسان تەماشای بکات، لەهەر دەرفەتێك و لە نزیکەوە، دەبوو لە دەموچاوە ڕەنج کێشەکەی بڕوانێت، دەبوو تەماشای لەشی بکات، چونکە پێکگەیشتنی ئەو لەشە لەگەڵ جەستەی ڕۆزینادا نە شیاوی وێناکردنەو نە باوەڕی پێدەکرێت. دەبوو لێی بڕوانێت، دەتوت چاوی دەتوانێت پێی بڵێت بە یەکگەیشتنی ئەو دوولەشە بەڕاستی دەشێت یان نا.

پرۆڤەی مۆسیقا بەردەوام بوو. دکتۆر سکریتا بە تەپڵ، پیاوێکی کورتە باڵا لەسەر پیانۆو کلیما بە ترومپیتەکەی خۆیەوە لەسەر شانۆ بوون. چەند لاوێکی عاشقی جاز کە بۆ گوێگرتنی مۆسیقا هاتبوون لە هۆڵەکەدا دانیشتبوون. فرانتا لەوە نەدەترسا هاتنەکەی ئاشکرا بێت. لەوە دڵنیابوو ڕۆژی سێ شەممە، لایتی ماتۆرسیکڵەکە وا ترومپیت ژەنەکەی کوێرکردبوو نەیتوانیبوو دەموچاوی ببینێت، بەهۆی پارێزگاری ڕۆزینایشەوە هیچ کەسێکی دی دەربارەی پەیوەندییان شتێکی وای نەدەزانی.

ترومپیت ژەن مۆسیقاکەی ڕاوەستاند، لەپاڵ پیانۆ ژەنەکەدا دانیشت بۆ ئەوەی پیاوە کورتە باڵاکە فێری ئەوە بکات پارچە مۆسیقایەك بە چاکی لێبدات. فرانتا لە دواوەی هۆڵەکەوە لەسەر کورسییەك دانیشت و وردە وردە

بوو بە سێبەرێك کە ئەو ڕۆژە تەنانەت بۆ چرکە ساتێکیش لە ترومپیت ژەنەکە نەدەبووەوە.

—6—

لە میوانخانەکە دەگەڕایەوە، بەوە غەمگین بوو ئیدی سەگە شەیتانەکەی لە پاڵا نەبوو دەموچاوی بلێسێتەوە. بیری لەوە کردەوە ئەمە چ موجیزەیەکە توانیبێتی لە ماوەی تەمەنی چل و پێنج ساڵەی خۆیدا کورسیەکەی تەنیشتی بە خاڵی بهێڵێتەوە، بۆیە ئێستا دەتوانێت زۆر بە ئاسانی، بێ بار، بێ لێپرسینەوە، تاك و تەنیا، بە هەستێکی فریو دەرانەی (لەگەڵ ئەوەیشدا کە جوانە) لاویەتیەوە، وەك خوێندکارێك تازە نەخشە بۆ ئایندەی خۆی بڕێژێت، وڵات جێ بێڵێت.

هەوڵیدا بە تەواوی بیری وڵات جێهێشتن لە خۆیدا دروست بکات، کۆشا ڕابووردووی خۆی بێنێتەوە یاد، لە خەیاڵیا ئەوەندە وەك دیمەنێکی دڵگیر ووالا بەرجەستەی بکات داخ بۆ جێهێشتنی هەڵبکێشێت، دیمەنێکی هێند والا تا ئاسۆ بگرێتەوە، بەلام زانی ئەمە کارێکی سەختە، ئەوەی توانی بە خەیاڵ ببینێت بچووك، سنووردارو کەم بوو، وەك ئۆکۆردیونێکی داخراو. زۆر بە زەحمەت توانی چەند یادەوەرییەك وەبیر خۆی بێنێتەوە کە دەشیا هەر بە ڕواڵەت ناوی ژیانێکی بەرجەستەو گرنگی لێ بنێیت و بەڕێکەوت دروست بووبێت.

تەماشای ڕیزە درەختی سەرشەقامەکەی کرد، گەلایان سەوز، سوور، زەردو قاوەیی بوو، دارستانەکە لە ئاگر گرتوویەکی گەورە دەچوو، بیری لەوە کردەوە ئەو کاتێك ئێرە بەجێ دێڵێت دارستانەکان ئاگریان تێ بەربووەو ژیان و یادەوەرییەکانی لەناو بڵێسە جوان و بێ بەزەییەکاندا دەسووتێت، بەمە

دڵخۆش بوو. بۆ دەبێت لەوە دڵگران بێت کە هەست بە غەمێك ناکات؟ بۆ دەبێت داخ بۆ شتێك بخوات هەست ناکات پێویستی بە داخ خواردن بێت؟

نا، لەوە پەشیمان نەبوو ئێرە جێ دێڵێت، بەڵام هەستی بەوەیش کرد نابێت پەلە لە ڕۆیشتن بکات. بە پێی ئەو بەڵێنەی بە هاورێکانی دەرەوەی دابوو، دەبوایە ئێستا لە مەرز تێپەڕیایە، وەلێ هەستی کرد خەریکە تووشی ئەو بێ دەربەستی و پشتگوێ خستنە دەبێتەوە کە ناوی پێ دەرکردبوو، زۆر جاریش هاورێکانی لەسەر ئەوە گاڵتەیان پێدەکرد، پێ دەچوو هەمیشە ڕێك لەو کاتانەدا کە دەبوو کاری حەتمی و چارەنووس ساز بەجێ بێنێت، بچێتەوە سەر ئەوخووە. دەیزانی تەواوی ڕۆژەکە ئەو سوورە لەسەر ئەوەی بە پەلە بڕوات، بەڵام ئەوەیشی دەزانی هەر لە بەیانیەوە بە سەختی هەوڵی ئەوەیەتی لەم شوێنە دڵگیرو پڕ لە ئاسوودەیەدا، ئەو جێگایەی ساڵەهایە سەری لێدەدات، هەرچەندە درەنگ درەنگیش بووبێت، وەلێ هەمیشە چاوەڕوانییەکی خۆشی بینینی هاوڕێ کۆنەکەی کردووە بۆیە حەزی بە مانەوەیە.

ماشێنەکەی وەستاند (بەڵێ، ماشێنە سپۆرتە کروکیە سپیەکەی ترومپیت ژەن و ماتۆڕە سوورەکەی فرانتایش هەر لەوێدا وەستابوون) و چووە ڕێستورانەکەوە، ئەو جێگایەی دەبوایە کەمێکی تر ئۆلگای تیا ببینێت، لە نزیك پەنجەرەیەکەوە دانیشت کە بەسەر باخێکی بە داروباری درەخت و گەلای ڕەنگاڵەییدا دەیڕوانی. بەڵام بەداخەوە پیاوێکی لێ دانیشتبوو، یاکوب لە شوێنێکی نزیك بەوێ دانیشت، نەیدەتوانی لەوێوە باخەکە ببینێت، وەلێ ئەو پیاوەی کە لەسەر مێزی پاڵ پەنجەرەکە دانیشتبوو سەرنجی ئەمی ڕاکێشا. پیاوەکە تەواو تووڕەو، بەردەوام سمکۆڵانی بوو، چاویشی لە دەرگای دەرەوەی ڕێستورانەکە بڕیبوو.

-7-

هەر چۆنێك بوو ژنەكە هات، كلیما لە جێگاكەی ڕاپەڕی، خێرا بەرەو ڕووی ڕۆشت و بۆ مێزی پاڵ پەنجەرەكەی برد. زەردەخەنەی بۆ كرد، دەیویست بەو زەردەخەنەیە پێی بڵێت: "ڕێكەوتنەكەمان بەردەوامە، بڕوامان بە یەكدی هەیە، هێور و دڵنیاین، كار بە باشی دەڕوات" لە دەموچاوی كچەدا بە دوای كاردانەوەیەكی ئیجابیدا گەڕا، بەڵام نەیدۆزییەوە، ئەمە تووشی دوو دڵیی كرد، نەیوێرا لە بارەی شتێكەوە قسە بكات كە تووشی ڕاڕایی دەكردو، لە بری ئەوەو بۆ ئەوەی دۆخێكی خۆشی دروست بكات، گفتوگۆیەكی كورت و بێ مانای دامەزراند. بەهەرحاڵ، وتەكانی بەرانبەر بێدەنگی كچەكە، وەك بەر بەردێك كەوتبێت و گەڕابێتەوە جێگای خۆی وابوو.

لەپڕا كچەكە قسەی پێ بڕی: "پەشیمان بوومەتەوە، ئەم كارە گوناهە، ڕەنگە تۆ بتوانیت بیكەیت، بەڵام من نا"

هەموو شتێك لە ناوەوەی ترومپیت ژەنەكەدا هەرەسی هێنا. تەماشایەكی بێ هەست و مانای ڕۆزینای كرد و نەیزانی چی بڵێت، تەنیا هەستی بە ماندووبوونێكی نائومێدانە كرد و، ڕۆزینا قسەكەی خۆی دووبارە كردەوە: "گوناهە ئیدی"

سەیری ڕۆزینای كرد، ڕاست نەهاتە بەرچاوی، ئەم ژنە كە نەیتوانیبوو شێوەكەی بێنێتەوە بەرچاوی، وا ئێستا وەك فەرمانی بەسەردا درابێت هەتا ئەم ماوە بەرانبەری لێدەگرێت (كلیمایش وەك هەموومان تەنیا ئەو شتانەی بەڕاست دەزانی كە لە ناوەوەدا، وردە وردە و بە شێوەیەكی كاریگەر دەچنە هەستەوە. بەڵام ئەو شتانەی لە دەرەوە، بێ چاوەڕوانی و بەڕێكەوت دێن، وەك پەلاماردانێكی ناڕاست دەركی دەكردن)

گارسۆنەکە دەرکەوت، هەر ئەوە بوو کە دوو ڕۆژ پێشتر ترومپیت ژەنەکەی ناسیبوو، دوو پەرداخ کۆنیاکی لەسەر سینیەك بۆ هێنان، بەخۆشییەوە وتی: (هیوادارم پێشبینی ئەو شتەم کردبێت کە ئێوە حەزی لێدەکەن) گەڕایەوە لای ڕۆزینا، دیسان هەمان قسەکانی پێشتری دووبارە کردەوە: "ئاگاداربە، کچان چاوتان دەردێنن" و قاقادایە پێکەنین.

کلیما هێند نوقمی نیگەرانی بوو لە قسەی گارسۆنەکە نەگەیشت. پێکێکی لە کۆنیاکەکە هەڵداو بەلای ڕۆزینادا مووچایەوە. "چیت کەوتۆتە مێشکەوە؟ وامزانی هەموو شتێکمان بڕیوەتەوە، پێم وابوو لە یەکدی تێگەیشتووین، چۆن وا لە ناکاو بیرت گۆڕی؟ خۆت ڕازی بوویت پێش هەرشتێك پێویستمان بە یەك دوو ساڵ هەیە بۆ خۆمان، ڕۆزینا، تکات لێدەکەم، ئێمە یەکمان خۆش دەوێت، لێگەڕێ تا ئەوکاتەی کە بەڕاستی تا هەردووکمان خۆمان حەزی لێ نەکەین منداڵمان نەبێت".

**–8–**

یاکوب زوو ئەو کچە سستەرەی ناسی کە ویستبووی بابیس بداتە دەست پیرەمێردەکانەوە. بە وردی تەماشای کرد، پەرۆشی ئەوەبوو بزانێت ئەوو پیاوەکە لە بارەی چییەوە دەدوێن، تەنانەت نەیدەتوانی بە ڕوونی وشەیەکیان بژنەوێت، بەڵام هەستی کرد گفتوگۆکەیان لەوپەڕی گرژیدایە.

دوای ماوەیەکی کەم لە دەموچاوی پیاوەکەوە دەرکەوت هەواڵێکی غەمگینی بیستووە، زۆری برد بێتەوە سەرخۆی، لەحاڵ و هەوایەوە دیاربوو لەگەڵ کچەدا لە بێنەو بەردەدایە، وەلێ کچە لە بێدەنگیەکی سەرسەختانەدا بوو.

یاکوب هەستی کرد ژیانی یەکێك لە مەترسیدایە، ئەو هێشتا وا تەماشای کچە قژ زەردەکەی دەکرد کە بەخۆشییەوە دەیەوێت یارمەتی خوێنڕێژ بدات بۆ لە داو نانی قوربانی. تەنانەت هیچ گومانی لەوە نەبوو پیاوە گەنجەکە لایەنگری ژیان و ئەو لایەنگری مەرگە، پیاوە گەنجەکە هەوڵی ئەوەیبوو ژیانێك ڕزگار بکات، داوای یارمەتی دەکرد، بەڵام کچە ڕێی نەدەداو بەهۆی ئەوەوە یەکێك دەمرد.

پاشان پیاوەکەی بینی دەستی لە پێداگرتن هەڵگرت، زەردەی هاتێ و دەستی بە ڕوومەتی کچەدا هێنا. ئایا ڕێککەوتبوون؟ بە هیچ جۆرێك، چاوی ژێر قژە زەردەکە سەرسەختانە بە شوێنێکی دوورەوە ڕامابوو، نەیدەویست ڕووی پیاوەکە ببینێت.

یاکوب نەیدەتوانی چاو لە ژنە گەنجەکە لابخات کە تەنیا بە چاوی یارمەتیدەری خوێنڕێژانەوە لێی دەڕوانی. دەموچاوی کچە جوان بەڵام خاڵی بوو. بۆ سەرنج ڕاکێشانی پیاوێك جوان بوو، وەلێ لەوەدا کە داواکارییە نەرمونیانەکانی پیاوەکەی بە هیچ نەدەگرت، خاڵی بوو. دەموچاوێکی لە خۆبایی، یاکوب وای بۆ دەچوو لە خۆبایی بوونەکە لەبەر جوانییەکەی نییە بەڵکو ڕێك لەبەر خاڵی بوونەکەیەتی.

لە دیدی یاکوبەوە ئەو دەموچاوە وێنەی هەزاران دەموچاوی تر بوو کە پێشتر ناسیونی، پێدەچوو هەموو ژیانی گفتوگۆیەکی بێ کۆتایی بووبێت لەگەڵ ئەو دەموچاوەدا. هەرکات ویستبێتی هۆی شتێك لێك بداتەوە، ئەو دەموچاوە لە خۆباییە گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئەو دەموچاوە داویەتە ناو قسەو بەڵگاندنەکانی ئەم و ڕەوتی بابەتەکانی گۆڕیوە، گاڵتەی بە زەردەخەنەکانی هاتووە، بەخۆ پەسەند تۆمەت باریکردووەو لە هەموو خواستەکانی بێ بەرییکردووە، ئەو دەموچاوەی کە هیچ نازانێت و بڕیار

لەسەر هەموو شتێکیش دەدات. دەموچاوێکی وشك و بێ فەڕی وەك بیابان و لەخۆبایی بە بێ فەڕییەکەی.

بــیری کــردەوە ئەمــە دواجــارە ئــەم دەموچــاوە دەبینێــت و ســـبەینێ قەڵەمڕەوەکەی بە یەکجاری بەجێ دێڵێت.

—9—

ڕۆزینایش یاکوبی چاوکردو ناسییەوە، لە نامۆیی ڕوانینەکەی بێزرا، هەستی کرد لە گەمارۆی دوو پیاودایە کە ژێر بەژێر هاوکاری یەکترین، دوو ڕوانینی نامۆ وەك دوو لوولەی دەمانچە سەریان کردۆتە نیشانە.

کلیما بەردەوام بەڵگاندنەکانی دووبارە دەکردەوەو ئەو گێژبوو چ وەڵامێك بداتەوە. هەوڵی دەدا دووبارە ورەیەك بداتە بەرخۆی کە لە بارەی ژیانی منداڵێکەوە عەقڵ گرنگ نییەو تاقە شتێك گرنگ بێت هەست و سۆزە. خۆی لە هەردوو ڕوانینەکە دزییەوەو لە پەنجەرەکەوە بۆ دەرەوەی ڕوانی. لە ڕێی ئەو ڕۆچوونە دەروونییەوە، هەستێکی نادیار، لە شوناسی خۆی وەك دایکێکی خیانەت کار یان دۆستێك کە بە هەڵە لێی گەیشتبن لە ناوەوەیدا سەری هەڵدا، هەسـتی بـە سـووکایەتیەك کـرد وەك هــەویرێکی هەڵــهاتوو لــە وجودیــدا سەردەکەوت، لەبەر ئەوەی نەیدەتوانی ئەو هەستانە بە وشە دەرببڕێت، لێگەڕا هەموو ڕوانینەکەی لە نوختەیەکی باخەکەی پاڵیاندا کۆبکاتەوە. وەلێ هەر لەو شوێنەدا کە ببووە چەقی ڕوانینــی ئــەم، لــە ناکــاوێکدا بــاڵای ناســیاوێك دەرکەوت، وا ترسا ئیدی قسەکانی کلیمای نە دەژنەوت.

ئەمە سێیەم جووتە چاو بوو وەك لوولەی دەمانچە ئەمیان کردبووە نیشانە، ئەم دەمانچەیەیان لەوانی دی پڕ لە مەترسی‌تر بوو، لە سەرەتاوە (با بڵێین چەند هەفتەیەك پێشتر) هێشتا ڕۆزینا لەوە دڵنیا نەبوو کێ بەرپرسیارە

لـه پێشـهاتی بـه دایككردنـی ئـەم. ئـەو كـوڕە لاوەی لـه پشـت یـەكێك لـه درەختەكانـەوە خـۆی مـەڵاس داوەو تـا نیـوەی دیـارە و بـه دزییـەوە بـۆی دەڕوانێت، ئاسایی یەكێكە دەبێت بۆ ئەو مەسەلەیە لەبەرچاو بگیرێت، بەڵام ئەمە تەنیا لە سەرەتای كارەكەدا وابوو، چونكە وردە وردە ترومپیت ژەنەكە ئەگەری ئەوەی تیا دروست بوو خۆی سـكی ئـەمی پڕكردبێـت، سـەرئەنجام گەیشتە ئەو ڕاستیەی ترومپیت ژەنەكە باوكی منداڵەكەیە. لێگەڕێن زیاتر ئەم مەبەستە ڕووناك بكەینـەوە: هـەرگیز ئەو نەیدەویست بە فڕوفێڵ كلیما بكاتە باوكی منداڵەكە، ئەو نەك فڕوفێڵ بەڵكو ڕاستیی وتووە: بە سادەیی گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی دەبێت بەڕاستیی ئەمە وا ڕوویدابێت.

بێجگە لەوە، بە لایەوە دووربوو، پیاوێك كە سەرچاوەی پەیمانێكی پیرۆزی وەك دایكایەتی بێت، تا ڕادەیەك ئەم نەفرەتی لێ بكات، مەسەلە لۆژیك نەبوو، بەڵكو شتێك لە سەرووی لۆژیكەوە دڵنیایكرد دەبێت لـه تـەنیا كەسێك ئـەم منداڵـەی گرتبێـت كـه خۆشـی ویسـتووەو جێگـای ڕێـز و ئافـەرینی بـووە. كـاتێكیش لـه تەلەفۆنەكـەوە گوێـی لێ بـوو ئـەو پیـاوەی كردبوویـە بـاوكی منداڵەكەی لە مەسەلەكە ترساو خۆی لە پەیامی باوكایەتی نەبان كرد، ئیدی سـەرئەنجامی كارەكـه ئاشـكرابوو، لەوكاتـەدا نـەك بـه تـەواوی دڵنیـابوو كـه حەقیقەتی هەڵبژاردووە، بەڵكو ئامادەی شەڕكردنیش بوو لە پێناویدا.

كلیما كەوتبووە نێـو قوڵایـی بێدەنگییـەوە و دەسـتی نـازی بـه ڕوومـەتی ڕۆزینادا دەهێنا، كە ڕۆزینا لە دەریای بیركردنـەوە هاتـە دەرێ زەردەخەنەكەی ئەو سەرنجی ڕاكێشا، كلیما وتی بە ماشێن گەشتێكی تر لـە دەرەوەی شـاردا بكەن، چونكە مێزەكە وەك دیوار لێكی جیاكردونەتەوە.

ڕۆزینـا دەترسـا، فرانتـا هـەر لـه دوای درەختەكـەوە خـۆی مـەڵاس دابـوو تەماشـای پەنجـەرەی ڕێسـتورانەكەی دەكـرد. ئەگـەر هــەر ئـەوەندەی پێیـان

بچوایەتـە دەرەوە دووبـارە سـەرەڕێی لێبگرتنایـە؟ ئەگـەر دیسـان وەك سـێ شەممە گۆڵمەزێکی بنایەتەوە چۆن؟

کلیما بـە گارسـۆنەکەی وت: "فاکتۆری حسـابەکە، تکایـە، دوو براندیمـان هەیە"

ڕۆزینا لوولەیەکی شووشەیی لە کیفەکەی دەرهێنا.

ترومپیـت ژەنەکـە پارچـە دراوێکـی بـە گارسـۆنەکە داو پاشماوەکـەی وەرنەگرتـەوە. ڕۆزینـا دەرگـای لوولـە شووشـەییەکەی کـردەوە، حـەبێکی دەرهێناو زوو قووتیدا، کە ویستی سەری شووشەی دەرمانەکە بپێچێـت تـا بیبەسـتێت، دیسـان ترومپیـت ژەنەکـە هـاتبووەوە لای و وەك لێـی بپاڕێتـەوە تەماشـای دەکـرد. دەسـتی کچـەی گـرت، پەنجـەیان تێـك ئـالاو، شووشـەی دەرمانەکە کەوتە سەرمێزەکە. کلیما وتی: "وەرە، وەرە بابڕۆین"

ڕۆزینایش لە جێگاکەی هەستا، سەرنجی ڕوانینە نامۆو تیژو نەیارانەکەی یاکوبیدا و خێرا جێ ڕوانینەکەی خۆی گۆڕی. کە گەیشـتنە شـەقامەکە بـە دوودڵییەوە تەماشای باخەکەی کرد. بەڵام فرانتا ئیتر لەوێ نەمابوو.

## –10–

یاکوب هەستا، پەرداخی نیوە خاڵی شەرابەکەی هەڵگرت و بەرەو لای مێزە چۆڵەکە ڕۆشت، بە خۆشیەوە لە پەنجەرەکەوە تەماشای ئەو درەختانەی ناو باخەکـەی کـرد کـە سـوور داگـەڕابوون، جـارێکی دی بـەخۆی وت ئەمـە ئـاور بەربوونەوەیەکە تەمەنی چل و پێنج ساڵەی خۆی تێفڕێداوە. بەڕێکـەوت لـە سەرمێزەکە چاوی بە لوولە شووشەییەکە کەوت لەپاڵ تەپڵەکی جگەرەکەداو، هەڵیگرت و لێی وردبوەوە، بەناوی دەرمانەکە کە لەسەر چەسپی شووشەکە نووسرابوو نە شارەزا بوو، یاداشتێکی بە قەڵەمی ڕەش لەسەر نووسرا بوو:

ڕۆژی سێ دەنک. ڕەنگی حەبی ناو شووشەکە شین باو بوو، ئەمە جێی سەرنجدان بوو، ئەوە دوا سەعاتەکانی مانەوەی بوو لە شوێنی لەدایك بوونەکەیدا، بۆیە بچووکترین ڕووداو گرنگییەکی نائاسایی لاپەیدا دەکرد، شێوەیان دەگۆڕاو نمایشێکی شانۆییان لە خۆدەگرت. لە خۆی پرسی لەناو ئەم هەموو ڕۆژانەدا، یەکێك ئەمڕۆ شووشەیەك دەرمانی بۆ من بەجێ هێشتووە حەبی شین باوی تیایە، ئەمە چ مانایەکی هەیە؟ ئەی بۆ ئەم شووشەی دەرمانە لە لایەن ژنێکەوە بۆ من بەجێماوە کە زۆر بەتایبەتی– هاوکاری زاڵم و خوێنڕێژە؟ ئایا ئەو دەیەوێت بە من بڵێت هێشتا دەوری پێویستی بە حەبی شین باو بەسەرنەچووە؟ یان بۆیە ژەهری بیری من خستەوە تا نەفرەتە بێ کۆتاییەکەی بەسەرمندا بڕێژێت؟ یان دەشێت بیەوێت وای لە من بگەیەنێت بڕیاری بەجێ هێشتنی ولاتم مانای خۆ بە دەستەوەدانەو وەك قووتدانی ئەو حەبە شینە کاڵە وایە کە لە گیرفانی هێلەکەکەمدایە؟

دەستی بە گیرفانیدا کرد، بەستەیەکی چکۆلەی دەرهێناو کردیەوە، ئێستا بەڕاستیی حەبەکەی دەبینی، پێدەچوو شینیەکەی ئەم لە دەرمانی ناو شووشەکە تێرتر بێت، دەرکی لوولە شووشەییەکەی کردەوەو حەبێکیانی دەرهێنا، بەڵێ، حەبەکەی خۆی کەمێك تێرترو بچووکتر بوو.

هەردوو حەبەکەی خستە ناو شووشەی دەرمانەکەوە، ئەمەندە لێك دەچوون کە بە تەماشایەکی سەرپێیی لێك جیا نەدەکرانەوە. حەبی سەرەوە کە دەبوو ئاسایی چارەسازی نەخۆشی بێت وا ئێستا ببوو بە حەبی مەرگ.

لەوکاتەدا ئۆلگا هات، یاکوب بەپەلە دەرگای شووشە دەرمانەکەی داخست، لەسەر مێزەکە، لەپاڵ تەپڵەکی جگەرەکەدا داینا و بۆ خۆشهاتنی هاوڕێکەی هەستایە سەرپێ.

بەرانبەر بە یاکوب لەسەرمێزەکە دانیشت، هەناسە بڕکێی بوو، وتی: "وابزانم کلیمای ترومپیت ژەن بوو، دەبێت؟ دەستی لەناو دەستی ئەو ژنە ترسناکەدا بوو، نازانێت ئەمڕۆ لە مەلەوانگەکەدا چیم بە دەستیەوە چێشت!"

قسەکەی بڕی، چونکە هەر لەو ساتەدا سەری ڕۆزینا لەسەرمێزەکەیان دەرکەوت و وتی: "دەرمانەکەم لێرە دانا"پێش ئەوەی یاکوب توانای وەڵامدانەوەی هەبێت، شووشە دەرمانەکەی لە پاڵ تەپڵەکی جگەرەکەدا بینی و دەستی بۆ درێژکرد.

بەڵام یاکوب پێش دەستی کرد.

ڕۆزینا وتی "بمدەرێ"

یاکوب وتی: "حەز ئەکەم چاکەیەکم لەگەڵدا بکەیت، ڕێگام دەدەیت یەکێك لە حەبەکانت هەڵبگرم؟"

"تکات لێدەکەم، وازبێنە، کاتم نییە"

"منیش بەڕاستی هەر لەم دەرمانە بەکاردێنم و.."

ڕۆزینا وتی: "من دەرمانخانەی گەڕۆك نیم"

یاکوب ویستی سەری شووشەکە لابەرێت، وەلێ پێش ئەوەی بتوانێت ئەوکارە بکات ڕۆزینا پەلاماری دایە، یاکوب خێرا شووشەکەی لەناو مشتیا توند گرت و دەستی لە دەستی کچەکە دوور ڕاگرت.

ڕۆزینا هاواری بەسەردا کرد: "دەتەوێت چی بکەیت؟ ئەو حەبانەم بدەرێ"

یاکوب لەناو چاوی ڕاما، پاشان هێدی هێدی، بەڕێزەوە، دەستی خۆی کردەوە.

-11-

وا دەهاتــە بــەرچاو کــە دەنگــی هــەراو زەنــای پێچکــەی شــەمەندەفەرەکە پەیامێك بێت لە سەفەرە بێ ئاکامەکەی. هەر چۆنێك بێت، ئەو بە تەواوی لـەوە دڵنیا بوو مێردەکەی لە ئاوەکانزاییەکاندا نییە، ئـەی بـۆ زەحمـەتی چوونـی ئەوێ دەداتە بەرخۆی؟ ئایا بۆ ئەوە چوارسـەعات بـە شـەمەندەفەر سـەفەری دەکرد تا لـەوە دڵنیـا بیـت کـە خـۆی ئێسـتا دەیزانێـت؟ بگەڕێتـەوە، دیسـان سـواری شـەمەندەفەر بێـت و بـۆ مـاڵ بگەڕێتـەوە؟ ئەمـە نـەك تـەنیا هۆیـەکی لۆژیکی نەبوو، بەڵکو دینەمۆیەك بوو تا دەهات زیاتر دەسووڕاوەو نەدەبوو بوەستێت "لەم قۆناغەدا، هەم کامیلا و هەم فرانتا وەك دوونارنجۆك ئێرەییەکی کوێـر ڕابـەریان دەکـات- ئەگـەر بتوانین بـە "ڕابـەری" نـاوزەدی بکـەین- بەپەلـە دێنە ناو چیرۆکەکەمانەوە)

ڕێگای هاتوچۆی شەمەندەفەر لـەنێوان پایتـەخت و کانیاوەکاندا زۆر باش نەبوو، خانمی کلیما بە ناچاری سێ جار شەمەندەفەرەکەی گۆڕی، کاتێك لـە دواجاردا لەسەر سەکۆیەکی جوان، پڕ لە پۆستەری ڕاگەیاندن لە بارەی تواناو هێزی چارەسەرکردنی کانیاوەکان و حەوزەکانیەوە دەرکەوت، تـەواو ماندوو بوو. لە ڕێڕەوی سپیدارەکانەوە بەرەو کانیاوەکان کەوتە ڕێ، کە گەیشتە ڕیـزە ستوونەکان پۆستەرێك کە بە دەست نووسرابووەوە سەرنجی ڕاکێشا، بە پیتـی سوور و بەشێوەیەکی دیار ناوی مێردەکەی لەسەر پۆستەرەکە نووسـرابوو، زۆر بە سەرسووڕماوییەوە وەستا، نـاوی دوو پیـاوی تـری خوێنـدەوە لـە ژێـر ناوی مێردەکەیدا نووسرابوون، باوەڕی نەکرد: کلیما ڕاستی لەگەڵدا کردبوو، شتەکانی چۆن وتبوو هەموو وا دەرچوون، لە چرکەساتی یەکەمدا خۆشییەکی گەورەی لێپژا. هەستی بە دڵنیاییەك کرد کە دەمێك بوو لێی دابڕابوو.

بەڵام خۆشییەکەی زۆری نەخایاند، چونکە دوای کەمێك ئەوەی بە بیردا هات کە تەنیا سازدانی کۆنسێرت بە هیچ جۆرێك بەڵگەی وەفاداریی مێردەکەی نییە، ڕێی تێدەچێت بەشداریی مۆسیقا ژەندنەکەی لەم ئاوەکانزاییانە دوورەدا تاقە دەرفەتێکی گونجاو بێت بۆ بینینی یەکێك لە دڵدارەکانی، زوو لەوە گەیشت مەسەلەکە لەوە خراپترە کە چاوەڕێی دەکردو ئەم لە تەڵە کەوتووە.

هاتبووە ئاوەکانزاییەکان تا ئەوە بسەلمێنێت مێردەکەی لەوێ نییە و، هەر بەو جۆرە (وەك چەندان جاری تری) بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ حوکمی ناپاکیی بەسەردا بدات. بەڵام وا ئێستا هەل و مەرجەکە گۆڕا: ئەمجارەیان بە درۆ تاوانبار ناکرێت، بەڵکو مەچەکی دەگیرێت (بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ئاشکرا) لەکاتی ناپاکی کردندا. بیەوێت یان نا ئەو ژنە دەبینێت کە کلیما ڕۆژی لەگەڵدا بەسەر دەبات. لەم بیرکردنەوەیەدا هەردوو ئەژنۆی هاتنە لەرزین، ڕاستە دەمێك بوو لەوە دڵنیابوو ئەوەی دەبوو بیزانێت دەیزانی، بەڵام تا ئێستا هەرگیز شتێك (هیچ یەکێك لە ژنە دۆستەکانی مێردەکەی) نەدیبوو، ڕاستت دەوێت زانیارییەکانی لەو بارەیەوە زۆرکەم بوون، وەلێ تەنیا هەستی بەوە دەکرد دەیزانێت و بایەخ و دڵنیاییشی بەو هەستەی خۆی دەدا. متمانەی بەبێ وەفایی مێردەکەی وەك بڕوابوونی مەسیحیەك وابوو بە بوونی خوا، مەسیحیی تەواو لەوە دڵنیایە خوا هەر بە نادیدەیی دەمێنێتەوەو بڕواییشی بەمە هەیە. لە بیری ئەوەدا ئەمڕۆ کلیما لەگەڵ ژنێکی بێگانەدا دەبینێت ترسی لێ نیشت، وەك ئەو ترسەی لە مەسیحیەك دەنیشێت کاتێك کە خوا تەلەفۆنی لەگەڵدا بکات و پێی بڵێت بۆ شێو خواردن دەڕواتە لای.

شڵەژانێك هەموو گیانی داگرت، پاشان گوێی لە بانگکردنی ناوی خۆی بوو.

گەڕایەوەو سێ کوڕی لاوی بینی کە لە نێوەندی ڕیزە دارەکاندا وەستا بوون، چاکەت و پانتۆڵی جینیان لە بەرداو سیمای بوهەیمیشیان گومانی ئەوەی نەدەهێشت لە میوانەکانی تری ناو ڕیزە دارەکان جیاوازبوون کە نیگایەکی بێزارکەریان پێوە بوو، زەردەخەنەیان بۆکرد. بەدەنگی بەرز سڵاوی لێکردن، ئەوان لە ئەنجامدانی کارێکی سینەماییدا بوون، هاوڕێی ئەو سەردەمانەی بوون کە ئەم لەسەر شانۆ دەردەکەوت.

دەرهێنەرەکەیان، کە لەوانی دی باڵای بەرزتر بوو، دەستی گرت و وتی: "چەند خۆش دەبوو لەبەر ئێمە، تەنیا بۆ بینینمان هاتبیتە ئێرە.."

یارمەتیدەرەکەی بە غەمگینیەوە وتی: "تەنیا بۆ بینینی مێردەکەی هاتووە".

دەرهێنەرەکە وتی: "چ بەد بەختیەکە! جوانترین ژنی پایتەخت و، ترومپیت ژەنێك توانیویەتی بیکاتە موڵکی خۆی و ساڵانێکە لە قەفەزێکدا زیندانیی کردووە.."

وێنەگرەکە (لاوێك چاکەتێکی کۆنی لەبەردابوو) وتی "ئاه.. وەرن ئاهەنگێك بگێڕین"

ئەوان بیریان لەوە کردەوە ئەمە ڕێزلێنانی شاژنێکی قەشەنگە، پێش ئەوەی ڕێزەکەیان بخاتە نێو بەستوویەکی پڕاوپڕ لەو دیاریانەوە کە بە شایانی خۆی نازانێت و بێ بایەخانە لێی دەڕوانێت، خانمیکلیما لە بری ئەوە وەك کچێکی شەل کە بە سوپاسەوە خۆی بە باسکێکەوە ڕابگرێت، بە پەرۆشەوە پێشنیازەکەی لێ قبووڵ کردن.

## -12-

ئۆلگا بەردەوام بوو لەسەر قسەکردن و لە هەمان کاتدا بیری یاکوب لای ئەو ژەهرە بوو کە داویەتە نەناسێك و ڕەنگە ئێستا یان تاوێکی دی قووتی بدات.

ڕووداوەکە هێند کتوپڕ و لەوەیش خێراتر بوو بتوانێت تێی بگات. بێ تێگەیشتن ڕوویدابوو.

ئۆلگا ئەزموونەکانی دوایی خۆی بە ناخۆشییەوە باس دەکردو یاکوبیش دەیویست قەناعەت بە خۆی بکات کە نەیویستووە شووشەی دەرمانەکە بە کچەکە بدات و، خودی کچەکە ناچاری ئەو کارەی کردووە.

هەر لەو ساتی بیرکردنەوەیەدا زانی ئەمە پاساوو بیانوویەکی قێزەونە. ئەو دەیتوانی بۆ ڕەتکردنەوەی داوای کچەکە کەڵك لە هەزار ئەگەر وەربگرێت، دەیتوانی لووت بەرزی خۆی، بەرانبەر لووت بەرزی کچەکە ڕابگرێت و، بە هێوری ئەو حەبەی لەسەری سەرەوەی شووشەکەدایە هەڵبگرێت و لە گیرفانی خۆی بنێت.

هەرچەندە بۆ کارێکی وا بیری لە کارکەوتبوو، بەڵام دەیتوانی بکەوێتە دوای کچەکەو دان بەوەدا بنێت شووشەکە ژەهری تیایە، بە هەرحاڵ، ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی ڕووداوەکە کارێکی زۆر دژوار نەبوو.

لەگەڵ ئەمانەیشدا، لە کاتێکدا دەبوو بکەوێتە دوای سستەرەکە کەچی لەوێ دانیشتبوو، لەسەر مێزەکە دانیشتبوو گوێی دابووە قسەکانی ئۆلگا، هێشتا کات بە بەریەوە مابوو، دەبوو بۆ ڕزگارکردنی کچەکە هەرچیەکی لە دەست بێت بیکات. ئەی بۆ وا ئارام دانیشتووە؟

ئۆلگا قسەی دەکردو ئەو نەیدەزانی بۆ هێشتا دانیشتووە. گەیشتە ئەو ئەنجامەی پێویستە هەر ئێستا هەڵبسێت و بەدوای سستەرەکەدا بگەڕێت، بۆ ئەوەی بەڵگەی جێ هێشتنی ئۆلگای هەبێت دەبوو مەبەستەکەی بۆ ڕوون

بکاتەوە. ئەی دەبوو بێ پێچ و پەنا باسەکەی بۆ بگێڕێتەوە؟ زانی نابێت کاری وابکات. ئەی ئەگەر سستەرەکە پێش گەیشتنی ئەم حەبەکەی خواردبێت چۆن؟ ئایا دەبوو لێگەڕێ ئۆلگا بەپیاو کوژییەکەی بزانێت؟ تەنانەت ئەگەر خۆی بگەیەنایەتە شوێنی سستەرەکە، دەیتوانی لای ئۆلگا پاساو بۆخۆی بهێنێتەوە کە بۆ ئەم ماوە زۆرە لە دڵە ڕاوکێدا بووە؟ چۆن دەیتوانی ئەوەی بۆ ڕوون بکاتەوە کە چۆن هێشتوویەتی ژنە شووشەی دەرمانەکە بەرێت؟ ئەو چەند دەقیقەیەی بەسەر ئەم گومان و ترسەیدا تێپەڕیبوو، بەس بوو بۆ ئەوەی لە بەرچاوی هەر چاودێرێکدا بە بکوژ تۆمەت باربکرێت!

نا، هەرگیز نەیدەتوانی لای ئۆلگا دان بە مانەدا بنێت، ئەی چی پێ بڵێت؟ چۆن دەیتوانی هەستانی کتوپڕی لە سەرمێز و ڕاکردنی بەرەو لایەکی تر بۆ ڕوون بکاتەوە؟

وەلێ ئیدی هەرچییەکی پێ بوتایە چ گرنگییەکی دەبوو؟ بۆخۆی بەم شتە پووچانەوە خەریك دەکات؟ ژیانێك لە مەترسیدا بوو، ئیتر ئۆلگا چۆن بیر دەکاتەوە چ بایەخێکی هەیە؟

دەیزانی تەواوی لێکدانەوەکانی شپرزەن و، چەندە کات دوا بکەوێت ئەوەندە مەترسیی بۆ سەر سستەرەکە لە زیادیە. لەڕاستیدا، ئێستاش هەر زۆر درەنگ بوو، لەوکاتەوەی کەوتبووە بەڵگە داتاشین، ژن و هاوڕێکەی ئەوەندە لە ڕێستورانەکە دوور کەوتبوونەوە ئیتر ئەم نەیدەزانی بۆ کوێ دوایان بکەوێت، چۆن دەیتوانی بزانێت بۆ کوێ چوون؟ بۆ کام لا؟

بەم جۆرە، تەواو لەوە گەیشت ئەمەیش بیانوویەکی ترە، ڕاستە بەخێرایی دۆزینەوەیان کارێکی دژواربوو، بەڵام دەشیا، بۆ کار ئەنجامدانێك زۆری بەسەردا تێ نەپەڕیبوو، وەلێ دەبوو خێرا، پێش ئەوەی زیاتر دوا بکەوێت، کارێك بکرێت.

ئۆلگا دەیوت: "ئەمرۆ، هەر لەوکاتەوەی لە خەو هەستام ڕۆژێکی بەدم پێش هات، زۆر نووستم، درەنگ بەرچاییم کردو، ویستیان خواردنم نەدەنێ، حەوزەکان پڕبوون لە فیلم سازە دەبەنگەکان، زۆرم پێ خۆشبوو ڕۆژێکی قەشەنگ بێت، چونکە دوا ڕۆژی پێکەوە بوونمانە، نازانیت ئەم مەسەلەیەم چەند لا مەبەستە، دەزانیت یاکوب چەندم لا گرنگە؟"

بەسەر مێزەکەدا مووچایەوەو توند دەستی یاکوبی گرت. یاکوب کە نەیدەتوانی هەستی خۆی لە ئۆلگادا کۆبکاتەوە بەزۆر وتی: "مەترسە، ڕەوتی باشە " دەنگێك بەردەوام ئەوەی دەخستەوە یادی کە ژەهرێك لە جانتای سستەرەکەدایەو ئەو بەرپرسیاری مەرگ و ژیانیەتی، دەنگەکە بەردەوام لە ئیستەرەم کردنداببوو، لە هەمان کاتدا ئەوەندە لاوازبوو دەتوت لە چاڵێکی زۆر قووڵەوە دێتەدەرێ.

## -13-

کلیما لە جادەیەکی دارستانەکەدا ڕانندەیی دەکردو، لەوەیش گەیشت گێڕانی ئەمجارەی ڕۆزینا بە ماشێنە لوکسەکەی چ سوودێکی نییە، ڕۆزینا نەیدەهێشت زمانی لووسی ئەو، لە ساردی و بێدەنگییە سەختەکەی دەربهێنێت، ترومپێت ژەنەکە کەوتبووە نێو بێدەنگییەکی قووڵەوە، پاشان کە بێدەنگییەکە زۆری خایاند کلیما وتی: "ئەمشەو دێیت بۆ کۆنسێرتەکە، مەگەر نا؟"

ژنەکە وەڵامی دایەوە "نازانم"

کلیما وتی: "داواکارم بێیت" و، هەواڵی کۆنسێرتەکە بوو بە بەهانەی گفتوگۆیەك بۆماوەیەك بێزارییەکەیان فەرامۆش بکەن، کلیما هەوڵیدا بە

شێوازێکی پێکەنیناوی لە پزیشکە تەپڵ لێدەرەکە بدوێت و، بڕیاریدا باسە چارەنووسسازەکەی لەگەڵ ڕۆزینا دا بۆ شەو دوابخات.

وتی: "هیوادارم دوای کۆنسێرتەکە بتبینم، وەك جاری پێشوو دەبێت کە هەرلێرە مۆسیقام لێدا.."

هەر ئەوەندەی ئەم وشانەی بە دەمدا هات هەستی بە گرنگیان کرد، وەك جاری پێشـــوو واتا دوای کۆنسێرتەکە پێکەوە دەبن، خوای میهرەبان، چۆن تا ئێستا بیری لەم شیمانەیە نەکردبووەوە؟

سەیر بوو، بەڵام تا ئەو چرکە ساتە شیمانەی دووبارە نووستن لەگەڵیدا هەرگیز بە بیریدا نەهاتبوو. سك پڕیی بە جۆرێکی هێورو نادیار گۆڕانی بەسەر شێوەی ڕۆزینادا هێنابوو، گۆڕیبوویە سەر بوونەوەرێك نەك بۆ سێکس بەڵکو پەیوەندی بە دەردەسەری و پەشێوییەوە هەبوو. لە ڕاستیا خۆی ناچارکردبوو دەبێت لەگەڵیدا میهرەبان بێت، ماچی بکات و بیلاوێنێت، بەڵام ئەمە لەڕووی کردەییەوە بێ بایەخ و بێ مانایی تەواویی جەستە بوو، ئەویش هوشیارانە ئەوەی دەکرد.

کاتێك بیری لەمە کردەوە زانی لە چەند ڕۆژی ڕابوردوودا، کە ئەم گوێی بە جەستەی ڕۆزینـا نـەداوە گـەورەترین هەڵـەی کـردووە. بـەڵێ، مەسـەلەکە زۆر ئاشکرا بوو (لەو هاوڕێیانـەی ڕاوێـژی پێکردبوون و سـەرنجیان بـۆ ئـەم لایەنـە ڕانەکێشـابوو ڕقـی هەسـتا) دەبـوو لەگـەڵیا بنوێــت. ئــەم ساردوســڕییە بــەو ڕادەیـەی کـە هـەرگیز چـاوەڕوان نـەدەکرا لای کچەکـەوە دەسـتی پێکـردو کـار لێکردنیشی زۆر گران بوو، سەرچاوەکەیشی دووری بەردەوامی ئەو دوو لەشە بوو لە یـەکتری. لـەناوبردنی منداڵەکـە (گوڵـی منداڵدانـی ڕۆزینـا) بـە مانـای لــەناوبردنی خــودی جەســتە دووگیانەکــە بــوو، ئەمــەیش بەڵگەیــەکی تــری

پەیوەندیدار بوو بەو جەستەیەوە. دەبوو جەستە کچانەکەی ڕۆزینا بکرێت بەگیانی جەستەی دایکانەیدا و ببنە هاودەمی یەکدی.

دوای ئەم لێکدانەوانە لە دەروونیا هەستی بە ئومێدێکی تازە کرد، شانی ڕۆزینای گوشی و بەلایدا چەمییەوە "لە شەڕو بێزاریی نێوانمان قەڵسم، نابێت نائومێدبین، هەمووشتێك چارەدەکرێت، گرنگ ئەوەیە پێکەوەین، لێگەڕێ ئەمشەو بۆخۆمان بێت، وەك ئەو دوا شەوەی پێشوو ئەمشەویشمان خۆش دەبێت"

دەستێکی بە ستێرنەکەوەو دەستەکەی تری کردبووە ملی، ئارەزوویەك لە قووڵایی لەشییەوە بزوت کە دەستی بەر پێستە ڕووتەکەی کەوت و، بەمەیش دڵخۆش بوو.

ڕۆزینا لێی پرسی: "لە کوێ بتبینم؟"

کلیما ئەوەی دەزانی بینینی ڕۆزینا لەدوای تەواو بوونی کۆنسێرتەکە سەرنجی خەڵکی بۆ پەیوەندییە بەهێزەکەیان ڕادەکێشێت؛ بەڵام چاری نەبوو:

"هەر دوای تەواوبوونی کۆنسێرتەکە لە پشتەوەی شانۆکەوە وەرە بۆلام"

**-14-**

کە کلیما بۆ دوا پرۆڤە خێرا گەڕایەوە هۆڵی کۆبوونەوە، ڕۆزینا بە وردی تەماشای ئەملاوئەولای خۆی کرد، کەمێك پێشتر فرانتا بە مۆتۆرسایکلەکەیەوە بە دوایانەوە بوو، لە ئاوێنەی پێشەوەی ئۆتۆمبیلەکەوە دەردەکەوت، وەلێ ون ببوو.

پێی خۆشبوو لە دەست کات هەڵێت، ئەیزانی دەبێت تا سبەی بڕیاری خۆی بدات کە چی دەکات، وەك هەمیشە لە سەرەگێژەدا بوو، لە هەموو دنیادا تەنانەت یەکێك نەبوو ئەم پشتی پێ ببەستێت، خێزانەکەی خۆی پێ نامۆ

بوو، فرانتا خۆشی دەویست، هەر لەبەر ئەمەیش بڕوای پێ نەدەکرد (وەك چۆن مامز بڕوا بە ڕاوچی ناکات) بڕوای بە کلیما نەدەکرد (وەك چۆن ڕاوچی بڕوا بە مامز ناکات) لەگەڵ هاوکارەکانیا دڵسۆز بوو، بەڵام تەنانەت بڕوای تەواوی بەوانیش نەبوو (وەك چۆن ڕاوچی بڕوا بە ڕاوچی تر ناکات) بێجگە لەم چەند هەفتەیەی دوایی کە لەگەڵ هاوڕێیەکی ناوەوەیدا، ئەوەی هەندێك بە مەزنترین بەخششی دادەنێن و، هەیشە تەواو بە پێچەوانەوە لێی دەڕوانێت، لەگەڵ ئەو هاوڕێیەدا کە هەست بە هیچ عەشق و خزمایەتیەکی ڕاستەقینە ناکات کەوتبووە ڕێ، تەنیا و تەنیا ژیانی دابوە بەر. هیچ نەیدەزانی، لێوان لێو بوو لە نەزانین، تەنانەت نەیدەزانی هەنگاوەکانی بەرەوکوێی دەبەن.

لە ڕێستورانی سلاڤیا کە خراپترین خواردنی هەبوو لە شارەکەداو، مەی فرۆشیەکی پیسیش کە خەڵکەکەی ئەوێ بۆ خواردنەوەی بیرەو تف ڕۆکردنە ساڵۆنەکەی بۆ ئەوێ دەچوون، تێ پەڕی. ڕەنگە ڕۆژێك لە ڕۆژان چاکترین ڕێستورانی شار بووبێت و، لەوەی ئەوسا باخێکی چکۆلە و سێ مێزی دارو چەند کورسییەك (سەردەمانێك سووربوون و ئێستا ڕەنگیان کاڵ بۆتەوە) ماوەتەوە، ئەمانە یادگارە خۆش و بەلەزەتەکانی بۆرژوازی بوون. -ئاهەنگ و گۆرانیی نێوباخ، سەما لە هەوای ئازادا و چەتری هەتاوی خاتوونەکان کە بە عیشوەوە پاڵیان دابووە درەختەکانەوە. وەلێ ڕۆژینا کە ژیانی بەسەر باریکە پردۆلکەیەکەوە بەسەردەبرد، کچێك هیچ جۆرە یادوەرییەکی مێژوویی لەبارەی ئەو سەردەمەوە نەدەزانی دەبوو چی بکات؟ ئەو نەیدەتوانی سێبەری چەتری هەتاوی ڕەنگ کاڵەوە بوو ببینێت کە دێر زەمانێك دیمەنێکیان بووە، ئەو تەنیا سێ پیاوی جین پۆش، ژنێکی جوان و بوتڵێك شەرابی دەبینی کە لەسەر مێزە ڕووتەکە دانرابوو.

پیاوێکیان بانگی لێکرد؛ ڕۆزینا گەڕایەوەو دەرهێنەرەکەی ناسی کە چاکەتێکی کۆنی لەبەردا بوو.

پیاوەکە دەستی ڕاوەشاند "وەرە و پێکێکمان لەگەڵدا بخۆوە" ڕۆزینا بە قسەی کرد.

دەرهێنەرەکە ڕۆزینای بە کچێك ناساند کە دەستی بۆ درێژکردبوو و لە ژێر لێوەوە ناوێکی وت "ئەم کچە جوانە ئەمڕۆ لە بەرهەمهێنانی کورتە فیلمێکی ڕووتدا هاوکاری کردین"

ڕۆزینا لەپاڵ دەرهێنەرەکەدا دانیشت، پیاوەکە پەرداخێکی بۆ پڕکرد لە شەراب و لەبەردەمیا داینا.

ڕۆزینا هەستی کرد شتێك دەیەوێت ڕووبدات و ئیتر ناچار نییە بیر لەوە بکاتەوە بۆ کوێ بچێت و چی بکات و بڕیار لەسەر چی بدات، بەمە خۆشحاڵ بوو.

## -15-

دواجار بڕیاریدا، پارەی دایە گارسۆنەکەو بە ئۆلگای وت دەبێت بۆ ماوەیەکی کورت لێی جیا ببێتەوەو پێش دەست پێکردنی کۆنسێرتەکە یەکتر دەبیننەوە. ئۆلگا لێی پرسی چ کارێکی هەیەو یاکوب پێی ناخۆشبوو کە لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت، وەڵامی دایەوە دەبێت سکریتا ببینێت.

ئۆلگا وتی "باشە، دڵنیام کارەکەت زۆرنابات، منیش لەم ماوەیەدا دەڕۆم و جلەکانم دەگۆڕم، سەعات شەش لێرە چاوەڕێتم و بۆ شێو لای منیت"

یاکوب ئۆلگای تا ساختمانەکەی مارکس ڕەوانە کرد، هەر ئەوەندە لە ڕاڕەوەکە کەوتە نەدیوی، ڕووی لە دەرگاوانەکە کرد: "وەك بزانیت ڕۆزینای سستەر لەماڵەوەیە یان نا؟"

دەرگاوانەکە وەڵامی داوە "لە ماڵەوە نییە، کلیلەکەی بەسەر قولابەکەوە دەبینم"

یاکوب وتی: "پێویستە هەر ئێستا قسەی لەگەڵدا بکەم، دەشێت بزانیت لە کوێیە؟"

"نەخێر، نازانم"

"پێش چەند دەقیقەیەك لەگەڵ ترومپیت ژەنەکەی ئەمشەوی کۆنسێرتەکەدا بینیم"

"ڕاستە، دەڵێن سەرەو دەرەیەکیان لەگەڵ یەکدا هەیە، ڕەنگە ئێستا ترومپیت ژەنەکە لە ساڵۆنی کۆبوونەوەدا پرۆڤە بکات"

دکتۆر سکریتا لەسەر شانۆکە لەدوای تەپڵەکەیەوە دانیشتبوو، یاکوبی بینی هاتە ژوورێ و سەری بۆ دانەواند، یاکوب وەڵامی زەردەخەنەکەی دایەوەو، تەماشای ئەو ڕیزە کورسیەی کرد کە دە دوانزە کەس لەوانەی شەیدای جاز بوون لەسەری دانیشتبوون. "بەڵێ: فرانتا- سێبەری کلیما- لە ناویاندا بوو" ئینجا دانیشت و بە ئومێدی ئەوەی ڕۆزینا دەربکەوێت کەوتە چاوەڕوانی.

بیری کردەوە دەتوانێت کوێی تری بۆ بگەڕێت، دەشیا لەو چرکە ساتەدا ڕۆزینا لە گەلێك شوێندا بوایە کە ئەم نەیدەزانین. ئایا دەبوو ئەمە لە ترومپیت ژەنەکە بپرسێت؟ وەلێ دەتوانێت چی پێ بڵێت؟ گریمان لەم نێوانەدا شتێك ڕوویدا بێت؟ ئەوسا چۆن؟ یاکوب بەو ئەنجامە گەیشتبوو ئەگەر ڕۆزینا بمرێت، مردنەکەی هەر بە نهێنی دەمێنێتەوەو، بکوژەکەیشی کە هیچ بەڵگەیەکی بەدواوە نییە هەر بە ناناسرێت. کەواتە بۆ سەرنجی خەڵکی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت؟ بۆ سەرەداوێك بەجێ بهێڵێت؟ بۆ دەرگای گومانێك بکاتەوە؟

بەڵام دوایی کەوتە سەرکۆنەکردنی خۆی، کە ژیانی مرۆڤێك لە مەترسیدا بێت، کاتی ئەم جۆرە کارە ترسنۆکانەیە نییە.

لە وەستانی نێوان دوو پارچە مۆسیقادا هەلی دەستخست و چووە پشت شانۆکەوە، دکتۆر سکریتا بە پێکەنین و شادییەوە گەڕایەوە لای، یاکوب دەستی نایە سەردەمی و بەگوێی سکریتادا چرپاندی کە لە ترومپیت ژەنەکە بپرسێت ئایا دەزانێت سستەرەکە کە کەمێك پێش ئێستا پێکەوە لە ڕێستورانەکە دانیشتبوون لە کوێیە.

سکریتا بۆڵاندی "بۆ هەمووتان ئەوەندە عەلاقەمەندی ئەو سستەرەن؟" و پاشان بە دەنگی بەرز لە ترومپیت ژەنەکەی پرسی "ڕۆزینا لە کوێیە؟" ترومپیت ژەنەکە سوور داگەڕاو پێی گوت نایزانێت.

یاکوب داوای پۆزشی کردو وتی "زۆر خراپە، باشە، گرنگ نییە، با دەستی پرۆڤەتان لێ نەگرم"

دکتۆر سکریتا پرسی: "ئەم تیپە بچووکەمانت بەدڵە؟"

یاکوب وەڵامی داوە "زۆریش" و گەڕایەوە تا لە هۆڵەکەدا دابنیشێت. دەیزانی کارەکەی ڕوو لە خراپییە، ئەگەر بەڕاستی ژیانی کچەکەی لاگرنگ بوو دەبوایە زوو باسی بکردایەو، هەموویانی لەوە ئاگادار بکردایەتەوە تا زووە بە دوایدا بگەڕێن. بەڵام بۆ ئەوەی بیانوویەك بۆ ویژدانی خۆی بێنێتەوە وای دەردەخست کە بەدوایدا وێڵە.

لە زەینیدا دیسان ئەو چرکەساتەی هێنایەوە بەرچاوی خۆی کە شووشە دەرمانەکەی دایەو حەبە ژەهرینەکەی تیابوو، ئاخۆ بەڕاستیی شتەکان ئەوەندە خێرا ڕوویاندا کە دەرفەتی بیرکردنەوە نەبێت؟ ئایا کارەساتەکە بەڕاستیی بەڕێکەوت و بێ ئاگاداری ئەم ڕوویدا بوو؟

یاکوب دەیزانی ئەمە درۆیە، بیری هوشیاری لەو ساتەدا خەوی لێنەکەوتبوو، جارێکی دی دەم و چاوی ژێر قژە زەردەکەی هێنایەوە یادی خۆی و لەوە گەیشت کە حەبە ژەهراوییەکەی نە بەرێکەوت (نە بە هۆی ناهوشیارییەوە) نەداوەتە کچەکە، بەڵکو بۆ دابینکردنی ئارەزوویەکی کۆنینەی بووە، ئارەزوویەك ساڵانێك بوو لە دەرفەتێکی گونجاو دەگەڕا، ئارەزوویەکی هێند بە توانا کە سەر ئەنجام دەرفەتێکی بۆ خۆی ڕەخساندبوو.

بە بێزارییەوە لەسەر کورسیەکەی هەستاو بەپەلە بەرەو ساختمانەکەی مارکس چوو، هێشتا ڕۆزینا لە دەرەوە بوو.

**−16−**

چ حەسانەوەیەکی دڵگیر و چ هەناسەیەکی خۆش! چ دوا نیوەڕۆیەکی بەتام و چێژ لەگەڵ سێ فاوندا[2] !

چ پۆستەرە شیعرێك: ئەو دووانەی بەدوای ترومپیت ژەنە بەدبەختەکەوە بوون لەسەرمێزێك دانیشتبوون، لە بوتڵێکیان دەخواردەوەو، بەوە خۆشحاڵ بوون لەوێ بوون و بۆ تاوێك لەوە ڕزگاریان ببوو بیر لەو بکەنەوە، چ سازانێکی بەتام، چ گونجانێك؟

خانمی کلیما تەماشای ئەوسێ کوڕە لاوەی دەکرد کە سەردەمانێك هاوکاری بوون، وای لێ دەڕوانین دەتوت بە نێگەتیفەکانی خۆیدا دەڕوانێت: مرۆڤێك بوو کۆڵێ خەم و ئازاری بە کۆڵەوە بوو، لەکاتێکدا کە گروپە سێ کەسییەکە نموونەی شاری و بزاوت بوون، ئەو خۆی بە پیاوێکەوە شەتەك دابوو، لە حاڵێکدا ئەو سی فاونە مزگێنی جوامێرییەکی هەمەجۆری پیاوانە بوون.

قسەی فاونەکان ئامانجێکی روونی لە دواوە بوو: بەسەر بردنی ئەو شەوە لەگەڵ دوو ژندا، شەوێك بەسەربردن لەگەڵ پێنج کەسدا پێکەوە، ئەمە ئامانجێکی خەیاڵییە، چونکە ئەوان دەزانن مێردی کامیلا لەوێیە، وەڵێ ئامانجێکی جوانە تا ئەو رادەیەی ئەوان هەوڵی بۆ ئەدەن و ئەیشزانن نایگەنێ.

کامیلا دەیزانی چ ئامانجێکیان هەیە، بە ئاسانی خۆی دایە دەست ئەو ئامانجە، بەتایبەت کە بێجگە لە ئارەزوویەك، گەمەیەك، زیندەخەونێك زیاتر هیچی تر نەبوو، بە قسە سەیرەکانیان پێکەنی، لەگەڵ کچە نەناسراوە هاوبەشەکەیدا گاڵتەیەکی هاندەریان دەکردو، هیوای دەخواست ئەو بەشە شانۆگەرییە درێژە بکێشێت تا لە بینینی ژنە نەیارەکەی و رووبەڕووبوونەوەی هەقیقەتەکە دووربکەوێتەوە.

شووشەیەك شەرابی‌تر، هەموو شادمان، هەموو سەرخۆش بوون و، مەستیەکەیان نەك لەبەر شەراب، بەڵکو لەبەر ئەو حاڵ و دۆخە تایبەتیەی خۆیان‌و مەیلی بەردەوام بوونی ئەو شەوق و زەوقە بوو کە زوو بەسەردەچێت.

کامیلا هەستی کرد دەرهێنەرەکە لە ژێر مێزەکەوە پێ بەپێی چەپیدا دەنێت، زۆرباش ئاگادار بوو، بەڵام قاچی لانەبرد، ئەوە پێککەوتنێکە هەستێکی هاوبەشیان تیا دروست دەکات، وەڵێ دەشیا ئەویش رێکەوت بێت، یان رەنگە گوێی پێ نەدابێت چونکە کورەکەی لا سووکە، کەواتە، لێککەوتنێکە تەواو لەنێوان سنووری پاکیەتی و پیسیەتیدایە، کامیلا نایەوێت بەسەر ئەو سنوورەدا بازبدات، بەڵام شادمانە بەوەی توانیویەتی هەستی پێ بکات.

(تا ئەم شوێنە زۆر لاوازەی کە ئازادیە کتوپڕەکە پێیداوە) بەوەیش زۆر دڵخۆش بوو کە ئەو هێڵە ئەفسوناوییە لەخۆیەوە ببێتە ئاماژەی تری گفتوگۆ،

ببێتە دەست بازی و گەمەی دی، کامیلا حەزدەکات شەپۆلەکە بۆ زۆر دوور بیداتە بەر. پاکیزەییە نادیارەکەی لەو سنوورە پڕ لە بزاوتەی بپارێزێت.

دەرهێنەرەکە جوانی و شۆخیە سەرنج ڕاکێشەکەی کامیلا خەجاڵەتی کردبوو، لەسەرخۆو بە پارێزەوە بەرەو پێش دەچوو، بە پێچەوانەوە، جوانییە ئاساییەکەی ڕۆزینا زیاتر تین و توانای ڕاستەوخۆی بە وێنەگرەکە دەبەخشی، دەستی کردبووە ملی.

کامیلا سەیری دەکردن، زۆر دەمێك بوو لە نزیکەوە جووڵەی جەستە غەریبەکانی لەگەڵ یەکترا نەدیبوو. تەماشای دەستی پیاوەکەی کرد بەسەر مەمکی کچەکەوە، هەڵی دەگلۆفت و یاری پێ دەکرد. تەماشای دەموچاوە کرەکەی ڕۆزینای کرد کە چۆن خۆی بە دەستەوە دابوو، کات بە خۆشیی تێدەپەڕی.

کامیلا وتی: "پێم خۆشە کەمێك ئەمشەو بەخۆشی بەسەربەرم" دەرهێنەر وتی: "هیوادارم شەیتان ئەو ترومپێت ژەنەت لێ بسێنێت"

هاوکارەکەی دووبارەی کردەوە "هیوادارم شەیتان لێت بسێنێت"

## —17—

لەو ساتەدا ڕۆزینا ئەوی ناسی، بەڵێ، خاوەنی ئەو وێنەیە بوو کە هاوڕێکەی پێی نیشاندابوو، لەپڕا دەستی وێنەگرەکەی دایە دواوە.

وێنەگرەکە بە بێزارییەوە وتی: "چیتە؟"

دیسان ویستی لێی نزیك بێتەوەو دووبارە ئەو نەیهێشت. ڕۆزینا هاواری بە سەریا کرد "چۆن وا لە خۆت ڕا دەبینیت!"

دەرهێنەرەکە و یارمەتیدەرەکەی پێکەنین، یارمەتیدەرەکە لێی پرسی: "ئەوە بەڕاستتە؟"

ڕۆزینا به گرژییەوە وەڵامی دایەوە "بێگومان بەڕاستمە"

یارمەتیدەرەکە تەماشای سەعاتەکەی کردو بە وێنەگرەکەی وت: "سەعات شەشی ڕێکە، ئیتر بۆیە بارەکە بەو شێوە تازەیە گـۆڕا چونکـە هاوڕێکـەمان لەسەری سەعاتە جووتەکاندا دەبێتە خوشکێکی پـیرۆز، بۆیـە دەبێـت خـۆت بگریت تا سەعات حەوت"

دایانە قاقای پێکەنین، ڕۆزینا لەشەرما سوور داگەڕا، لەکاتێکدا بە دەست گەورەترین نەیاری خۆیەوە گیری خواردبوو، هەموویان پێیان ڕادەبوارد.

دەرهێنەرەکە بە وێنەگرەکەی وت "ڕەنگە بتوانیت داوا لەم خانمە جوانە بکەیت ئەم جارەیان ئاوارتە (استثناء) قبوول بکات و شەش بە ژمارەی تاك دابنێت"

یارمەتیدەر وتی: "تۆ وای بیر لێ ناکەیتەوە بۆ ئەوەی ژمارە شەش بکرێتە ژمارەیەکی تاك پێویستی بە تیوریزە نەبێت؟"

دەرهێنەر وتی: "بێگومان، ئەقلیوس لە پەیامە بەناوبانگەکەیدا ئاشکرا دەڵێت لە هەلومەرجی تایبەتی و زۆر نادیاردا، ژمارەی جووت تایبەتمەندی ژمارەی تاك وەرئەگرێت. من وا هەست ئەکەم بە تەواوی لەناو ئەو هەلومەرجە نادیارە داین"

"چاکە، ڕۆزینا تۆ چی دەڵێیت؟ ڕازیت بـۆ تـەنیا جـارێك شـەش بکەینـە ژمارەی تاك؟"

ڕۆزینا هەر بێدەنگ بوو.

وێنەگرەکە سەری لێ نزیك خستەوە "ڕازییت؟"

هاوکارەکەی وتی: "خانمی جوان بێدەنگە، دەبێت ئێمە ئەوە دیاری بکەین کـە بێدەنگییەکـە لـە قـایل بوونەوەیـە یـان نـا؟" دەرهێنـەر وتـی: "دەتوانـین بیخەینە دەنگەوە"

یارمەتیدەرەکــەی وتــی: "ڕاســتە، لــەبارەی ئــەم مەســـەلەیەوە دەنــگ وەردەگرین: دەڵێین بێدەنگی ڕۆزینا دەبێت بەو مانایە لێکبدرێتەوە کە لەم بارەی ئێستادا دەشێت ژمارە شەش بە ژمارەیەکی تاك قبووڵ بکرێت، کامیلا یەکەم کەس تۆ ڕای خۆت بڵێ"

کامیلا وتی: "من وا دەزانم دەشێت ڕۆزینا قبووڵی بێت"

"ئەی جەنابی دەرهێنەر تۆ؟"

دەرهێنــەر بــە دەنگێکــی لەســەرخۆی خۆشــەوە وتــی: "مــن بێگومــانم لــەم بارودۆخەدا ڕۆزینا ژمارە شەش بە ژمارەی تاك وەردەگرێت"

یارمەتیدەر وتی: "وێنەگر لە مەسەلەکە سوودمەندە و پێویست ناکات ڕا بدات، خۆیشم، من دەڵێم وایە، بۆیــە بــە ســێ دەنــگ گەیشــتووینەتە ئــەوەی بێدەنگی ڕۆزینا نیشانەی ڕەزامەندییەتی، جەنابی وێنەگر: بەم پێیە تۆ بۆت هەیە لەسەر کارەکەت بەردەوام بیت" وێنەگرەکە بەلای ڕۆزینادا لاربووەوەو دەستی خستەوە سەرمەمکی، ڕۆزینا زیاتر لە جاری پێشوو بەرگری لەخۆی کردو بە سەریدا قیژاندی "چنگە پیسەکانت لادە"

کامیلا بۆ خاو کردنەوەی دۆخەکە وتی: "ڕۆزینــا، ئــەو تــۆی زۆر خــۆش دەوێت و خۆی پێ ناگیرێت، ئێمەیش پێمان خۆشبوو.."

چەند چرکەیەك پێش ئێستا ڕۆزینا زۆر هەڵچووبوو، خۆی دابووە دەست کارەسات و ڕووداوەکان، وەك بیەوێت چارەنووسەکەی بە ڕووداوێکی ڕێکەوت لە قەڵەم بدەن، تەنیا لەبەر ئەوەی لەو گێرمەو کێشەیە هەڵبێت کە تێی کەوتبوو. ڕێگەی دابوو تەفرەی بدەن، بیوروژێنن، گرنگ نەبوو تا کوێ، ڕێگەی دەدا بیوروژێنن، گرنگ نەبوو بەچی.

هەرچۆنێك بێت، دیاربوو ئەو ئایندەیەی ئومێدی پێ بەستبوو، نەك بەڵێن و ئومێد، بەڵکو تەواو ناهەمواربوو. ڕۆزینا -کە لەبەردەم نەیارەکەیدا گاڵتە و

سووکایەتی پێکرابوو– زانی تاقە شتێك هەیە پەنای بۆ بەرێت، تەنیا شتێك مایەی ئاسوودە بوون و ڕزگارییەتی: بەرهەمەکەی نێو مندالدانی.

هەموو بوونی (جارێکیتر! جارێکی تر!) بۆ ناوەوە، بەرەو قوولایی لەشی پاشەکشەی کرد و بڕیاریدا ئەو بوونەوەرەی کە بەهێوری لە ناوەوەیدا دروست دەبێت هەرگیز لێی جیا نەبێتەوە. ئەوە مایەی سەرکەوتنی نهێنی بوو کە زیاد لەوانەی پێی پێدەکەنین و دەستە پیسەکانیشیان پلەی ئەم بالاتر ڕادەگرێت، پەرۆشی ئەوە بوو ڕووداوەکەیان بۆ باس بکات، بە ڕوویاندا بدات، تۆلەی زۆری گالتە و سووکایەتی پێکردنەکەی لەو ژنە بکاتەوە.

بیری کردەوە کە دەبێت ئارام بێت، دەستی بۆ جانتاکەی برد تا شووشەی دەرمانەکەی دەربێنێت، هەر ئەوەندەی کە دەریهێنا، دەستێکی بەهێز مەچەکی گرت.

**—18—**

هیچ کەسێك بە هاتنەکەی نەزانیبوو، ئەو کتوپڕ لەوێ بوو، ڕۆزینا سەری بلندکرد و بینی پیاوەکە بە دەمیەوە پێدەکەنێت، پیاوە هەر دەستی گرتبوو، ڕۆزینا هەستی بە توند گرتنەکەی دەستی کردو شل بوو، شووشەی حەبەکان دووبارە کەوتەوە نێو جانتاکەی.

"بەڕێزان، ڕێم بدەن لاتان دابنیشم، ناوم بارتلیفە"

هیچ یەکێك لە پیاوانی دەوری مێزەکە هاتنی ئەو پیاوە بێگانەیەیان لا خۆش نەبوو، کەسیان ئەرکی خۆ پێ ناسینیان بۆ نەکێشا، ڕۆزینایش دەم و دووی ئەنجامدانی ئەو ڕەوشە کۆمەلایەتییانەی نەبوو، بارتلیف وتی: "وا هەست ئەکەم لە هاتنم دلگران بن" کورسییەکی تەنیشتی هەلگرت و هێنایە لای مێزەکەوە، جۆرێك ڕووبەڕووی هەموو ئەوان و لای چەپی ڕۆزیناوە بوو،

کەوتەوە قسە کردن: "بمبوورن، من ڕەوشێکی سەیرم هەیە، پێش ئەوەی بەدەم ڕێگاوە بمبینن یەکسەر دەر ئەکەوم"

یارمەتیدەرەکە بە تووڕەییەوە وتی: کەواتە تۆیش دەمانبەخشیت ئەگەر وەك ڕەوتەنیەکی ڕووت تەماشات بکەین و گوێت پێ نەدەین"

بارتلیف بەحاڵ ئەدەبێکی نواند و وەڵامی دایەوە: "بە خۆشحاڵییەوە ئەو ڕێگایەتان پێ دەدەم، بەڵام بەداخەوە بە هەموو هەوڵێکتانەوە سەرناکەون"

ئەنجا بەرەو لای دەرگای چێشتخانەکە ئاوڕی دایەوەو چەپڵەیەکی لێدا.

وێنەگرەکە وتی: "بە هەرحاڵ کێ بە تۆی وتووە بێیتە لای ئێمە دابنیشیت؟"

"دەتانەوێت پێم بڵێن جێم لای ئێوە نییە؟ من و ڕۆزینا دەتوانین هەر ئێستا بڕۆین و ئێرە بەجێ بێڵین، بەڵام ئاسان نییە واز لە شتێك بێنیت کە لەگەڵیا ڕاهاتبیت، من ئاسایی هەموو عەسرانێك لەسەر ئەم مێزە دادەنیشم و پێکێك شەراب دەخۆمەوە" تەماشای چەسپی بوتڵەکەی کرد کە لەسەر مێزەکە دانرابوو، خوێندییەوە. "هەڵبەت، خواردنەوەکەی من لەمە باشترە"

یارمەتیدەرەکە وتی: "حەز ئەکەم بزانم لەم کوندڕەدا چ خواردنەوەییەکی باش دەست دەکەوێت"

وێنەگر وتی: "جەناب، پێ دەچێت زۆر بەخۆت بنازیت" ئەو کە دەیویست میوانە ناوەختەکە بداتە بەرکلکان، لەسەر قسەکەی ڕۆشت "بێگومان لە تەمەنێکی تایبەتیدا پیاو هیچی پێ نامێنێت بێجگە لەوەی کە خۆی بنوێنێت"

بارتلیف وەك گوێی لە گاڵتە پێکردنەکەی وێنەگر نەبووبێت وتی: "تۆ هەڵەیت، لەم ڕێستوورانەدا جۆرە خواردنەوەیەك هەڵگیراوە لە گرانترین ئوتێلدا دەست ناکەوێت"

دوای کەمێك بەڕێوەبەری میوانخانەکە دەرکەوت و دەستیان لەناو دەستی یەکترنا، پێشتر خۆی نیشان نەدابوو، وەلێ ئێستا خۆشهاتنی بارتلیفی کردو پرسی: "دەبێت مێزێکی شەش کەسیتان بۆ ئامادە بکەم؟"

بارتلیف وەڵامی دایەوە "بێگومان" و پاشان ڕووی لە میوانەکانی کردو وتی: "بەڕێزان، حەز ئەکەم لەو شەرابەدا بەشداریم بکەن کە زۆرجار لێم خواردۆتەوەو هەمیشە بە لامەوە زۆر چاکبووە، ئایا ئەو شانازییەم پێ دەبەخشن؟"

کەس وەڵامی نەدایەوە، بەڕێوەبەری میوانخانەکە وتی: "ئەگەر ڕێگام بدەن پێم خۆشە لەوەتان دڵنیا بکەم کە لە مەسەلەی خواردن و خواردنەوەدا، بەتەواوی لە بارتلیفی بەڕێز دڵنیابن و پشتی پێ ببەستن"

بارتلیف بە بەڕێوەبەری میوانخانەکەی وت: "هاوڕێم، دوو بوتڵ شەراب و دەورییەکی گەورە پەنیرمان بۆ بێنە" ئەنجا ڕووی تێکردنەوەو وتی: "پێویست بە دوودڵی ناکات، هەموو هاوڕێکانی ڕۆزینا هاوڕێی منن"

کوڕێکی منداڵکار کە دوانزە ساڵی پڕ نەکردبووەوە، بە سینیەکەوە کە پەرداخ، دەوری و دەستەسڕی سفرەی لەسەر بوو لە چێشتخانەکەوە دەرکەوت، سینیەکەی لەسەر مێزەکەی تەنیشت داناو پەرداخەکانی پێشترو بوتڵە نیوە خاڵییە شەرابەکەی خستنە سەر، بە دەستەسڕەکە سفرەی مێزە پیسەکەی بە وردی پاککردەوەو پاشان ڕومێزییەکی سپی و زۆر پاکژی ڕاخست، دووبارە پەرداخەکانی پێشووی هەڵگرت و لەبەردەم میوانەکانی دانایەوە.

بارتلیف بە کوڕەکەی وت: "پەرداخە پیسەکان و سرکە کۆنەکە لابەرە، باوکت شەرابی ڕاستەقینەمان بۆ دێنێت" وێنەگرەکە ڕەتی دایەوە "بەڕێز، پێت ناخۆش نییە خۆمان چیمان پێ خۆشە ئەوە بخۆینەوە؟"

بارتلیف وەڵامی داوە "چۆنت لا خۆشە وا، هاوڕێی ئازیزم، من حەزم بەوە نییە بەزۆر خۆشی بەسەر خەڵکیدا بسەپێنم، هەموو کەسێك بۆی هەیە شەرابە گەنیلەکەی خۆی بنۆشێت، بۆی هەیە لەگەڵ دەبەنگی و چنگۆڵە پیسەکانیا سەرگەرم بێت" ڕووی لە کوڕژیلەکە کرد "گوێ بگرە کوڕم، پەرداخە کۆنەکان و بوتڵەکەی پێشوو لەسەرمێزەکە بهێڵەرەوە، میوانەکانی من ئازادن شەرابێك هەڵبژێرن کە لە تەمدا پێگەیشتووە یان شەرابێك کە کوڕی خۆرە"

زۆر زوو لە بەردەم هەریەکێکیاندا دوو پەرداخ دانرا: پەرداخێکی پاك و پەرداخێك هێشتا پاشماوەی شەرابەکەی پێشووی پێوە بوو، خاوەن میوانخانەکە بە دوو بوتڵ شەرابەوە هاتە سەر مێزەکە، یەکەمیانی خستە نێوان هەردوو ئەژنۆی و بەزۆر سەرەکەی هەڵپچڕی، کەمێکی کردە پەرداخەکەی بارتلیفەوە. بارتلیف پەرداخەکەی بۆ دەمی برد، قومێکی لێداو بە خاوەن میوانخانەکەی وت "ناوازەیە، هی ساڵی بیست و سێیە؟"

خاوەنی میوانخانە وتی: " بیستودوو".

بارتلیف وتی "دەتوانن تێکەن" و خاوەنی میوانخانە بە دەوری مێزەکەدا گەڕاو هەموو پەرداخە پاکەکانی پڕکرد.

بارتلیف بە نەزاکەتەوە پەرداخەکەی لە دەست گرت و بەرزی کردەوە "هاوڕێیان، هیوادارم ئەم شەرابە تام بکەن، تامی خۆشی ڕابوردوو ئەدات، وای بچێژن وەك شەربەتی هاوینە کە دەمێکە لە بیرچۆتەوە، بەم نۆشینە، دەمەوێت ڕابوردوو بە ئێستاو خۆری ساڵی 1922 بە خۆری ئەم چرکەساتە تێکەڵ بکەم، ئەم خۆرە ڕۆزینا، ئەو کچە شەرمن و دڵ سادەیەیە کە بێ ئەوەی بزانێت، شازادەیەکە، وەك گەوهەرێك وایە لە بەرگی گەدایەکدا، بەرانبەر بەم شارۆچکە تاریکە دەدرەوشێتەوە، مانگێکە ئاسمانی بێ ڕەنگی ڕۆژ

فەرامۆشیکردووە، پەروانەی دەشتێکە بەفر داپۆشیبێت" وێنەگرەکە بەزۆر زەردەخەنەیەکی خستە سەر لێوی "بەڕێز زۆرت پێوە نەناوە؟"

بارتلیف وەڵامی دایەوە "نەخێر، هیچم پێوە نەناوە" ڕووی لە وێنەگرەکە کرد "تەنیا لە دیدی تۆوە وایە، چونکە تۆ گیاکەڵەیەکی تفت و تاڵ، سرکەیەکیت ڕەنگی مرۆڤی گرتووەو هەمیشە لە خوار ژیانی ڕاستەقینەوەیت، پڕیت لە ترشەڵۆك، ترشەڵۆکێك وەك مەنجەڵی کیمیاگەر لە دەروونتاندا دەکوڵێت، حەز لەوە دەکەیت هەموو دەوروبەرت وەك ناوەوەت قێزەون بێت، تەنیا لەم ڕێگایەوە دەتوانن بۆ ماوەیەکی کورت جۆرێك لە ئاشتی و ئاسوودەیی لە نێوان خۆتان و دنیادا هەست پێبکەن، ئەمە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئەم دنیا جوانە، لە بەرچاوی ئێوە وەحشەتناکە، ئازارتان دەداتێ و بە هیچتان نازانێت. پیسی نینۆکەکان لە کاتێکدا کە خاتوونێکی جوانمان لە لا دانیشتبێت، کەس ناتوانێت بەرگەی بگرێت، بۆیە وای بە پێویست دەزانیت ئەو ژنەی دەتەوێت لەزەتی لێ وەربگریت لە پێشا ئابڕووی بەریت. ئایا پیاوی چاك ڕاست ئەکەم؟ خۆشحاڵم کە دەتەوێت دەستت لە ژێر مێزەکەدا بشاریتەوە، دیارە ئەو کاتەی لەبارەی نینۆکی پیسەوە دەدوام، ڕاستییەکەم پێکابوو"

وێنەگرەکە بە لە خۆبایی بوونەوە وتی "من کەمترین بایەخ بە ئەتەکێت و ڕێوڕەسمی تۆ نادەم، بەم یەخەی سپی و بۆینباخە شیکەتانەوە وەك تۆ لێبووك نیم"

بارتلیف وتی "نینۆکی پیس و چاکەتی دڕاوی بەر هەتاوتان شتی تازە نین، دەمێك پێش لە ئێستا فەیلەسوفێکی کەلبی ڕەوش بەو هیوایەی هەموو دەست خۆشی ئەوەی لێبکەن کە گوێ بە ئەتەکێت و خووڕەوشتی باونادات، بە چاکەتێکی کون کونەوە بە ئەسینادا دەگەڕا، کە سوکرات تووشی هات پێی

وت: "لە کونەکانی چاکەتەکەتەوە فیزو لووت بەرزیت دەبینم، ئازیزی بەڕێز، پیسییەکەت لە خۆبایی بوون و لەخۆبایی بوونت پیسییە"

ڕۆزینا بەزۆر توانی بەسەر سەرسووڕمانەکەی خۆیدا زاڵ بێت. ئەو پیاوەی کە بە سادەو وەك نەخۆشێك دەیناسی، لە ناکاوێکدا ببووە سوارچاکێکی ئازا، لەسەرخۆی و بوێری و سەنگینی ڕەفتارو زیرەکییە زۆرەکەی بەتەواوی سەرنجی ڕاکێشابوو، هەر بەو هۆیەیشەوە توانیبووی بەسەر خۆ پەسەندیی وێنەگرەکەدا زاڵ بێت.

بارتلیف دوای چەند چرکەساتێك بە وێنەگرەکەی وت: "پێم وایە نازانیت بڵێی چی، حەز ئەکەم باوەڕ بکەیت نەمویستووە ئازارتان بدەم، من عاشقی گونجانم نەك ڕەنجان، ئەگەر لەسەر ڕەوان بێژییەکەم زۆرم دەست داگرتبێت داوای لێبووردن ئەکەم، بەڕاستیی تەنیا شتێك کە مەبەستمە ئەوەیە تامی ئەم شەرابە بکەن و، بەخۆشی ڕۆزینکاوە[3] کە من لەبەرخاتری ئەو هاتوومەتە ئێرە، لەگەڵما بینۆشن"

بارتلیف جارێکیتر پەرداخەکەی بەرزکردەوە، بەڵام کەس پەیڕەویی لێنەکرد.

بارتلیف وتی "جەنابی خاوەن میوانخانە، فەرموو لەگەڵما بنۆشە"

خاوەنی میوانخانەکە بەدەم هەڵگرتنی پەرداخێکی پاکەوە کە لە سەرمێزەکەی پاڵیا بوو پڕی لە شەراب کرد، وەڵامی دایەوە: "شەرابی وا هەمیشە مایەی خۆشییە، جەنابی بارتلیف لە بواری شەرابی چاکدا پسپۆڕە، ئەو بۆنی گەنجینەکەمی کردو وەك مار خۆی بۆ کێشا"

بارتلیف وەك پیاوێك ڕیابازیان بۆ کردبێت پێکەنی. "ئایا بە خۆشیی ڕۆزینکاوە لەگەڵماندا دەنۆشیت؟"

خاوەنی میوانخانەکە پرسی: "بەخۆشیی ڕۆزینکاوە؟"

بارتلیف كه سەری بەلای ڕۆزینكادا چەماندبوەوە وتی: "بەڵێ، بەخۆشی ڕۆزینكاوە، ئایا تۆیش بەڕادەی من خۆشت دەوێت؟"

"جەنابی بارتلیف، تۆ هەمیشە لە گەمارۆی ژنانی جواندایت، ئەگەر چاویشم ببەستنەوە دەزانم ئەو كچە گەنجەی لەبەرئەوەی لاتەوە دانیشتووە دەبێت جوان بێت"

بارتلیف دیسان دایەوە قاقای پێكەنین، خاوەنی میوانخانەكەیش پێكەنی و، سەیر ئەوە بوو كامیلایش كە هەر لە سەرەتاوە بارتلیفی خۆش هاتبووە بەرچاو پێكەنی. ئەم پێكەنینە بێ پێشینەیە بە شێوەیەكی سەیر و چاوەڕواننەكراو تەشەنەی كرد، دەرهێنەرەكەیش هاوبەشییەكی بە ئەدەبانەی پێكەنینەكەی كامیلای كردو، هاوكارەكەیشی بەودا ڕاگەیشت و، سەرئەنجام ڕۆزینایش پێكەنی، پێكەنینێكی گەلێك بەتام و چێژ لە نێو دەنگی پێكەنینەكانی تردا، ئەوە تاقە چركەساتی بێ خەمیی تەواویی ڕۆژەكەی بوو، دەنگی پێكەنینەكەی لە هەموویان بەرزترو توانای ئەوەی نەبوو بەر لە هەراوزەناكەی خۆی بگرێت.

بارتلیف پێشنیازی پێكێكی تری كرد: "بە سلامەتی ڕۆزینا" خاوەن میوانخانەكە پەرداخەكەی بڵند كرد، كامیلا، دەرهێنەرو یارمەتیدەرەكەیشی پێكیان بەرزكردەوەو هەموو لەگەڵ بارتلیفدا وتیانەوە "بە سلامەتی ڕۆزینا" تەنانەت وێنەگرەكەیش پەرداخەكەی بڵندكردو بێدەنگ هەڵیدا. دەرهێنەرەكە قومێكی چەشت و وتی "بەڕاستیی یەكەمە" خاوەن میوانخانەكە پێكەنی و وتی: "پێم نەوتن!"

لەو میانەدا مێرد منداڵەكە دەورییەكی پڕ لە پەنیرە جۆراوجۆرەكانی لە ناوەڕاستی مێزەكە دانا، بارتلیف وتی "فەرموون، پەنیرێكی زۆر باشە"

دەرهێنەرەکــە بــە سەرســووڕماوییەوە وتــی "چ حەشــرێکە! وا دەزانم گەڕاومەتەوە فەرەنسا"

ئیدی تەنگژەکە بە تەواویی نەمابوو، هەموو لــە گاڵتــە و گــەپدابوون، نموونەی گشت پەنیرەکانیان تاقیکردەوەو لەوەیش سەریان ســووڕما کــە خاوەنی میوانخانەکە (لە وڵاتێکدا کە ئاسایی پەنیر کەمە) چۆن توانیویەتی ئەو هەموو جۆرە ئامادە بکات و، دیسانەوە پێکەکانیان دووبارەو سێ بارە کردەوە.

لە گەرمــەی شادی و مەستی هەمووواندا، بارتلیف بە ڕێزەوە هەستایە ســەرپێ: "لــەخزماتتاندا خۆشــم لێ گوزەشــت و ســوپاس گــوزارم، دکتــۆر سکریتای هاوڕێم ئەمشەو کۆنسێرتی هەیەو، ڕۆزیناو من دەمانەوێت گوێ بیستی بین".

—19—

بارتلیف و ڕۆزینا کەوتنە ناو تەمە تەنکەکەی سەر لە ئێوارەوە، گیانی مەستیی کە وادەی سەفەرێکی بەتامی نێو دوورگە حەرامەکانی بە هەموویان دابوو وردە وردە پاشەکشەی بەرەو نەگەڕانەوە کرد، لە ناکاوێکدا هەموو زۆر دڵتەنگ بوون.

خانمی کلیما وای هەست کرد لە خەونێك وەدەرنراوە کە تەواو حەسرەتی بوو هەر تێیدا بێت، ئەو وای بیر کردبوەوە کە هەر پێویست نییە بڕواتە کۆنسێرتەکە، ئەوەی خستبووە سەرییەوە ئەگەر لە ناکاوێکدا پەی بەوە بەرێت کە دوای مێردەکــەی نەکــەوتووە، بــەڵکو بــۆ سەرکێشــی هاتۆتــە ئاوەکانزاییەکان کارێکی سەرسووڕهێنەر دەردەچێت، مانەوە لەگــەڵ ســێ سینەمایی و گەڕانەوەی سبەینێی بۆ ماڵەوە چەندە بە چاك دەگەڕێت. شتێك

هەمیشە پێی دەگوت ئەوەی پێویستە بیکات بریتیە لە: پێش دەستییەکی گونجاو، پێش دەستییەك بە مانای ئازاد بوون، ڕێگایەك بۆ هەتوانی خۆی و بەزاندنی ئەو تەلیسمەی لە ژێریایەتی.

وەڵێ ئێستا زیاد لە پێشوو هوشیاربوو، ئەفسوونەکە کاریگەریی نەمابوو، دیسان لەگەڵ خۆیدا، لەگەڵ ڕابوردووی و سەری قورسی پڕ لە بیرکردنەوەو ئازاری کۆنیا تەنیا مایەوە. پێی خۆشبوو هیچ نەبێت خەونە زوو تێپەڕەکەی چەند سەعاتێکی تر بەردەوام بوایە، وەڵێ دەیزانی خەونەکە وەك ڕەنگی شەفەق لە ڕەوینەوەدایە.

وتی: "دەبێت منیش بڕۆم"

ئەوان ویستیان پەشیمانی بکەنەوە، بەڵام زانیان بۆ هێشتنەوەی نە فێڵێکیان بە دەستەوەیەو نە بڕوایەکیان بە خۆ هەیە.

وێنەگرەکە وتی "نەعلەت! بەڕاست ئەم کابرایە کێ بوو؟"

ویستیان ئەو پرسیارە لە خاوەن میوانخانەکە بکەن، وەڵێ لەوساوە بارتلیف ڕۆشتبوو ئیدی کەس بە لایاندا نەهاتبوو، لە ڕێستوورانەکەوە دەنگی میوانە سەرخۆشەکان دەهات و، تیپەکەو کامیلا بە غەمبارییەوە لەپاڵ شەرابە نیوەکراوو دەورییە پەنیرەکە لە باخەکەدا دانیشتبوون.

"هەر کەسێك بێت دانیشتنەکەی لێ تێکداین، یەکێك لە ژنە جوانەکانی بردو ئەمیشیان دەیەوێت بڕوات، با کامیلا بگەیەنین"

کامیلا وتی "نا، داوای لێبوردنتان لێ دەکەم، ئێوە هەر لێرەبن و من خۆم بە تەنیا دەڕۆم"

ئیدی لە گەڵیاندا نەبوو، وردە وردە لێیان بێزار دەبوو، ئیرەیی تەواو وەك مردن، لە پڕاو بە سەختی گەمارۆیدا، کەوتە ژێر چنگی و گرنگیی بە چ شتێکیتر نەدا، هەستا، هەمان ئەو ڕێگایەی لە بەرگرت کە پێشان ڕۆزینا و

بارتلیف پیایدا ڕۆیشتبوون، له دوورەوه گوێی له دەنگی وێنەگرەکه بوو که دەیگوت "نەعلەت له..."

—20—

یاکوب و ئۆلگا پێش دەستپێکردنی کۆنسێرتەکه چوونه ژووری خۆ گۆڕینه بچوکەکەوە که بۆ مۆسیقاژەنەکان ئامادە کرابوو تا داوای سەرکەوتن بۆ سکریتا بخوازن. پاشان له هۆڵەکەدا دانیشتن، ئۆلگا به هیوای ئەوە بوو له کاتی پشوودانا ئەوێ بەجێ بێڵن تا لەگەڵ یاکوبدا پاشماوەی شەوەکه پێکەوە به خۆشی بەسەر بەرن، یاکوب بەوە قایل نەبوو، وتی ڕەنگه سکریتای هاوڕێی به ڕۆشتنیان دڵگیربێت، وەلێ ئۆلگا لەوە دڵنیابوو که سکریتا تەنانەت ئاگای له ڕۆشتنەکەیشیان نابێت.

هۆڵەکه تا ڕادەیەك پڕو ئەوانیش له سەردوو کورسی خاڵی ڕیزی خۆیاندا دانیشتن.

که دانیشتن ئۆلگا بەگوێی یاکوبیدا چرپاند "ئەو ژنه به درێژاییئەم ڕۆ وەك سێبەر به دوامەوە بووە"

یاکوب له لاشانی ئۆلگاوە به تیلەی چاو تەماشای ئەو چەند کورسییانەی ئەولاتری کرد که بارتلیف و سستەرەکه به شووشه دەرمانه شوومەکەوە که له جانتاکەیدا بوو دانیشتبوون. دڵی لەرزی، بەڵام لەبەر ئەوەی تەمەنێکی لەسەر دان بەخۆداگرتن له حاڵەتی دەروونیدا بەسەر برد بوو، به تەواوی له سەرخۆییەوە وتی: "ئێمه لەو ڕیزەداین که به بەلاش سکریتا بلیتەکانی بۆ هاوڕێکانی ناردووە، کەواته ئاگادارە له کوێدا دانیشتووین و ئەگەر بڕۆین پێمان دەزانێت".

ئۆلگا وتی "دەتوانیت پێی بڵێیت دەنگ بە چاکی نەدەگەیشتە لامان و ناچار بووین شوێنەکەمان لە ناو هۆڵەکەدا بگۆڕین"

لەوکاتەدا، کلیما کە ترومپیتێکی زێڕی بە دەستەوە بوو هاتە سەر شانۆو دەنگی چەپڵە ڕێزانی بینەران بەرزبووەوە، دوای ئەو دکتۆر سکریتا هات، چەپڵە ڕێزانەکە توندتر و شەپۆلی هەراو زەنای ناو تەلارەکە زیاتر بوو، دکتۆر سکریتا خاکیانە لەپشت ترومپیت ژەنەکەوە وەستابوو، ئاماژەیەکی ناشیانەی بە دەستی کرد تا لە خەڵکەکە بگەیەنێت ئەستێرەی ڕاستەقینەی کۆنسێرتەکە میوانێکە لە پایەتەختەوە هاتووە، ئەو ئاماژە ناشیانەو سەرنج ڕاکێشە کاردانەوەیەکی زۆری لەسەر بینەران داناو، یەکێك لە پشتەوەی هۆڵەکەوە هاواری کرد "بژی دکتۆر سکریتای خۆمان"

پیانۆژەنەکە کە لە دووانەکەی دی کەمتر ئافەرین و چەپڵەی بەرکەوت، لە پشت پیانۆکەیەوە دانیشت، دکتۆر سکریتا لەدوای ڕیزێك تەپڵی بە شکۆوە دانیشت و، ترومپیت ژەنەکە بە هەنگاوی ژیکەڵەو هێور بەرەو لاکەی تری شانۆکە چوو.

دەنگی چەپڵەو ئافەرین لێکردن کپ ببوو، پیانۆ ژەنەکە پەنجەی نابووە کلیلەکاندا و بە تەنیا سەرەتاکەی دەست پێکردبوو، وەڵێ یاکوب سەرنجیدا پزیشکەکەی هاوڕێی سەراسیمەیەو بە نیگەرانییەوە لە دەوروبەری خۆی دەڕوانێت، ترومپیت ژەنەکەیش لە سەراسیمەیی دکتۆر تێگەیشت و چووە پاڵی، سکریتا شتێکی بە گوێیدا چرپاندو پاشان هەردووکیان چەمینەوەو کەوتنە لێکۆڵینەوەیەکی وردی سەرشانۆکە، تا لە دواییدا ترومپیت ژەنەکە تووڵی تەپڵەکەی دایەوە دەست سکریتا کە لە خوار پیانۆکەوە کەوتبوو.

دانیشتوان کە بە وردی لەسەر شانۆیان ڕوانی بوو کەوتنەوە چەپڵە لێدان و ئافەرین کردن، پیانۆ ژەنەکە کە وای دەزانی ئافەرین و هاندانەکە بۆ قەدر

زانییە لەو پارچە مۆسیقایەی لە سەرەتاوە لێیداوە، بە دەم سوپاس و سەردانەواندنەوە بەردەوامبوو لەسەر ژەندنەکەی.

ئۆلگا باسکی یاکوبی گرت و بە گوێیدا چرپاند "ناوازەیە، هێند ناوازە دڵنیام ئەمە چرکەساتی کۆتایی پێهاتنی بەدبەختیەکانمانە"

سەرئەنجام ترومپیت و تەپڵەکە پەیوەندییان بە پیانۆکەوە کرد، کلیما هاو ئاهەنگ لەگەڵ هەنگاوە گونجاوەکانیدا کەوتە ترومپیت لێدان و سکریتایش وەك بودایەکی شکۆمەند لە پشت تەپڵەکانەوە دانیشتبوو.

یاکوب ویستی ئەوە لای خۆی بەرجەستە بکات ئەگەر سستەرەکە لە ناوەڕاستی کۆنسێرتەکەدا و لە ناکاوێکدا بیەوێت حەبەکە بخوات، هەر لەو کاتەیشدا دکتۆر سکریتا بەرانبەر بە دەست خۆشی لێکردن و چەپڵە ڕێزانی خەڵکەکەدا هەر لە تەپڵ کوتاندا بێت، سستەرەکە بەدەم ئازارو گینگڵ دانەوە لە هۆش بچێت و لەسەر کورسییەکەی بمرێت چی ڕوودەدات.

کتوپڕ لەوە گەیشت کە بۆ بلیتی هەمان ڕیزیان بەو کچە داوە: بەرێکەوت یەکتر بینینی پێشتریان لە هەمان ڕۆژو لە ڕێستوورانەکەدا، هەڵفریوانێك، تاقیکردنەوەیەك بوو، تەنیا بۆ ئەوە ڕوویدا بوو کە حەقیقەتی خۆی ببینێت: ژەهر خواردکردنی هاوڕەگەزێکی، بەڵام داهێنەری تاقیکردنەوەکە (خوایەك کە ئەم بڕوای بە بوونی نەبوو) داوای هیچ قوربانییەکی وا گەورەی نەدەکرد، خوێنی هیچ بێ گوناهێکی نەدەویست. تاقیکردنەوەکە لەگەڵ مەرگدا نەبوو، بەڵکو بۆ ناسینی دەروونی یاکوب و، بۆ ڕزگارکردنی بوو لەو لووت بەرزییە ئەخلاقییە گوناهکارانەیەی کە هەیبوو. سستەرەکە بۆیە لە هەمان ڕیزی ئەمدا دانیشتبوو کە بتوانێت لە دوا چرکە ساتی ژیانیدا بە فریای بکەوێت، بۆیە هەر بەرێکەوت ئەو پیاوەیش کە لەگەڵیا بوو هاوڕێی ئەم و دەبوو هاوکاریی بکات.

بەڵێ، لە چاوەڕوانی یەکەم دەرفەتدا، دەشێت بکەوێتە یەکەم پشوودانی نێوان کۆنسێرتەکەوە، داوا لە بارتلیف دەکات لەگەڵ ڕۆزینادا بڕواتە دەرەوە، لەوێ هەموو شتێکی بۆ ڕوون دەکاتەوەو ئیدی ئەم شێتێتیە سەیرە کۆتایی پێدێت.

مۆسیقارەکان پارچەی یەکەمیان تەواوکرد، دانیشتوان چەپڵەیان کوتا، سستەرەکە وتی: "داوای لێبوردن ئەکەم" و لەگەڵ بارتلیفدا بەرەو ڕاڕەوەکە بەڕێکەوت، یاکوب ویستی هەستێت و دوایان بکەوێت، وەلێ ئۆلگا دەستی گرت و نەیهێشت "نا، تکایە ئێستا مەڕۆ، تا کاتی پشوودانەکە خۆت بگرە"

شتەکان لەوە خێراتر دەکەوتنەوە کە ئەم چاوەڕێی بوو، مۆسیقارەکان کەوتنە لێدانی پارچەی دووەم و، یاکوب هەستی کرد ئەو کەسەی ئەمی تاقی دەکردەوە بۆ ڕزگارکردنی نەبوو، بەڵکو بۆ نابوود کردنی و سەلماندنی تاوانەکانی بوو دوور لە هەر شك و گومان لێکردنێك، هەر بۆیە لەسەر کورسییەکی هەمان ڕیزدا ڕۆزینای دانیشاندبوو.

ترومپیت ژەنەکە هەر بەو جۆش و خرۆشەوە فووی پیادە کرد، لە دوایەوە دکتۆر سکریتا وەك بودایەکی بە تواناو شکۆمەند لە پشت تەپڵەکانەوە دانیشتبوو، یاکوبیش وەك شەپڵە لێی دابێت، نە ترومپیت ژەنەکەی دەبینی و نە دکتۆر، تەنیا هەر خۆی ئەبینی، خۆی وەك شەپڵە لێدراوێك کە نەیدەتوانی چاو لەو دیمەنە ترسناکەی خەیاڵی بگوێزێتەوە.

—21—

هەرکە دەنگی خۆشی ترومپیتەکەی جۆشی سەند کلیما وای هەست کرد تەنیا خۆی لەسەر شانۆیەو هۆڵەکەی پڕ لە دەنگ و ئاواز کردووە، هەستی کرد بە توانایەو شکست ناخوات، ڕۆزینا لەو ڕیزە کورسییەدا کە بۆ

بانگراوەکان تەرخان کرابوو لەپاڵ بارتلیفەوە دانیشتبوو (ئەمەیش شانسێکی باشی کتو پڕبوو بوو) هەموو شتەکان ڕوو لە چاکی بوون، دانیشتوان بە شەوقەوە گوێیان گرتبوو. خۆشیو پەسەندکردنی ئاشکرایان حاڵ و هەوای خۆشبینانەی کلیمایان زیاتر بەهێز دەکرد. لە گەرمەی یەکەمین دەست خۆشی و چەپڵە ڕێزاندا، کلیما بە بزاوتێکی هێورو دڵگیر ئاماژەی بۆ دکتۆر سکریتا کرد کە ئەو شەوە زۆری لە لا خۆشەویست و ئازیز بوو. دکتۆر لە شوێنەکەی هەستاو سەری ڕێزی دانەواند.

وەلێ لە سازدانی بەشی دووەمدا، کاتێك کلیما تەماشای ناودانیشتوانی کرد زانی ئەو کورسییەی ڕۆزینای لەسەر دانیشتبوو خاڵییە، ئەمە بێ حەوسەڵەی کرد، ئیتر بەدەم دڵەڕاوکێوە سازەکەی لێدەدا و زۆر بە وردییش هەموو کورسییەکانی تەماشا دەکردو نەیدەبینی، وای بە بیردا هات ڕۆزینا بڕیاری داوە ئامادەی لای لیژنەی منداڵ خستنەکە نەبێت و بە دەستی ئانقەست هۆڵەکەی بەجێهێشتووە تا خۆی لە گفتوگۆی زیاتر لەو بارەیەوە بپارێزێت، دەبێت لە دوای کۆتایی هاتنی کۆنسێرتەکە کوێی بەدوادا بگەڕێت، ئەگەر نەیدۆزێتەوە چی بکات؟

زانی خەریکە بە هەستێکی پەرت و بێ ناوازەوە خراپ ترومپیتەکەی لێدەدات، بەهەرحاڵ، خەڵکەکە پێیان پەسەندو لەگەڵ هەر پارچە مۆسیقایەکدا زیاتر هەستیان دەوروژاو ئاگاداری سازە بێ گیانەکە نەبوون.

ویستی وای لە قەڵەم بدات کە دەشێت بۆ حەسانەوە چووبێتە سەر ئاو، ڕەنگە تووشی بێ تاقەتی هاتبێت کە زۆرجار ژنانی دووگیان تووشیان دێت. کە نزیکەی نیو سەعات بەسەر دیار نەمانەکەی ڕۆزینادا تێپەڕی، بەخۆی وت دەشێت گەڕابێتەوە ماڵێ بۆ ئەوەی شتێك بێنێت و بەپەلە جارێکیتر بگەڕێتەوە جێگاکەی، بەڵام کاتی پشوودان نزیك بە تەواو بوون و،

کۆنسێرتەکەیش بەرەو کۆتایی و کورسییەکەی ئەویش هەر خاڵی بوو. دەشێت پرکێشی ئەوە نەکات لە ناوەڕاستی ئاهەنگەکەدا بێتەوە هۆڵەکە، بڵێی لە کاتی شەپۆلی چەپڵە ڕێزان و دەست خۆشی لێکردندا پەیدابێت؟

بەڵام چەپڵە و دەنگی ئافەرین لێکردن کۆتایی هات و ڕۆزینا هەر دیارنەبوو، خەریکبوو کلیما نائومێد دەبوو، دانیشتوان هەستانە سەرپێو بەدەنگی بەرز هەستی خۆیان دەربڕی. دووبارە، دووبارە. کلیما گەڕایەوە لای دکتۆر سکریتا، بۆ نیشاندانی ئەوەی کە ئیتر ناتوانێت مۆسیقا لێبدات سەری ڕاوەشاند، وەلێ ڕووبەڕووی دووچاوی درەوشاوە بوەوە کە دەیویست بە درێژایی ئەو شەوە هەر تەپڵ لێبدات.

ئامادەبووان قایل نەبوونی کلیمایان بەوە وەرگرت کە نازو نوکێکی هەمیشەیی ئەستێرە دیارەکانە، بۆیە زیاتر و زیاتر کەوتنە چەپڵە لێدان. لەو کاتەدا ژنێکیگەنج و جوان ڕێگای خۆی بەرەو ڕیزی پێشەوە کردەوە، کە کلیما ژنەکەی بینی لەوەدا بوو ببوورێتەوە، ژنەکە زەردەخەنەی بۆ دەکرد، دەیوت: (نەیدەتوانی گوێی لە وشەکانی بێت، بەڵام وشەکانی بەسەر لێوییەوە دەخوێندەوە) "بەردەوامبە، لێدە، تکات لێدەکەم لێدە".

کلیما ئاماژە بەوەی کە پارچەیەکی تریش ساز دەکات، ترومپێتەکەی بڵندکرد، دانیشتوان تەواو بێدەنگ بوون.

دوو هاوکارە مۆسیقا ژەنەکەی کلیمایش زەردەیان هاتە سەر لێو و دووبارە کەوتنەوە ئاهەنگ گێڕان، کلیما وای هەست کرد لە ناو دەستەیەکی پرسە گێڕاندا ساز دەژەنێت، لە پشت تابووتەکەی خۆیەوە مارش لێدەدات، کەوتە لێدان و زانی ئیدی هەموو شتێکی لە دەستچووە، کارێك نەماوە بیکات بێ لەوەی کە چاوی بنووقێنێت، دەستی خۆ بەدەستەوەدان بەرزبکاتەوەو لێگەڕێ چارەنووس بۆ کوێی دەبات بیبات.

—22—

لەسەر مێزی خواردنەوەکەی بارتلیف ژمارەیەکی زۆری بوتڵ بە چەسپی ڕەنگاوڕەنگی دەرەوە ڕیزکرابوون. ڕۆزینا ئاشنایەتی لەگەڵ دۆخێکی وادا نەبوو، داوای ویسکی کرد چونکە تاقە ناوێك بوو کە لەو بوارەدا دەیزانی.

لەو کاتەدا دەیویست خۆی لە پەرتی و سەرەگێژییەکەی ڕزگار بکات و شتێك لە بارو دۆخەکە تێبگات. چەند جارێك لێی پرسیبوو، هەرچەندە زۆریش ئاشنای یەکدی نەبوون بۆ هاتبووە سۆراخی، بەردەوام لێی دووبارە دەکردەوە "دەمەوێت بزانم چۆن وا لە پڕێکدا بڕیاری بینینی منت دا؟"

بارتلیف لە حاڵێکدا کە چاوی لە ناوچاوی بڕیبوو، وەڵامی دایەوە "دەمێك بوو دەمویست ئەم کارە بکەم"

"بەڵام بۆ لە هەموو ڕۆژەکاندا ئەمڕۆت هەڵبژارد؟"

"چونکە هەر شتێك کاتی گونجاوی خۆی هەیە، ئەمڕۆ کاتی ئێمە گەیشتبوو"

ئەمانە وشەگەلێکی تەمومژاوی بوون، وەلێ ڕۆزینا هەستیکرد زرنگەیەکی ڕاستیان تیایە، باری نالەباری ئەمڕۆی هێند بەگێر و گران بوو کە بە ئاسانی هەڵنەدەگیراو هەر دەبوو شتێك ڕووبدات.

بە دەم بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە وتی "ڕاستە، ئەمڕۆ ڕۆژێکی سەیربوو"

بارتلیف لەسەرخۆ پێی وت "تۆ خۆیشت دڵنیایت کە لە کاتێکی باشدا گەیشتم"

ڕۆزینا هەستێکی نادیار بەڵام خۆش و هێوری تێگەڕا! گەیشتنی بارتلیف لە کاتی گونجاوی خۆیدا دەبێت وا لێك بدرێتەوە کە تێکڕا ئەوەی ڕوودەدات، لە دەرەوەڕا دەستپێشکەری و ڕێگای بۆخۆش دەکرێت، بۆیە ئەم هەقیەتی ئارام بێت و خۆی بداتە دەست هێزێکی باڵاتر.

"بەڕاستی، تەواو لە کاتی خۆیدا گەیشتی"

"دەزانم"

بەمەیشەوە هێشتا لە شتێك نەگەیشت "ئەمە بۆ؟"

"چونکە خۆشم دەوێیت"

ئەم قسانە زۆر لەسەرخۆ کران و بەوەیشەوە دەتوت ژوورەکەیان پڕکردووە.

دەنگی ڕۆزیناش هێور بوو "منت خۆش دەوێت؟"

"بەڵێ، عاشقی تۆم"

فرانتا و کلیماش هەر وشەی خۆشەویستیان بەکارهێنابوو، بەڵام ئێستا، کاتێك بە جۆرێکی چاوەڕواننەکراو، بێ داواکاری و ڕووتوقووت دەوترێت، تەواو لە گوێیدا زرنگەی دێت، خۆشەویستی وەك مووجیزەیەك لە دەرگاوەژوور کەوتبوو، بێئەوەی بزانم چ لێکدانەوەیەك هەڵبگرێت. وەلێ بە پێچەوانەی ئەوەی دەیلێین لە هەموو شتێکی پێ ڕاستتر گەڕا، چونکە ئەوەی لە ژیاندا شتی هەرە بنەڕەتییە بێ ئاڕاستەکردن و، بێ ئەنگێزە هاتوونەتە کایەو، بەڵگەی بوونیان لە ناوەوەی خۆیاندایە.

ڕۆزینا وتی "بەڕاست؟" دەنگیشی- ئەگەرچی ئاسایی هەندێك ڕەق و بەرز بوو- وەك کڕوزانەوەیەك بەرگوێ دەکەوت.

"بەڕاست"

"بەڵام من کچێکی زۆر ئاساییم"

"نا، وانیت"

"بۆ، وام"

"تۆ جوانیت"

"نا، جوان نیم"

"تۆ میهرەبانیت"

سەری ڕاوەشاند "نا"

"پاکی و میهرەبانیت لێ دەچۆڕێت"

بە دەم سەر ڕاوەشاندنەوە "نا، نا، نا"

"من تۆ باش دەناسم، لە خۆت زیاتر"

"نامناسیت"

"بۆچی، دەتناسم"

ئـەو دڵنیاییـەی لـە نیگـای بارتلیفـەوە پرشـنگی دەدا ئاسـوودەییەکی ئەفسـووناوی هـەبوو، ڕۆزینـا حـەزی دەکـرد ئـەو نیگـا عاشـقە تـا بتوانێـت بیشوات و لە ئامێزی بگرێت.

"بەڕاست من وام؟"

"بەڵێ، وایت، من دەیزانم"

هەموو شتێك تا سنووری سەر بەگێژهاتن جوانبوو، لە چاوی بارتلیفەوە ڕۆزینـا، خـۆی دلۆڤـان، میـهرەبان، پـاکژ و وەك شـازادەیەکی مـەزن دەبینـی، هەستی وابوو وجودی پڕە لە هـەنگوین و گیـا بـۆن خۆشـەکان، بـە ئاسـانی دەیتوانی عاشقی خۆی بێت. (خودایا، پێشان هەرگیز هەستێکی لەو بابەتـەی تێ نەگەڕابوو، بەم ئەندازە خۆشە هەستی بە بوونی خۆی نەکردبوو)

هێشتا هەر ڕێبڕی دەکرد "بەڵام تۆ من زۆر ناناسیت!"

"دەمێکـە دەتناسـم، دەمێکـە چـاودێریت دەکـەم، وەلێ تـۆ هـەرگیز پێـت نەزانیوە، بەتەواوی دەتناسم" سەری پەنجـەی بـە ڕوومـەتیا دەهێنـا، "لووتـت، بزەی هێند جوانت، قژت..." بارتلیف کەوتـە کردنـەوەی دوگمـەکانی یەخـەی و ڕۆزینا چ بەرگرییەکی نەکرد. تەواو لە ناوچاوی ڕامابوو، لەو نیگا سـەیرەی کـە وەك ڕووبـاری پـاك و شـیرین لـەخۆی دەگـرت، بـە مەمکـە ڕووتەکانیـەوە

بەرانبەری دانیشتبوو، مەمکە قووتەکانی کە ئارەزووی تەماشاو پیا هەڵدانیان هەبوو. هەموو لەشی وەك گوڵە بەڕۆژە کە بەرەو ڕووی خۆر دەگەڕێت، ڕووی لە نیگاکانی بارتلیف بوو.

**—23—**

لە ژووری یاکوب دانیشتن، ئۆلگا لە بارەی شتێکەوە دەدواو یاکوب بیری لای ئەوە بوو کە هێشتا کارەکە بە بەرییەوە ماوە: دەیتوانی جارێکی دی بڕواتە ساختمانەکەی مارکس و ئەگەر ڕۆزینا لەوێ نەبێت، بۆ ئاپارتمانەکەی دراوسێی تەلەفۆن بۆ بارتلیف بکات و هەواڵێکی بزانێت.

ئۆلگا هەر قسەی دەکردو یاکوبیش بیری لەو دیمەنە ناخۆشە دەکردەوە کە لە دوای دۆزینەوەی سستەرەکەوە بۆی پێش دێت، کە بە دەم منە من و زمان گرتن و پۆزش هێنانەوەوە داوای لێ دەکات حەبەکەی بۆ بگێڕێتەوە. لە پڕا، وەك ئەو خەیاڵانەی چەند سەعاتێکە لە گەڵیاندا چنگاوش بووە ماندوویان کردبێت، هەستی گوێ پێ نەدانێك هەموو گیانی داگرت.

ئەم پشتگوێ خستنە تەنیا لەبەر ماندوویەتیەکەی نەبوو، بەڵکو پشتگوێ خستنێکی هوشیارانە و شەڕ ئەنگێزانە بوو. یاکوب وای تێگەیشت کە ژیان و مردنی ئەو کچە قـژ زەردە لای ئەو بایەخێکی کەمیشی نییە، ئەم هەوڵی ڕزگارکردنەیشی، بێجگە لە ڕیابازی و گاڵتەجاڕی هیچی تر نییە. لەڕاستیا ئەو کەسەی دەیەوێت ئەم تاقی بکاتەوە فریوی دەدات، چونکە ئەو کەسەی لە تاقیکردنەوەی ئەمدایە دەیەوێت یاکوبی ڕاستەقینە بناسێت نەك یاکوبی درۆ. یاکوبیش بڕیاریدا بەرانبەر بەوەی تاقیدەکاتەوە ڕاستگۆ بێت. کەسە ڕاستەقینەکەی خۆی بێت.

بەرانبەر بە یەكتری، لەسەر دوو كورسی دانیشتن، مێزێكی چكۆلەیان لە ناوەڕاستا بوو، یاكوب ئۆلگای بینی كە لەودیو مێزەكەوە بەرەو لای ئەم نوشتایەوە، گوێی لە دەنگی بوو: "دەمەوێت ماچت بكەم"

—24—

خانمی كلیما دوو دڵ و تووڕە، بەزۆر زەردەخەنەیەكی خستبووە سەر لێوی و بەرەو ساڵۆنی پشوودانی هونەرمەندەكان بۆ لای مێردەكەی چوو، لەوە دەترسا رووی ڕاستەقینەی دۆستی مێردەكەی ببینێت، بەڵام چ دۆستێكی لێ نەبوو، یەك دوو كچۆڵە پلكابوونە دەوری كلیماوەو داوای ئیمزایان لێدەكرد، زوو لەوە گەیشت (چاوی لە چاوی باز حەساستر بوو) كە هیچ یەكێك لەو كچۆڵانە ئاشنایەتیەكی تایبەتیان لەگەڵدا نییە، بەڵام دەیزانی دۆستی مێردەكەی لە ڕێگایەكی هێند دوور نییە، ئەمەی لە ڕەنگی پەڕیوو شێواوی كلیماو ئەو زەردەخەنەیەوە دەستگیر بوو كە بەڕادەی زەردەخەنەكەی خۆی بەزۆر كەوتبووە سەرلێوی.

دكتۆر سكریتا، خاوەنی دەرمانخانەو چەند كەسێكی دی كە پێدەچوو پزیشك بن، لەگەڵ هاوسەرەكانیاندا خۆیان بە كامیلا ناساند، یەكێكیان پێشنیازی كرد بڕۆنە بارەكەی ئەوبەر شەقامەكەوە كە تاقە بار بوو هێشتا كرابێتەوە. كلیما قایل نەبوو وتی زۆر ماندووە، كامیلا وای بەبیرداهات كە دەشێت دۆستەكەی لەوێ بێت و چاوەڕێی ئەم بكات بۆیە مێردەكەی ئەم هەڵوێستەی نواند.

لەبەر ئەوەیش كە كارەساتی ناخۆش هەمیشە وەك موگناتیس بۆلای خۆی دەیكێشێت داوای لە كلیما كرد لەبەر خاتری ئەو لە بڕیارەكەی پاشگەزبێتەوە.

بەڵام لە بارەكەیشدا ژنێكی وانەبوو گومانی ئەوەی لێبكرێت پەیوەندی لەگەڵ كلیمادا هەبێت، لەسەر مێزێكی گەورە دانیشتن، دكتۆر سكریتا كەوتە چەنەبازی و ستایشێكی زۆری ترومپیت لێدەرەكەی كرد، خاوەن دەرمانخانەكە شەرمن و گەلێك شادمان و بێدەنگ بوو، كامیلا هەوڵیدا هێورو سەرنج ڕاكێش بێت، بە سكریتای وت "دكتۆر، تۆ زۆر زۆر باش بوویت، تۆیش، خاوەنی دەرمانخانەی ئازیزم هەروا بوویت، دۆخێكی ڕاستگۆیانە، شادو خۆش بوو، هەزار جار لە كۆنسێرتەكانی پایتەخت دڵگیرتر بوو"

بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ تەماشای بكات تەنانەت چركە ساتێكیش لە چاودێری كردنی دانەبڕا، هەستی كرد كلیما بۆ شاردنەوەی بێزارییەكەی زۆری هەوڵ دەداو تەنیا بۆ شاردنەوەی ئەوەی كە بیری لە جێگایەكی ترە جارجارە باری سەرنجێكی دەردەبڕی. لێی ڕوونبوو هاتنی ئەم بەرنامەكەی ئەوی، كە بەرنامەیەكی گرنگیش بووە لێ تێكداوە، ئەگەر مەسەلەكە ئاسایی بوایە (كلیما هەمیشە سوێندی بۆ دەخوارد كە هەرگیز ناتوانێت ژنێكی تری خۆش بوێت) هەرگیز بەم جۆرە نەدەپەشۆكاو نائومێدی دای نەدەگرت. ڕاستە ئەم دۆستەكەی نەدیبوو، وەلێ دڵنیابوو كە شەیداییەكەی (شەیداییەكی پڕ لە ماندووبوون و ڕەگاژوو) دەبینێت و ڕەنگە ئەم دیمەنە ئازاراوی تر بێت.

لە ناكاودا خاوەنی دەرمانخانەكە، ئەو پیاوەی لەسەرخۆ و میهرەبان و بێدەنگبوو، بەسەر سووڕماوییەوە وتی "جەنابی كلیما، چیتانە؟"

ترومپیت ژەنەكە وەڵامی دایەوە "هیچ نییە، بەڕاستیی هیچ نییە، تەنیا كەمێك سەرم دێشێت"

خاوەن دەرمانخانەكە وتی "حەبی هێوركەرەوەت بدەمێ؟"

كلیما سەری ڕاوەشاند "نا، نا، سوپاست دەكەم، بەڵام ئەگەر كەمێك لەپێش ئێوەدا ڕۆیشتین لێمان ببوورن، بەڕاستیی زۆر نەخۆشم"

-25-

چۆن وا بەم دواییە پڕکێشی کارێکی وای کرد؟

لەوکاتەوەی لە ڕێستوورانەکە لەگەڵ یاکوبدا پێك گەیشتبوون، پیاوێکی جیاواز دەهاتە بەرچاوی، یاکوب کەم دوو بەڵام شایستە، پەرێشان حاڵ، بەڵام تەواو وردو هوشیاربوو، بیری لە جێگایەکی دی بوو کەچی ئۆلگا هەرچییەکی بویستایە ئەنجامی دەدا، هەر ئەو پەرێشانی حاڵیەیشی (ئۆلگا ئەمەی بە ڕۆیشتنەکەی دەرەوەی وڵاتییەوە دەبەستەوە) لە دیدی ئەمەوە شایستە بوو، لەگەڵ دەموچاوە ماتەکەیدا دەدوا، دەتوت لە شوێنێکی چۆڵدا قسە دەکات و کەس گوێی لێ نییە، بۆیە دەیتوانی شت گەلێکی پێ بڵێت کە پێشتر هەرگیز پێی نەوتبوو.

پاشان وای بەبیردا هات کە بە داوای ماچکردنەکە، ناڕەحەتی کردووەو تووشی دڵەڕاوکە هاتووە، وەلێ ئەمە ساردی نەکردەوە، بە پێچەوانەوە، تەنانەت ئەمەیشی لاخۆشبوو: وەك ئەنجام هەستی کرد ئەو ژنە بوێرو سەختەیە کە خۆی هەمیشە حەزی پێدەکرد، ژنێك کۆنترۆڵی دەوروبەرەکەی دەکات، دەیهێنێتە بزاوت، دۆستەکەی دێنێتە جۆش و بە پەرۆشەوە تەماشاو پەرێشانی دەکات.

ئۆلگا زۆر بە پەرۆشەوە لەنێو چاوی دەڕوانی و، بەدەم زەردەخەنەوە پێی وت "بەڵام لێرەدا نا، سەمەرەیە بە سەرمێزدا بنوشتێینەوە تا یەکدی ماچ بکەین، بابڕۆین"

دەستی یاکوبی گرت، بەرەو دیوانەکەی بردو خۆشیی لە ڕەفتارە جوانەکەی خۆی هات، شۆخی و کۆنترۆڵە هێمنەکەی، پاشان ماچی کرد و ئەمەندە بە شەیداییەوە ڕەفتاری لەگەڵدا کرد کە هەرگیز بە خۆیەوە نەدیبوو، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەمە شەیدایی و خرۆشی ڕەمەکیی جەستەیەك نەبوو کە

<u>جڵـەوی لـە دەسـت دابێـت، بـەڵکو شـەیدایی مێشـك بـوو، شـەیداییەکی هوشیارانەو دەستی ئانقەست.</u>

بـە دڵ حـەزی دەکـرد بـەرگی باوکایـەتی لەبـەری یـاکوب دا بدڕێـت، بیجوڵێنێت و لە هەمانکاتدا چێژ لە پەشۆکانی ئەو وەربگرێت، ویستی داگیری بکات، تامی زمانی بچێژێت و هەست بەو دەستی باوکایەتیە بکات وردە وردە دەکەونە پڕکێشی کردن و یاری لەگەڵ کردنی.

<u>ئۆلگا دوگمەی چاکەتەکەی یاکوبی کردەوەو لەبەری دایکەند.</u>

**—26—**

بە درێژایی کۆنسێرتەکە چاوی تێ بڕیبوو، پاشان تێکەڵی ئەو خەڵکە زۆرە بوو کە بۆ ئیمزا وەرگرتن بە شەوق و خۆشییەوە بۆ سەرشانۆکە دەچوون، بەڵام ڕۆزینا لەوێ نەبوو، پاشان کەوتە دوای کۆمەڵێك کە ترومپیت ژەنەکەیان بەرەو مەیخانەیەك دەبرد، لە گەڵیاندا چوە ژوورێ، لەوە دڵنیابوو کە ڕۆزینا لەوێیەو چاوەڕێی ترومپیت ژەنەکەیە، وەلێ بەهەڵەدا چووبوو، دیسان گەڕایەوە سەر شەقامەکەو، ماوەیەکی زۆر بە بەردەم مەیخانەکەدا هاتوچۆی کرد.

هەستی بە ئازارێکی لەناکاو کرد: ترومپیت ژەنەکە لەگەڵ ژنێکدا کە تەواو خۆی پێوە نوساندبوو لە بارەکە هاتە دەرێ، لە سەداسەد لەوە دڵنیابوو کە ڕۆزینایە، بەڵام دەرکەوت ژنێکی ترە.

تا ساختمانەکەی ڕیچموند چاودێری کردن، کلیما و ژنە نەناسەکە لە ناو ساختمانەکەدا ونبوون.

بەپەلە بەلای باخەکەدا تێپەڕی و بەرەو ساختمانی مارکس ڕێی لەبەرگرت، هێشتا دەرگاکانیان دانەخستبوو، لە دەرگاوانەکەی پرسی ڕۆزینا گەڕاوەتەوە، وەڵامی دایەوە هێشتا نەگەڕاوەتەوە.

دووبارە خێرا بەرەو ساختمانی ڕیچموند بەڕێکەوت، لەوە دەترسا کە دەشێت لەو ماوەیەدا ڕۆزینا بە کلیما بگات، سەرو خواری باخچەکەی دەکرد و چاوی بە دەرگای ساختمانەکەوە دورا بوو، نەیدەزانی چی ڕوودەدات، گەلێك بیرۆکە بەسەریا تێپەڕین، بەڵام سوور بوو لەسەر ئەوەی کە هەستەکانی لە جێگایەکدا کۆبکاتەوە، بە تەواوی گوێ ڕادێرێت، چاودێر بێت و هێند ئارام بگرێت تا یەکێکیان دەردەکەوێت.

ئەمە بۆ؟ ئەم چاودێری کردنە چ کەڵکێکی هەیە؟ ئایا باشتر نەبوو بگەڕێتەوە ماڵەکەی و ناو پێخەفی نووستنەکەی؟

ئەو بڕیاریدا بوو هەر دەبێت بگاتە حەقیقەت. بەڵام ئایا بەڕاستیی دەیویست لە حەقیقەتەکە بگات؟ ئایا بەڕاستیی دەیویست بێ هیچ گومان و مەزەندەیەك ئەوە بزانێت کە ڕۆزینا لەگەڵ کلیمادا نوستووە؟ ئایا بە پێچەوانەوە حەزی بەوە نەبوو بەڵگەیەکی لەسەر پاکیزەیی ڕۆزینا دەست بکەوێت؟ وەلێ لەچوارچێوەی بەدگومانیە زەینیەکەیدا ئایا بڕوای بە بەڵگەیەکی لەو بابەتە دەکرد؟

بەڕاستیی نەیدەزانی چاوەڕێی چییە. تەنیا ئەوەی دەزانی ئامادەیە بۆ ماوەیەکی درێژ، گەر پێویست بکات هەموو شەوەکە و، تەنانەت شەوانی زیاتریش چاوەڕێ بێت. مرۆڤی حەسوود پەی بەوە دەبات زەمان هێند خێرا تێدەپەڕێت کە بڕوا ناکەیت. ئیرەیی لە هەرکارێکی تری زەینی دی زیاتر بیر داگیر دەکات، تەنانەت بۆ چرکە ساتێکیش بۆشایی نییە، ئەوانەی دەبنە قوربانیی ئیرەیی هەرگیز نازانن بێتاقەتی و دڵتەنگی چییە.

فرانتا بەردەوام بوو لەسەر هاتوچۆی سەر ئەو بەشەی شەقامەکە کە بە زەحمەت سەد هەنگاوی تەواو دەکرد و لەوێوە بەشی پێشەوەی ساختمانی ریچموند دیاربوو، بڕیاری دابوو ئەگەر هەموویش بخەون، ئەو بەدرێژایی شەو سەروخواری ئەو ڕێگایە بکات، ناچارە تا ڕۆژ دەبێتەوە لەو کارە نەکەوێت.

باشە بۆ هیچ نەبێت دانانیشێت؟ بەرانبەر ساختمانەکەی ریچموند ڕیزێك کورسی هەیە.

ناتوانێت هێورو بێدەنگ دابنیشێت، ئیرەیی وەك دان ئێشە وایە، تەنانەت مۆڵەتی لەسەرخۆ دانیشتنیش بە مرۆڤ نادات، تەنیا ڕۆیشتن لە سەرەوە بۆ خوارێ، لە خوارێوە بۆ سەرێ.

—27—

ئەو ڕێگایەی پێشتر بارتلیف و ڕۆزینا، یاکوب و ئۆلگا بڕیبوویان گرتیانە بەر: بە پلیکانەکاندا بۆ قاتی دوو، پاشان بەدرێژایی فەرشە سوورە ئەشرافیەکە تا کۆتایی ڕاڕەوەکە. دەرگای ئاپارتمانەکەی بارتلیف ڕێك بەرانبەر بوو، ژووری یاکوب لای ڕاستەوەو ئەو ژوورەش کە دکتۆر سکریتا دابوویە کلیما لای چەپەوە بوو. دەرگاکەی کردەوەو بەئاگا لە تەماشاکردنە خێراکەی کامیلا بە دەوروبەری ژوورەکەدا، گڵۆپی داگیرساند، ئەو ڕوانینەی دەناسی: بەدوای شوێنەوارو نیشانەی ژنێکدا دەگەڕا، زۆر چاك ئەوەی دەناسی. دەیزانی ئەو ڕاستی لەگەڵ ناکات، دەیزانی هاتووە بۆ پیلان گێڕان، دەیزانی ئەو وا خۆی دەردەخات کە بۆ شادکردنی ئەم هاتۆتە ئێرەو بەڵام لەڕاستیا وانییە، دەیزانی کامیلاش لای خۆیەوە بە تەواوی ئاگای لە بێزاری ئەمەو دڵنیایە کە نەخشەیەکی عاشقانەی لێ تێکداوە.

کامیلا وتی "ئازیزم، بەڕاستی بەهاتنم قەڵس نیت؟"

"بۆ دەبێت قەڵس بم؟"

"وتم ڕەنگە لێرە تەنیا بیت"

"بێ تۆ تەنیا بووم، بینینی تۆ لێرە، لەناو بینەراندا شتێکی چاك بوو، هێنامیەوە سەرخۆم"

"کەمێك ماندوو دیاریت، لە شتێك بێزاریت؟"

"نا، لە هیچ بێزار نیم، تەنیا ئەوە هەیە ماندووم، هەرئەوە"

"تووڕە بوویت، چونکە دەوروبەرت کۆمەڵێك پیاو گرتبوویان و، ئەمەیش هەمیشە دڵت تەنگ دەکات، وا ئێستا لەگەڵ ژنێکی جواندایت، پێت وایە ژنێکی جوان بم؟"

کلیما وەڵامی دایەوە "بێگومان، بێگومان لای من ژنێکی جوانیت" و ئەمە یەکەمین وشەی ڕاست بوو کە ئەو ڕۆژە پێی وتبوو. کامیلا زۆر جوان بوو، کلیما لە مەترسیی لەناوچوونی ئەو جوانیەدا تەواو ئازاری دەچەشت. وەلێ ئەم جوانییە وا ئێستا بە دەمیەوە پێدەکەنێت و لەبەرچاویا جلەکانی دادەکەنێت، کلیما تەماشای لەشە ڕووتەکەی کرد، ئەمە لە ماڵئاوایی دەچوو، جووتە مەمکەکەی، مەمکی جوان، توندو تۆڵ، ناو قەدی باریك، ئەو سکەی دەرپێیکەی لەسەرترازاو بەرەو خوار بوەوە، خەمبارانە لێی ڕاما، دەتوت کامیلا یادوەرییەکە، یان لە پشت شووشەیەکی زۆر دوورەوەیە، هێند دوور کەمترین جووڵەی تێ ناگەڕێنێت، وەك کەسێك فەرمانی بەسەردا درابێت و دوا جامی مەرگی بنۆشێت لێی ڕوانی، ڕوانینی پیاوێکی شەیدا کە ڕابوردووی لە دەست چووبێت، تەمەنی لە دەستچووبێت.

کامیلا لێی نزیك بوەوە "چیتە؟ ناتەوێت جلەکانت دابکەنیت؟"

بێجگە لە داکەندنی جلەکانی چ ڕێگایەکی دیکەی نەبوو. گەلێك خەمی پێ خوارد.

"گیانه، ئیدی بۆ ماندوویەتیت بەڵگەیەك نەماوە، ئەم هەموو ڕێگایەم بۆ تۆ بڕیوە کە لەگەڵتا بم"

کلیما دەیزانی ڕاست ناکات، دەیزانی کامیلا کەمترین ئارەزووی خۆشەویستی نییە و، تەنیا ئاگای لە بێزاری ئەمە و ئەوەیش دەبەستێتەوە بە خۆشەویستیەکی ناکامەوە لەگەڵ ژنێکی تردا، بۆیە بە ناچاری خۆی لەبەردەم هەڵوێستێکی بەرگری کردندا دەبینێتەوە. دەیزانی "خوای میهرەبان، چەند بەچاکی دەیناسێت!" ڕەفتارە فێڵاوییەکەی تەنیا لەبەر ئەوەیە بزانێت ئەم چەند دڵی لە لایەکی ترەو، ئازاردانی خۆیشی تەنیا بۆ ئازاردانی ئەمە.

وتی "بە هەق ماندووم"

کلیمای گرتە باوەش و بردیە سەر جێ نووستنەکە "دەبینیت چۆن ماندوویەتیت لەبیر دەبەمەوە" و کەوتە یاریکردن بە لەشی.

لەسەر جێگاکە وا پاڵکەوتبوو دەتوت لەسەر تەختی نەشتەرگەری کەوتووە، دەیزانی تەواوی هەوڵی ژنەکەی بە هەدەر دەڕوات و بێ ئەنجامە، لەشی بەرەو ناوەوە کرژ دەبوو، هیچ توانایەکی ڕاست بوونەوەی نەبوو، کامیلا بە لێوە تەڕەکانی کەوتە لستنەوەی لەشی، دەیزانی دەیەوێت ئازاری خۆی و ئەویش بدات، لێی بێزاربوو، بە هەموو گەورەیی خۆشەویستیەکەیەوە لێی بێزاربوو: هەموو ئەمانە خەتای خۆی بوو، ئیرەییەکەی، پیلانەکانی، بێ باوەڕییەکەی، سەفەری بێ بەرنامەی کە هەمووشتێکی تێکداو، پەیوەندی ژن و مێردایەتیشیان بەهۆی ئەو نارنجۆکەوە کە لە سکی ژنێکی بێگانەدا لانەی کردووەو وایش ڕێکخراوە حەوت مانگی تر بتەقێتەوەو هەموو شتێك وێران بکات، کەوتبووە مەترسییەوە. ئەوە کامیلا بوو کە بە دوودڵیە گەلۆرانەکەی لە باری عەشقەوە هەموو شتێکی بەرەو وێرانکردن دەبرد.

دەمی نایە سەر سکی و هەستی کرد چۆکی بە یاری پێکردنیش هەر کرژ دەبێت و بۆ ناوەوە دەڕوات، لە پێشیا هەڵدێت، بچووك دەبێتەوەو بچووکتر.

پیاوە دەیزانی کامیلا ڕادەی خۆشەویستی ئەم بۆ ژنەکەی دی بە قەبارەی هەستانی چۆکی دەپێوێت، دەیزانی ژنەکەی زۆر ئازار دەچێژێت، دەیزانی چەند زیاتر ئازار بچێژێت، زیاتر ئازاری لەشی بێ توانای ئەم دەدات.

—28—

نووستن لەگەڵ ئەم کچەدا دوا شت بوو کە لە تەمەنیا بیری لێکردبێتەوە، پەرۆشی ئەوەبوو شادمانی بکات و پڕی بکات لە خۆشەویستی، بەڵام نەك خۆشەویستی جەستەیی، لەڕاستیا دووربوو لە ئارەزوویەکی شەهوانی، چونکە دەیویست پاك و، لە هەوەس و لەزەت وەرگرتن بەدووربێت.

وەلێ ئێستا دەتوانێت چی بکات؟ ئایا دەتوانێت بۆ پاراستنی پاکی کارە چاکەکانی خۆی ئۆلگا وەدەرنێت؟ دەیزانی ئەمە کارێکی نادروست و هەڵەیە، ئەگەر قبووڵی نەکات ئۆلگا پێی بریندار ئەبێت، ڕەنگە زامێکی هەمیشەیی بێت، تێگەیشت کە دەبێت ئەم جامی میهرەبانییە تا دوا قوم بنۆشێت.

لە پڕا بە رووتی هاتە بەردەمی، لە دڵی خۆیدا وتی دەموچاوی ئەم کچە پڕ لە وەجاخ زادەیی و ناسکییە، بەڵام زۆر حەیفە ئەم ڕووە بەشێك لەو جەستەیە بێت کە لە تولێکی درێژ و باریك دەچێت لە بەرزیدا گوڵێکی بژۆکی گرتبێت و زۆریش زل بێت.

وەلێ، جوان بێت یان نا، یاکوب زانی تازە ڕزگاری نابێت، هەستی کرد لەشی (ئەو لەشەی حەزی بە کۆیلایەتی بوو) دیسان تەواوی ئامادەگی پەیداکردبوو، لەگەڵ ئەوەیشدا وای بۆ دەرکەوت ئەو ئارەزووهەستانەی هی یەکێکی ترە، وەك لە جێگایەکی دووربێت، دوور لە ڕۆحیەوە، وەك ئەوەی ئەم

دەستی تیا نەبێت و، لە ناوەوەیدا سووكایەتی بەم جۆرە ئارەزووە بێت، ڕۆحی لە جەستەی دووربوو، بیری لای ژەهرێك بوو لە جانتای بێگانەیەكدایە، لەو پەیوەندییە رووكەش و بێ‌مانـاو، خـۆ پەسـەند و نەفرەتیـە تاڕادەیـەك بێ‌ئاگابوو كە كوێرانە لەش داوای دەكرد.

یاكوب یادوەرییەكی لە ناكاوی بەبیردا هات: تەمەنی نزیكەی دە ساڵ بوو بۆ یەكەمجار پەی بە چۆنیەتی منداڵ بوون برد، وردە وردە كە زانیاریی لـە بارەی پێكهاتـەی لەشـی ژنـەوە پـەیدا كرد، بیری منـداڵ بـوون زیـاتر و زیـاتر بەخۆیەوە سەرقاڵی كرد، زۆرجار بیری لـە بەرجەسـتەكردنی لـەدایك بوونـی خۆی دەكردەوە، وای دەهێنایە بـەرچاو كـە جەسـتە چكۆلانەكـەی، بـە دەم و لووتی پڕ لە مادەیەكی لینجەوە، لە دالانێكی درێژكۆلەو تەڕەوە بەرەو خوار دێت، ئەو مادە لینجەی كە ئەمی تیاتەڕ بووە، مۆرێكەو بەمەوە نراوە. تەواوی ژیانی یاكوب گیرۆدەی هێزە شاراوەكانی ئەو مۆرەیە كە هەموو كارێكی پـێ ڕادەپـەڕێنێت. بە ئارەزووی خۆی ئامادەی دەكـات و حوكمـی نـهێنی بەسـەر هـەموو میكانیزمـە جۆراوجۆرەكـانی لەشـیا دەكـات، هەمیشـە بـێزی لـەم سووكایەتیە دەبوەوە، لەبەرانبەریا لانی كەم تا ئەوشوێنە بەرەنگاریكرد كـە هەرگیز گیانی خۆی بە ژنان نەدات و ئازادی و تەنیایی خۆی بپارێزێت. بەڵێ، ڕەنگە هەر لەبەر ئەم هۆیە بێت كە هێندە ئۆلگای خۆشدەویست؛ لە دیـدی ئـەودا ئۆلگـا بوونـەوەرێك بـوو تـەواو لـەودیو سـنوورە دیاریكراوەكـانی سێكسـەوە. بۆیـە هـەرگیز ئـەوی نەدەخسـتە خانـە سـووكەكەی لەدایك بوونی خۆیەوە.

بە ناچاری ئـەو بیرۆكانـەی لـەخۆی دوورخسـتەوە، چونكـە حاڵەتەكـە تـا دەهات زیاتر بەرەوپێش دەچوو، ئەو دەبوو لـەنێوان چـەند چركـە سـاتێكدا كارەكە بكات، نایشیەوێت بەناخۆشی و بێزاریەوە ئەنجامی بدات. بەخۆی وت

ئەم ژنەی ئێستا لە بەردەمیدایە بوونەوەرێکە تەنیا عەشقی پاك و بێگەردی ژیانی خۆی بەم بەخشیوە، تاقە ئامانجی ئەم لەپێگەیشتنی ئۆلگا بەختەوەرکردن و لەزەت پێ بەخشین و شادی و بڕوا بەخۆ کردنیەتی.

تووشی سەرساميیەکی زۆر بوو: دەتوت شەپۆلی بەختەوەری داویانەتە بەر، هەستی بە شادیکرد، گیانی گوێڕایەڵی لەگەڵ لەشیا ببوونە یەك، وەك ئەوەی کاری خۆشەویستی بێجگە لە دەربڕینی لەش، خۆش ویستن و هەستی پاك بەرانبەر بە یەکێکی دی هیچیتر نەبێت. هیچ شتێك ڕێگرنەبوو، لە یەکترەوە ئاڵابوون و هەناسەیان تێکەڵ بەیەك ببوو.

ئەو چرکەساتانە، چرکەساتی درێژ و دلۆڤان بوون، پاشان ئۆلگا وشەیەکی هەوەس بازانەی بە گوێیدا چرپاند، جارێك و چەند جارێکی ترو ئیدی تەواو جۆشی سەند.

شەپۆلی شادمانییەکە لە پڕا بەرەو دوا کشایەوەو، یاکوب و کچەکە خۆیان بەسەرگەردانی لە بیابانێکدا دیتەوە.

وشەیەکی دزیو کە لە دەمی ئۆلگاوە هاتە دەرێ، خەیاڵی یاکوبی تەواو شلوێ کرد، لە خەونەکەی وەدەرنا، تەمی میهرەبانی و پڕ لە سۆزی کردە هەڵم و لە ناکاوێکدا کچەکە بووەوە بەوەی جاران: سەرێك لە گوڵێکی گەورە دەچێت بەسەر قەدێکی باریك و لەرزۆکی جەستەوە، ڕەفتاری ئەو بوونەوەرە بەسۆزە بوو بە ڕەفتاری سۆزانییەك، هەرچەندە هەر سۆزی دەجووڵاند، بەڵام وشە فریو دەرەکانی زرنگانەوەیەکی پێکەنین هێنەرو غەمباریان تیابوو.

بەڵام دەبوو یاکوب وای نیشان نەدایە کە ناتەواوی لە شوێنێکی کارەکەدا هەیە، دەبوو لەسەر گەمەکەی بەردەوام بێت، دەبوو هەر لەسەر نۆشینی جامە تاڵەکەی میهرەبانی تا دوا قومی بەردەوام بێت. چونکە ئەم کارە بێ ماناو

ساختەیە تاقە كارێكی باشی ئەو بوو، ڕۆحی تەنانەت(بۆ چركە ساتێك حەبی ژەهرەكەی لەبیرنەچوو) تەنیا داوای ڕزگاربوونی خۆی دەكرد.

−29−

ئاپارتمانە قەشەنگەكەی بارتلیف، وەك گەوهەرێكی گەورەی پرشنگدار لەناو سەدەفێكی نەرمۆكەی خۆڵەمێشیدا، كەوتبووە نێوان هەردوو ژوورە ئاسایی و سادەكانی یاكوب و كلیماوە، زۆر دەمێك بوو ئەو ژوورانە هێوری و ئارامییەك دەستی بەسەردا كێشابوون و، لە هەمان كاتیشدا هێشتا ڕۆزینا لە پاڵ بارتلیفدا دوا چرپە و ناڵەی لەزەتەكانی بەڕێ دەكرد. بێدەنگ لە پاڵیا ڕاكشابوو ئەویش پەنجەی بە سەروچاویا دەهێنا، دوای كەمەكێك دایە پرمەی گریان، زۆر گریاو ڕووی بە سنگی بارتلیفەوە قرساند.

بارتلیف وەك كیژۆڵەیەك لە ئامێزی گرت و ئەویش بە ڕاستی وای هەست كرد كە منداڵە، هێند منداڵ كە پێشان هەرگیز بە خۆیەوە نەدیبوو (پێشتر هیچ كاتێك نەیویستبوو خۆی لە ئامێزی یەكێكدا بشارێتەوە) لە هەمان كاتا هەستی وابوو هەرگیز وەك ئێستا ئەوەندە گەورە نەبووە (پێشتر هەرگیز ئەوەندە هەستی بە شادمانی نەكردبوو) هەموو هەنسكێكی گریان هەستكردن بوو بە خۆشییەكی تازە كە هیچ جاری تر ئەزموونی نەكردبوو.

ئێستا كلیما لە كوێ بوو، ئەی فرانتا لەكوێ بوو؟ ئەوان لە شوێنێك بوون لە تۆزێكی دوورە دەستا، كەسانێك بوون سووك وەك پەڕ، بەرەو ئاسۆ پەروازیان دەكرد، ئەی ئارەزووە ملۆزمەكەی بۆ خۆڕزگاركردن لە بەڵای یەكێك و دەستگرتن بەسەر ئەوی تردا چی لێهات؟ ڕق و تووڕەییەكەی، بێدەنگیە غەمبارەكەی كە بە درێژایی ڕۆژ خۆی تیا مەڵاس دابوو، چی لێهات؟

لە کاتێکدا کە پیاوەکە هەر دەستی بە سەرو چاویا دێنا، هەنسکی گریانی ئەویش وردە وردە لە کەمی دەدا، پیاوەکە پێی وت بنوێت، جێ خەوی بارتلیف لە ژووری تەنیشتا بوو، ڕۆزینا چاوی کردەوەو تەماشای کرد: بارتلیف ڕووتبوو، چووە گەرماوەکە (دەنگی کرانەوەی ئاوەکە دەهاتە گوێ) پاشان گەڕایەوە، دەرگای کەنتۆرەکەی کردەوە، پەتوویەکی دەرهێناو بە هێوری دای بەسەر ڕۆزینادا.

ڕۆزینا دەمارە پێچەڵ پێچەکانی قاچی بینی، کە بارتلیف نووشتایەوە زانی قژە لوولەکەی ماش و برنج و تەنکە و پێستی سەری بە دەرەوەیە، بەڵێ، تەمەنی بارتلیف پەنجا و ئەوەندە ساڵ و کەمێکیش ورگی هەبوو، بەڵام ڕۆزینا گوێی بەوە نەدەدا، بە پێچەوانەوە، هەستی وابوو کە ساڵ و تەمەنی ئەو هێزو بوێریی بەم دەبەخشێ، لاوییەتی ئەوی لە نوورێکی تازەدا کە توانای دەربڕینت نییە بە دیاردەخست، بە جۆرێك کە هەستی پیریەتی لە ئارادا نەبوو، پڕپڕ بوو لە توانای ژیان، پڕ لەو هەستەی کە سەفەری ژیانی تازە لە سەرەتادایە. پاشان ڕۆزینا وای بۆچوو کە ئەگەر ئەوی لابێت ئەم هەر بە گەنجی دەمێنێتەوە، پێویست بە پەلەکردن ناکات، تێپەڕینی زەمان چ ترسێکی نەگەرەکە. دیسان بارتلیف لە پاڵیا دانیشت، لە ئامێزی گرتەوە، ڕۆزینا هەستی کرد نەك تەنیا لە باوەشە ئاسوودە بەخشەکەی نێو بازووی ئەودایە، بەڵکو لە ئامێزی تەمەنە دڵنیاکەرەکەیشیدا بە ئارامی نوستووە.

ڕۆزینا هوشیارییەکەی دایە کەمی و خۆی لە دەست گەمەی هەڵەت و پەڵەتی خەون قوتارکرد، دوایی بە ئاگاهاتەوەو وای هاتە بەرچاو هەموو ژوورەکە نوقمی ڕووناکییەکی شینی سەیرە، پێشتر هەرگیز ڕووناکییەکی وا سەیری نەدیبوو، چی بوو؟ ئایا مانگ خۆی پێچابووە شاڵێکی شینەوە هاتبووە سەر زەوی؟ یان بە دووچاوی کراوەوە خەونی دەبینی؟

بـارتلیف هـەر زەردەخەنـەی بـۆ دەکـرد و دەسـتی نـازی بـە سـەروچاویا دەهێنا. سەرئەنجام ڕۆزینا چاوی نوقاندو خەونێك بەرەولای خۆی برد.

*          *          *

1–ئامازەیە بە شوێنی لەدایکبوونی مەسیح.

2–Faun خوای دارستان و کێڵگەکان لە ئەفسانەی ڕۆمیدا. و. ف.

3-Ruzenka.

-1-

هێشتا دنیا تاریك بوو کە کلیما لە خەوێکی زۆر سووك بە ئاگاهات، دەیویست پێش ئەوەی ڕۆزینا بچێتە سەرکار بە گیری بێنێت، بەڵام چۆن ئەم پەلەپەلی چوونە دەرەوەیەی پێش سپێدەی بەیان لە کلیما بگەیەنێت؟

تەماشای سەعاتەکەی کرد: پێنجی بەیانی بوو، زانی ئەگەر زوو هەڵنەسێت دەستی بە ڕۆزینادا ناگات، بەڵام هیچ بەهانەو پاساوێکی بە بیردا نەدەهات، دڵی توند لێی دەدا، نەیزانی چی بکات، هەستاو بێدەنگ دەستی بە لەبەرکردنی جلەکانی کرد تا کامیلا لە خەو هەڵنەسێت، لە داخستنی قۆپچەی چاکەتەکەیدا بوو کە دەنگی هاتە گوێی، دەنگێکی خەفەی نیوە خەوتوو "بۆ کوێ دەچیت؟"

لە پاڵ جێگاکەیدا وەستاو لە سەرخۆ ناو دەمی ماچ کرد.

"بنوو، بۆ دوور ناڕۆم"

کامیلا وتی "منیش دێم" بەڵام خەوی لێکەوتەوە.

خێرا کلیما هاتە دەرێ.

-2-

ئایا ئەوە دەشیا؟ ئایا ئەو هەروا دەیتوانی لە هاتوچۆدا بێت و سەرو خوار بکات؟

بەڵێ، بەڵام ئیتر وەستا، کلیمای بینی دەیویست لە ساختمانەکەی ریچموند بێتە دەرەوە، کەمێك سەبری کردو پاشان بێدەنگ و لەسەرخۆ کەوتە دوای، ئەو بەرەو ساختمانەکەی مارکس دەچوو، لە داڵانەکە تێپەڕی (پاسەوانەکە نوستبوو) لە سووچێکی ڕاڕەوەکەدا کە دەچووەوە سەر ژوورەکەی

ڕۆزینا ونبوو، چاوی لێبوو ترومپیت ژەنەکە لە دەرگای ژووری ڕۆزینای دەدا، دەرگاکە داخرابوو، کلیما چەند جارێکی تر لێیدا، ئەنجا گەڕایەوە و ڕۆشت.

فرانتا لە دەرەوەی ساختمانەکەیشدا هەر بە دوایەوە بوو، بینی بە شەقاوی فراوان لە شەقامێکی درێژەوە کە بە گەرماوەکە کۆتایی دەهات، ئەوجێگایەی دەبوو ڕۆزینا تا نیو سەعاتی تر نۆرە کارەکەی لەوێ دەست پێ بکات، چووە خوارێ، خێرا چووە ساختمانەکەی مارکسەوە، لە دەرگای ژوورەکەی ڕۆزینای داو، بە دەنگی بەرز لە کونی کلیلەکەوە وتی: "منم، فرانتام، مەترسە، دەرگاکە بکەرەوە"

هیچ وەڵامێك نەبوو.

لەوکاتەدا کە دەیویست ئەوێ بەجێ بهێڵێت تازە دەرگاوانەکە لە خەو هەڵدەستا.

فرانتا لێی پرسی: "ڕۆزینا لەماڵەوەیە؟"

دەرگاوانەکە وتی "لە دوێنێوە نەگەڕاوەتەوە"

فرانتا چووە سەرشەقامەکە، لە دوورەوە کلیمای بینی کە دەیویست بڕواتەوە لای گەرماوەکان.

—3—

ڕۆزینا ئاسایی سەعات پێنج و نیو لە خەو هەڵدەستا، ئەمڕۆ بەیانیش هەرچەندە لە ژێر کاریگەریی ئەو حاڵە لەزەت بەخشەدا نوستبوو، زۆریش نەخەوتبوو، هەستا، جلی لەبەرکردو، لەسەر پەنجەی پێی چووە ژوورەکەی تەنیشتی.

بارتلیف لەسەرلا نوستبوو، بە گران هەناسەی دەداو، قژی کە ئاسایی بە جۆرێکی جوان ڕێك دەخست، ئاڵۆزکاوو بەشێکی سەرە تاسەکەی

دەرکەوتبوو، لە خەودا دەموچاوی پیرتر و بە تەمەنتر دەردەکەوت، لەسەر مێزەکەی تەنیشتی سینیەك دەرمان دانرابوو کە خەستەخانەی بە بیری ڕۆزینا دەهێنایەوە، وەلێ هیچێك لەمانە ئازاری پێ نەگەیاند، لێی ڕاماو هەستی کرد فرمێسك لە چاویا قەتیس ما، هەرگیز ئەزموونی شەوی وا خۆشی نەکردبوو، زۆری پێ خۆشبوو بۆی بکەوێتە سەرچۆك، ئەوەی نەکرد، بەڵام نوشتایەوەو بەهێوری ناوچاوی ماچ کرد.

کە لە گەرماوەکە نزیك کەوتەوە فرانتای بینی هەنگاوی خێرای بەرەو لای ئەم دەنا.

ڕۆژێك پێشتر، بەیەکگەیشتنێکی وای پێ ناخۆشبوو، ئەگەرچی عاشقی ترومپیت ژەنەکە بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا فرانتای لا زۆر گرنگتر بوو، ئەو و کلیما دووانەیەك بوون نەدەکرا لێکیان جیابکەیتەوە: یەکێکیان لەسەر واقیعی ژیانی ڕۆژانەو ئەویان لەسەر خەون بنیاتنرابوو. یەکێکیان ئەوی دەویست و ئەویدی نا، ئەم خوازیاری ئەویان و لەمیان هەڵدەهات، هەریەکێك لەم دووانە مانای بوونی ئەوی تری دیاریی دەکرد، بڕیاری ئەوەی کلیما باوکی منداڵەکەیەتی فرانتای لە ژیانی دەرنەهاویشتبوو، بە پێچەوانەوە: ئەوە خودی فرانتا بوو کە ئەمی خستبووە سەر ئەو بڕیارە، ڕۆزینا لەنێوان ئەم دووانەدا مۆلەق وەستابوو، وەك ئەوان دوو تەوەرەی بوونی بن، تەوەرەکانی باکوورو باشووری تاقە هەسارەیەك بوون کە دەیناسین.

بەڵام ئەو بەیانیە کتوپڕ لەوە گەیشت کە ئەم گەردوونە دنیای تریشی تیایەو، بێ کلیماو فرانتایش ژیان هەر بەسەر دەبرێت، زانی پێویست بە پەلەکردن ناکات، پیاوێکی عاقڵ و پێگەیشتوو دەتوانێت بەرەو قەڵەمڕەوێك ڕابەریی ئەو بکات کە لەوێدا زەمان میهرەبانترەو گەنجایەتی لەوێدا زوو کۆتایی نایەت.

فرانتا سەرگەرمانە وتی "دوێ شەو لەکوێ بوویت؟"

"پەیوەندیی بە تۆوە نییە"

"چوومە ماڵەکەت، لەوێ نەبوویت"

ڕۆزینا وتی "لە هەرکوێ بووم پەیوەندیی بە تۆوە نییە" و بێ وەستان لە دەرگای گەرماوەکە تێپەڕی "مەکەوەرە دوام"

فرانتا بە تەنیا لە پێشی ساختمانەکەدا وەستا، لەبەر بێ خەوی دوێ شەوی قاچی دابویە ئێش و بە ناچاری لەسەر کورسییەك کە دەیتوانی چاودێری دەرگای دەرەوەی لێوە بکات دانیشت.

ڕۆزینا بە پەلە لە پلیکانەکان بەسەرکەوت، چووە ژوورێکی گەورەی چاوەڕوانی کردنی قاتی دووەمەوە کە بۆ نەخۆشەکان کورسی و قەنەفەی تیا ڕیزکرابوو، کلیما لە نزیك دەرگای بەشەکەی ئەوەوە دانیشتبوو.

کلیما وەستاو نائومێدانە تەماشای کرد "ڕۆزینا! تکات لێدەکەم، تکات لێدەکەم عاقڵبە، لەگەڵما وەرە، باپێکەوە بۆ ئەوێ بڕۆین"

نائارامیەکەی ئەو بێ دەربەستیەی هەفتەی پێشووتری پێوە دیارنەبوو کە خۆی پێوە دەنواند.

ڕۆزینا وتی "تۆ تەنیا ئەوەت گەرەکە شەڕی منت لە کوڵ بێتەوە" ئەم قسەیە ترساندی "نا، نامەوێت لە دەستت ڕزگارم بێت، بە پێچەوانەوە، حەز ئەکەم چەند بتوانین زیاتر یەکدیمان خۆش بوێت"

"درۆ مەکە"

"ڕۆزینا، تکات لێدەکەم، ئەگەر نەیەیت هەموو شتەکان تێك دەچن"

"کێ ئەڵێت نایەم؟ هێشتا سێ سەعاتم ماوە، تازە سەعات شەشە، بگەڕێوە ناو پێخەفەکەت، ژنەکەت چاوەڕێتە"

دەرگاکەی لەدوای خۆیەوە پێوەدا، بە پەلە بەروانکەیەکی سپی پۆشی و بە هاوکارە تەمەن مام ناوەندییەکەی وت "چاکەیەکم لەگەڵدا بکە، دەبێت سەعات نۆ بڕۆم، دەتوانیت سەعاتێك لە شوێنی مندا بیت؟"

هاوڕێکەی بە دەنگێکی سەرکۆنە کردنەوە وتی "ئاخری ڕازیان کردیت"

ڕۆزینا وتی "ڕازیان نەکردووم، عاشق بووم"

–4–

یاکوب نزیك پەنجەرەکە بوەوەو کردیەوە، لە بیری حەبە شین باوەکەدا بوو، نەیدەتوانی باوەڕ بە خۆی بێنێت کە ڕۆژی پێشتر بەڕاستیی داویەتە ژنێك، لە ئاسمانە شینەکە وردبوەوەو هەوای فێنکی سەرلەبەیانیی سەرەتای پاییزی هەڵمژی، دنیای دەرەوەی پەنجەرەکە ئاسایی، هێور و ساردبوو، ئێستا ڕووداوەکەی دوێنێی لەگەڵ سستەرەکەدا وەك شتێکی پووچ و دوور دەهاتە بەرچاو.

تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و ژمارەی گەرماوەکەی وەرگرت، داوای ڕۆزینای سستەری لە بەشی ژنان کرد، زۆر چاوەڕێبوو، دوایی ژنێك وەڵامی دایەوە، دووبارە وتی دەیەوێت لەگەڵ ڕۆزینای سستەردا قسە بکات، دەنگەکە وەڵامی دایەوە کە سستەرەکە ئێستا لە حەوزەکاندا گیری خواردووەو ناتوانێت بێتە سەر تەلەفۆن، سوپاسی ژنەی کردو تەلەفۆنەکەی دانا.

هەستی بە ئاسوودەییەکی بێ سنوورکرد: هێشتا ڕۆزینا زیندووە، حەبی ناو شووشەکە ئاسایی لە ڕۆژێکا سێ جار دەخورێت: کەواتە وەك ڕێسا دەبوو دوێنێ شەوو ئەمڕۆ بەیانی حەبی خواردبێت و بەم پێیە دەبوایە زۆر پێش ئێستا حەبەکەی قووت دابێت، لەپڕا هەموو شتێکی بە تەواوی بۆ ڕوون بوەوە: حەبە شین باوەکە کە بۆ دەستەبەرکردنی ئازادییەکەی لە گیرفانیا

هەڵیگرتبوو حەبێکی ساختە بووە، هاوڕێکەی ڕێك و ڕاست وەهمی مردنی داوەتێ.

بۆ پێشتر بیری لەمە نەکردبووەوە؟ جارێکی تر ئەو ڕۆژە دوورەی هاتەوە بیر کە داوای ژەهری لە هاوڕێکانی کرد، تازە لە زیندان ئازاد کرابوو، ئێستا کە دەگەڕێتەوە بۆ ڕابووردوو تێدەگات کە داواکارییەکەی قێزەون هاتۆتە بەرچاوو، تەنیا بە شانۆگەرییەکی ناشیرین دراوەتە قەڵەم بۆ سەرنج ڕاکێشانی خەڵکی بە لای ئەو ڕەنج و ئازارەدا کە بەرگەی گرتبوو. سکریتا بێ دوودڵی داواکەی قبووڵ کردبوو، دوای چەند ڕۆژێك حەبێکی شین باوی بریقەداری بۆ هێنابوو، بەڵێ، هیچ ڕاڕاییەکی نەدەویست، پێویستی نەدەکرد لە داواکارییەکەی پەشیمان بکرێتەوە. سکریتا کارەکەی عاقڵانە بوو، زۆر لەوانە عاقڵانەتر کە داواکارییەکەی یاکوبیان دابوە دواوە. سکریتا ڕێك وەهمێکی بێ زیان و ئارام و دڵنیاکەری دابوویەو لەم بێنەو بەردەیەدا بۆ هەتاهەتایە سوپاس و پێزانینی یاکوبی بەدەست هێنابوو.

چۆن پێشتر ئەم شتەی بە بیردا نەهاتبوو؟ لەڕاستیا، هەر ئەوەی کە سکریتا ژەهرێك لە شێوەی حەبێکی ئاسایی بە ئامێر دروستکراوی بە یاکوب دابێت، کارێکی سەیرە! یاکوب دەیزانی سکریتا وەك کیمیاوییەك دەیتوانی ڕاستەوخۆ دەستی لە ژەهر گیربێت، وەلێ بەوجۆرەی کە دەزگایەکی حەب دروستکردنی لە بەردەستا بێت بە لایەوە کارێکی سەیربوو، بەڵام زۆری بیر لەوە نەکردبووەوە، ئەگەرچی لە دنیادا گومانی لە هەموو شتێك هەبوو، وەلێ بڕوای بە حەبەکە وەك بڕوا بە ئینجیل بوون وابوو.

ئێستا، لەم چرکە ساتی پڕ لە ئارامیە مەزنەیدا، سوپاسی هاوڕێکەی دەکرد کە فریوی دابوو، خۆشحاڵ بوو بەوەی کە سستەرەکە زیندووەو کارەساتە ناخۆشەکەی دوێنێش بێجگە لە مۆتەکەیەك چیتر نەبوو. بەهەرحاڵ،

هیچ شتێکی ژیان زۆر درێــژە ناکێشـێت و، لـەدوای شـەپۆلی ئـارام بـەخش و خۆشەوە، شەپۆلێکی تری خەفەت هەیە.

چ پێکەنین هێنەربوو! حەبەکەی گیرفانی، کە حاڵەتێکی زۆر ناسکی دابوە هەر هەنگاوێکی و لەوەدا بوو ژیانی بگۆڕێتە سەر ئەفسانەیەکی شکۆمەندو، لـەوەیش دڵنیـابوو کــە مــەرگی ئــەو لــەناو ئــەو ســەرە کاغــەزە ڕەنگاڵەییــە بچووکەدایە، کەچی بێجگە لە پێکەنینێکی بێدەنگی سکریتا چیتری تیا نەبوو.

یاکوب، لە دوا لێکدانەوەیدا، تێگەیشت هاوڕێکەی کارێکی چاکی کردووە، وەلێ بەهەرحاڵ وایشی هاتە بەرچاو کە سکریتای خۆشەویست و هاوڕێی لـە پڕا چکۆلە بووەوە، بوو بە مرۆڤێکی ئاسایی پێ نەگەیشتوو، پزیشکێك بوو وەك هــەزارانی تــر. ئــەوەی سـکریتای لــە هـاوڕێ و ئاشـناکانی تـری یــاکوب جیــادەکردەوە تــەنیا ئــەوە بــوو کــە ڕەفتــاری لــەوانی تــری نــەکردو، بــێ دەربەستانەو بێ دوو دڵــی ژەهرەکــەی دایــە، شـتێکی تـر لـەودا هـەبوو، ئـەو ئەوەی لەبەرچاو نەگرتبوو کە ڕەنگە یاکوب لە کاتی هێرشێکی هیستیری یان نائومێدیدا خراپ سوود لە حەبەکە وەربگرێت، ئەو بەشێوەیەك لەگەڵ یاکوبدا ڕەفتاری کردبوو وەك ئەوەی تەواو دڵنیا بووبێت لەگەڵ یـەکێکی وەك خۆیـدا ئەو کارە دەکات کە هیچ لاوازییەکی ئینسانیی پێوە نییە، ئەوان وەك دووخـوا کە دەبوو بە ناچاری لەگەڵ مرۆڤدا بژین ڕەفتاریـان لەگـەڵ یـەکتردا کردبـوو، ئەمە کارێکی جوان و شایستە بوو، هەرگیز لە یاد نەدەکرا. بـەڵام لە پڕێکـا هەموو شتێك کۆتایی پێ هاتبوو.

یـاکوب لـە شـینیی ئاسمـانی ڕوانـی و بـیری کـردەوە: ئـەمڕۆ سـکریتا ئـارامی و ئاسـوودەیی پـێ بەخشـیم و، لـە هـەمان کـاتدا ڕوانینـی منیشـی بەرانبــەر بـە خـۆی گۆڕی.

-5-

هەڵوێستە تەواو سەیرو شاد بەخشەکەی ڕۆزینا، کە قبووڵ کردنێکی زۆرە ملیٚ بوو، کلیمای سەرسام کردبوو، بەڵام لەم دنیایەدا هیچ شتێك نەیدەتوانی بەڕاست یان درۆ ئەو وا لیٚ بکات ژووری چاوەڕوانییەکە بەجیٚ بهێڵێت. ونبوونی چاوەڕوان نەکراوی دوێنێی ڕۆزینا بیری لە کارخستبوو، بڕیاریدابوو هەر لەوێدا چاوەڕیٚ بێت تا دڵنیابێت کەس لە بڕیارەکەی پەشیمانی ناکاتەوە یان نایوروژێنێت.

ژنە نەخۆشەکان لە هاتوچۆدا بوون، لەو دەرگایەوە کە ڕۆزینا لە پشتیەوە دیارنەمابوو، جیادەبوونەوە، هەندێکیان لەوێدا دەمانەوە، ئەوانی تر دەگەڕانەوە ژووری چاوەڕوانی کردن تا لەسەر کورسیی پاڵ دیوارەکان دابنیشن، هەموویان ملە قوتێی لای کلیمایان بوو، چونکە ئەویٚ بەشی ژنان بوو ئاسایی ڕێگا بە پیاو نەدەدرا بێنە ژووری چاوەڕوانییەوە.

ژنێکی بەخۆوە کە بەروانکەیەکی سپی پێوەبوو لە دەرگایەکەوە هاتە ژووریٚ و تەماشایەکی خۆ هەڵقورتێنەرانەی ئەوی کرد، ئینجا لێی نزیك کەوتەوەو لێی پرسی کە ئایا چاوەڕێی ڕۆزینایە، کلیما سوور داگەڕاو سەری بەڵیٚ کردنی بۆ دانەواند، ژنەکە خۆمانەیی و بە جۆرێکی فزولی وتی "پێویست نییە لەم ناوە دابنیشیت، تا سەعات نۆ کاتت بە دەستەوەیە"، کلیما وای هاتە بەرچاو هەموو ژنی ژوورەکە گوێیان لە قسەکانی بوەو زانیویانە مەسەلەکە چییە.

نزیکەی چارەکێکی مابوو بۆ سەعات نۆ کە ڕۆزینا بە بەرگی ئاساییەوە هاتە دەریٚ، کلیما دەستی گرت و بیٚ ئەوەی هیچ لەگەڵ یەکتردا بڵێن لە ساختمانەکە بە دەرکەوتن، هێند نوقمی بیرکردنەوەی خۆیان بوون ئاگایان لەوەبڕا بوو فرانتا، کە لە پشت بنچکە دارەکانی باخچەکەوە خۆی ماتدابوو، بە دوایانەوەیە.

-6-

یاکوب بێجگە لە ماڵئاوایی لێکردنی ئۆلگا و سکریتا هیچی تری نەمابوو، وەلێ دەیویست لە پێشدا (بۆ دواجار) پیاسەیەك بەناو باخچەکەدا بکات و دوا نیگای خۆشەویستی و حەسرەتی ڕابووردووی لەو درەختانە بگرێت کە دەتوت گریان لێ دەبێتەوە.

هەر لەوکاتەدا کە گەیشتبووە ڕاڕەوەکە، ژنێکی گەنج دەرگای بەرانبەرەکەی دادەخست، بالای بەرزی ژنە سیحری لێکرد، کە دەموچاوی بینی لە جوانییەکەی سەری سووڕما، بە ژنەکەی وت: "تۆ هاوڕێکەی دکتۆر سکریتایت، وا نییە؟"

ژنە بزەیەکی دلڕفێنی هاتێ: "چۆن ئەزانیت؟"

یاکوب وتی "ئەو ژوورەی لێوەی هاتیتە دەرەوە هەمان ئەو ژوورەیە کە دکتۆر سکریتا بۆ هاوەڵەکانی کەڵکی لێ دەبینێت" و خۆی پێ ناساند.

ژنە وەلامی دایەوە "من خانمی کلیمام، دکتۆر لوتفی کردو ئەم ژوورەی دایە مێردەکەم، وا ئێستا بەدوای مێردەکەمدا دەگەڕێم، ڕەنگە لای دکتۆر بێت، تۆ بڵێی لە کوێ بێت؟"

یاکوب بە تاسەوە لە ڕووی ژنەکە ڕاماو (جارێکی دی) ئەوەی هاتەوە بیر کە ئەمڕۆ دوا ڕۆژی ئەوە، ڕۆژێکە هەموو ڕووداوێکی بایەخ و مانای تایبەتی خۆی هەیەو شانسێکی ڕەمزیی لێ دەکەوێتەوە.

وەلێ ئەم شانسە بە چ مانایەك؟

وتی "شادمانم بتگەیەنمە لای دکتۆر سکریتا"

"ئەمە ئەوپەڕی لوتفی جەنابتانە"

بەڵێ، ئەم شانسە بە چ مانایەك؟

ئەم دیدارە زیاد لە هەر شتێکی تر تەنیا پەیامێك بوو، هیچی تر نا، یاکوب دوو سەعاتی تر دەڕۆیشت و بۆ هەتاهەتایە ئەم شتە جوانەی لە دەست دەچوو، ئەم ژنە خۆی وەك غەدر لێکراوێك پیشانی ئەودا، ئەو ژنەی تەنیا بۆ ئەوە دیبوو پەی بەوە بەرێت کە هەرگیز نابێتە هی ئەو، ئەمە وێنەیەك بوو بۆ لە دەستدانی هەموو شتێکی بەهۆی ڕۆیشتنەکەیەوە.

یاکوب وتی: "سەیرە، ڕەنگە ئەمە دواجاری تەمەنم بێت لەگەڵ دکتۆر سکریتادا قسە بکەم"

بەڵام پەیامەکەی ئەم ژنە شتێکی تریشی دەوت. ئەو پەیامهێنی دوا دەقیقەکانی جوانیش بوو، بەڵێ، جوانیی، ئەگەرچی یاکوب لەوە گەیشت کە هەرگیز جوانناس نەبووەو، گوێی پێ نەداوەو، هەرگیز ژیانی بۆ تەرخان نەکردووە، بەڵام جوانیی ئەم ژنە سیحراویی کرد، لە پڕا هەستی کرد هەموو بڕیارەکانی پێشووی بەهۆی غەفڵەتێکەوە، قڵپ بوونەتەوەو بوونەتە نائاسایی، زانی لە ژیانیا هەمیشە شتێکی بواردووە، ئەگەر ئەم ژنەی بناسیایە ئێستا بڕیارەکانی بە جۆرێکی تر دەبوون.

"چۆن ئەمە دواجارە؟"

"دەڕۆم بۆ دەرەوەی وڵات، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ"

مەسەلەکە ئەوە نەبوو کە ئەو ژنی جوانی نەدیوە، بەڵام هەمیشە دیدئەندازیی ئەوانی لا پاشکۆو پەراوێز بووە، ئەو شتەی ئەوی بەرەو لای ژنان دەکێشا گیانی تۆڵە بوو، یان خەم و بێزاری، یان دڵسۆزی و بەزەیی بوو، لە دیدی ئەودا دنیای ژن یەکسان بوو بە نموونەیەکی تاڵی ژیانی ناو وڵاتەکەی، جێگایەك کە ئەو تیایدا هەم چەوساوە بوو هەم چەوسێنەر، ئەو شوێنەی چەندان شەڕی ناخۆشیی تیا کردبوو بێ هیچ خۆشەویستییەك. وەلێ وادەهاتە بەرچاو ئەم ژنە لە هەموو ئەم شتانە دوورە، دوورە لە ژیانی ئەو، ئەو

لە دەرەوە هاتووە، لە شوێنێکی خەیاڵییەوە، ئەو نەك تەنیا ژنێکی جوان، بەڵکو خودی جوانیەك بوو کە لەوی گەیاند -ئێستا و لێرەدا- توانای ئەوەی هەیە بەشێوەیەکی جیاوازو بۆ ئامانج گەلێکی جیاواز بژیت، تێیگەیاند جوانیی لە دادپەروەری مەزنترە، لە حەقیقەت مەزنترە، حەقیقی ترو حەتمی ترە، بەڵێ تەنانەت زوویش بەدەست دێت. لەوی گەیاند کە جوانیی لە پێش هەرشتێکی ترەوەیەو بۆ هەتاهەتایشە لە دەست ئەم چووە، ئەو ژنە، لەدوا چرکەدا بۆیە خۆی نیشانداوە کە پێی بڵێت چەند دەبەنگ بووە کە وای زانیوە هەمووشتێك دەزانێت و تامی هەموو شتەکانی ژیانی چەشتووە.

ژنەکە وتی: "ئیرەییت پێ دەبەم"

پێکەوە لە باخەکە تێپەڕین، ئاسمان شین بوو، دەوەنەکان زەردو سوور بوون و جارێکی تر یاکوب ئەوەی وەبیرهاتەوە ئەوە دیمەنی ئاگرێکە کە هەموو ڕووداوەکان، یادوەری و دەرفەتەکانی ئەو دەسووتێنێت و نابووتی دەکات.

"پێویست ناکات ئیرەییم پێ بەریت، چونکە ئێستا وای بە چاك ئەزانم کە ئەسڵەن نابێت بڕۆم"

"بۆ نابێت؟ ئایا لە پڕا ئێرەت لا خۆشەویست بووە؟"

"تۆم لا خۆشەویست بووە، هەست ئەکەم زۆر زۆرم خۆش ئەوێیت. بێ ئەندازە جوانیت"

پێش ئەوەی بزانێت چی ڕوودەدات، وشەکان لە دەمی هاتنە دەرێ و کتوپڕ ئەوەی هاتە بیر کە دەتوانێت هەموو شتێکی پێ بڵێت، چونکە تا چەند سەعاتێکی تر دەڕۆشت و قسەکانی نە بۆ خۆی و نە بۆ ئەو، چ شوێنەوارێکی بەجێ نەدەهێشت، ئەم ئازادییە کتوپڕە سەری سووڕدا.

"من وەك کوێرێك ژیاوم، مرۆیەکی کوێر، ئێستا، بۆ یەکەمین جار پەی بەوە دەبەم کە جوانیی هەیەو، ڕێم پێداوە بەلامدا تێپەڕێت"

ژنەکە یاکوبی بەرەو قەڵەمڕەوێك برد کە هەرگیز ڕێگای تێ نەکەوتبوو، دنیای هونەر و مۆسیقا، پێ دەچوو لەگەڵ ئەو چڵ و گەڵایانەدا کە چون مەشخەڵان دەیاننواندو، ئیدی ئەو وەك پەیام و ڕەمزی ئاگر تەماشای نەدەکردن، بەڵکو وەك عەشق و شەیداییەك و، جوانییەك کە لەگەڵ ڕەوتی هەنگاو و دەنگی بە جۆشی ئەو ژنەدا ڕێك دەکەوت، بووبێت بەیەك.

"بۆ ئەوەی دەستم کەویت ئامادەی هەموو شتێکم، پێم خۆشە چی هەیە بخەمە لاوەو هەموو تەمەنم بۆ تۆ و لە پێناوی تۆدا بە جۆرێکی دی بژیم، وەلێ ناتوانم، چونکە ئیتر بەڕاستیی لێرە نیم، دەبوایە دوێنێ بڕۆشتمایەو ئەمڕۆ لێرە لە تارماییەکی وێڵ دەچم"

بەڵێ، ئێستا لەوە دەگەیشت کە چ چارەنووسێك ئەم دیدارەی بۆ پێش هێنا، ئەم دیدارە لە دەرەوەی ژیانیدا، لە شوێنێکی سەرووی چارەنووسییەوە، لە پشت ژیاننامەیەوە ڕووی دەدا، ئەم قسانەی بەئاسانی لەگەڵدا کرد، تا گەیشتە ئەو ئەنجامەی تەنانەت بەم حاڵەیشەوە ناتوانێت هەرچیەکی بوێت پێی بڵێت.

دەستی گرت و ڕاست ئاماژەی بۆ پێشەوە کرد: "عیادەی دکتۆر سکریتا ئەوەیە، بڕۆرە قاتی دووەم"

خانمی کلیما زۆری لێ ورد بووەوەو یاکوبیش لە نیگاکەیدا کە وەك ئاسۆیەکی تەماوی، ناسك و نمدار بوو نقوم ببوو. دیسان دەستی گرتەوە، گەڕایەوەو ڕۆشت.

دوای کەمێك ئاوڕی دایەوەو خانمی کلیمای بینی بێ جووڵە وەستاوەو تەماشای دەکات، چەند جارێکی تر ئاوڕی دایەوەو هێشتا ژنەکە هەر لەوێدا بوو، لە دوایەوە، لێی ڕامابوو.

—7—

نزیکەی بیست کەسی بێزار لە ژووری چاوەڕوانیدا بوون، جێی ڕۆزینەو کلیما نەبوو دابنیشن، دیوارەکانی بە پۆستەری گەورە کە داوای لە بارنەبردنی منداڵیان لە ژنان دەکرد ڕازابوونەوە، لەسەر یەکێکیان وێنەی منداڵێکی ناو بێشکە کرابوو کە بە زەردەخەنەوە بە دایکی دەوت: **دایکە، بۆ منت ناوێت؟**

لە بەشی خوارەوەی پۆستەرەکەدا بە پیتی گەورە شیعرێك نووسرابوو، لە شیعرەکەدا منداڵێکی هێشتا لە دایك نەبوو لە دایکی دەپاڕێتەوە نەهێڵێت لە ناوی بەرێت. منداڵەکە زۆر بە خۆشییەوە لە باتی ئەوە بەڵێنی دەداتێ: **دایکە، ئەگەر منت نەبێت، کە دەمریت کێ لە ئامێزت دەگرێت؟**

پۆستەرەکانی تر وێنەی ئەو دایکانەیان پێوە بوو کە بە خۆشی و پێکەنینەوە گالیسکەی منداڵەکانیان پاڵ پێوە دەناو، هەروەها وێنەی ئەو کوڕە منداڵانەی میزدەکەن (کلیما وای بیرکردەوە کە کوڕێکی منداڵ لەکاتی میزکردندا بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ بە دنیا هێنانی منداڵ، کاتێك لە فیلمێکی هەواڵدا منداڵێکی جوانی بەخۆشییەوە لەکاتی میزکردندا دیبوو، تەواوی سینەماکە پڕببوو لە هەناسەی خۆشی ژنان)

کلیما دوای ماوەیەك چاوەڕوانی بڕیاریدا لە دەرگای ژووری دکتۆر بدات، سستەرێك سەری دەرهێناو، کلیما ناوی دکتۆر سکریتای برد، دکتۆر دوای چەند دەقیقەیەك هات، بەڵێن نامەیەکی دایە کلیما تا پڕی بکاتەوە، داوایشی لێکرد کەمێکی تر چاوەڕوان بێت.

کلیما بەڵێن نامەکەی نا بە دیوارەکەوەو دەستی بە پڕکردنەوەی ئەو زانیارییانە کرد کە تیایدا داواکرابوون: ناو، مێژووی لەدایك بوون، شوێنی لەدایك بوون،' ڕۆزینا هاوکاریی کرد، پاشان گەیشتە ئەمە: ناوی باوك. لە ترسا موچڕکی پیاهات، بینینی ئەم ناونیشانە سووکایەتی پێکردنەو ئیمزاکردنی ناوی خۆی لەسەری کارێکی سامناك بوو.

ڕۆزینا تەماشای دەستی کلیمای کرد و زانیی دەلەرزێت، ئەمە زیاتر دڵنیایی کرد و وتی: "بەردەوامبە، بنووسە!"

کلیما لەسەرخۆ پرسی "دەبێت ناوی کێ بنووسم؟"

بە ترسنۆك و پووچ هاتە بەرچاوی ڕۆزیناو تەواو بە لەعنەتی کرد، ئەو لە هەموو شتێك دەترسا، لە بەرپرسیارییەتی، تەنانەت لە مۆرکردنی ناوی خۆیشی دەترسا.

وتی: "مەبەستت چییە؟ وابزانم ئەوە زۆر ئاشکرایە کە دەبێت ناوی کێ بنووسیت"

کلیما وتی: "وامزانی مەسەلەکە زۆر گرنگ نییە"

ئیتر بایەخی بە کلیما نەداو لە ناخیدا هەستی بەوەکرد کە ئەم پیاوە ترسنۆکە ڕەنجاندوویەتی، پێی خۆشبوو ئازاری بدات، وتی "ئەگەر بە درۆی دەزانیت وا چاکترە هاوڕێ نەبین" و، دوای ئەوەی کلیما مۆری لای ناوەکەی خۆیەوە کرد ڕۆزینا هەناسەی هەڵکێشا و لەسەری ڕۆشت: "بە هەرحاڵ هێشتا تەواو لەوە دڵنیانیم کە چی ئەکەم"

"مەبەستت چییە؟"

لە دەموچاوە تەواو تێکچووەکەی کلیمای ڕوانی و وتی: "تا ئەوساتەیش کە دەریدێنن، بۆم هەیە لە بڕیارەکە پەشیمان ببمەوە"

-8-

لەسەر قەنەفەکە دانیشتبوو، قاچی نووساندبوو بە مێزەکەوە، لە خوێندنەوەی چیرۆکێکی پۆلیسیدا بوو کە بۆ ڕۆژانی بێزاربوونی لە مانەوە کاتییەکەی ئاوەکانزاییەکاندا کڕیبووی، بەڵام زەینی خوێندنەوەی پەرتبوو، چونکە هێشتا لە سێ و دووی قسەکانی دوێ شەودا بوو، لە پێش هاتەکەو، بە تایبەت لە خۆی قایل بوو، وەك ئەنجام ببوو بەو کەسەی کە خۆی پێی خۆشبوو وابێت: نەك قوربانیی خواستەکانی دڵی پیاو، بەڵکو داهێنەری چارەنووسی خۆی، ئەو دەورە چکۆڵە پاکەی یاکوب بۆی دیاری کردبوو بە تەواوی بڕیبووی، بە پێچەوانەوە، بەپێی ویستی خۆی یاکوبی گۆڕیبوو.

ئێستا خۆی بە شایستە، ئازادو جوامێر دەزانی، تەماشای قاچی نێو پانتۆڵە تەنگە جیینەکەی خۆی دەکرد کە بە سەرمێزەکەوە درێژی کردبوون. کە گوێی لە دەنگی لێدانی دەرگاکەیش بوو، بە خۆشییەوە وتی "وەرە ژوورێ، چاوەڕێت بووم"

یاکوب هاتە ژوورێ، غەمبار دیاربوو.

پێش ئەوەی قاچی لەسەر مێزەکە بهێنێتە خوارێ وتی "سڵاو"

یاکوب بێزار دیاربوو، ژنەکە ئەمەی پێ خۆشبوو، لە جێگاکەی هەستاو لەسەرخۆ ماچی کرد "کەمێك دەمێنیتەوە؟"

یاکوب بە دەنگێکی غەمبارانەوە وەڵامیدایەوە "نەء، ئەمجارەیان بەڕاستیی بۆ ماڵئاوایی لێ کردن هاتووم، بەپەلە دەڕۆم، حەزم کرد بۆ دواجار لەگەڵتا تا گەرماوەکان بڕۆم"

ئۆلگا بە زەردەخەنەیەکی شادمانییەوە وتی: "باشە، منیش پێم خۆشە کەمێك پیادەڕەوی بکەم"

-9-

یاکوب لێوان لێوبوو له خەیاڵی خانمی کلیمای جواندا، ئەو شەوەی لەگەڵ ئۆلگادا گوزەراندبووی گێژو ئازاری دابوو، ناچار بوو بۆ هاتن و ماڵئاوایی لێکردنی جۆره زۆرێك له خۆی بكات، بەڵام هیچی لەو هەستەی دەرنەدەبڕی، بە خۆی وت دەبێت بە تەگبیرو زیرەکیەکی زۆرەوه هەڵسوکەوت بکات و، نابێت ئۆلگا تەنانەت گومانێك لەوه بكات کە ئەو دوێنێ شەو خۆشیو چێژێکی زۆر کەمی چەشتووه. نابێت هیچ شتێك یادوەرییەکەی لە بیری ئۆلگادا شلوێ بكات، بۆیە سیمایەکی جیدی لە خۆی گرت، ئاساییترین ڕستەی به دەنگی غەمبارانەوه دەوت، هەروا دەستی گرتەوەو پەنجەی بە قژیا هێنا، که ئۆلگا تەماشای ناوچاوی دەکرد، هەوڵی دەدا له ناخۆشترین حاڵەتدا خۆی پیشان بدات.

ئۆلگا پێشنیازی کرد گەر بکرێت و کاتیان هەبێت لە شوێنێکدا بوەستن و چەند پێکێك شەراب بخۆنەوه، بەڵام یاکوب دەیویست زۆر زوو کۆتایی بە دیدارەکه بێنێت، چونکه ئەزموونەکەی لا زەحمەت بوو. وتی "ماڵئاوایی کردن زۆر غەماوییه، نامەوێت درێژی بکەمەوه"

کە گەیشتنه دەرگای گەرماوەکە، هەردوو دەستی گرت و بە قووڵی لەناوچاوی ڕوانی.

ئۆلگا وتی: "یاکوب، تۆ زۆرت چاك کرد کە هاتیتە ئێرەو منت بینی، دوێنێ شەو شەوێکی خۆشبوو، بەختەوەرم که سەرئەنجام دەستت لە گەمەی دەوری باوکایەتیم هەڵگرت و بوویت بە یاکوب، بەڕاستیی دوێ شەو ناوازەبوو، وا نەبوو؟"

یاکوب زانی ئیدی هیچ شتێك تێناگات، ئایا دەشێت ئەم کچه پڕ له هەسته ڕووداوەکەی شەوی پێشوو تەنیا بۆ خۆشی و ڕابواردن بداته قەڵەم؟ کە

ئەنگێزەکەی نەك سۆز، بەڵکو هەوەس بازییەکی ڕووت بووبێت؟ بڵێی یادوەری خۆشی شەوێکی عەشق لە خەمی لێك جیابوونەوەیەکی هەمیشەیی باشتر بێت؟

یاکوب ماچیکرد، ژنەکە هیوای سەفەرێکی خۆشیی بۆ خواست و پاشان بۆ شوێنی خۆ گۆڕینە فراوانەکەی گەرماوەکە گەڕایەوە.

—10—

نزیکەی دوو سەعات بە بەردەم عیادەکەدا هاتوچۆیکرد و بێزاربوو، بەردەوام ئەوەی وەبیر خۆی دێنایەوە کە نابێت بیکاتە هەرا، وەلێ هەستی کرد خۆی پێناگیرێت و خەریکە توانای نامێنێت.

چووە ساختمانەکەوە، ناوچەی ئاوەکانزاییەکە جێگایەکی بچووکبوو هەموو ئەویان دەناسی، لە دەرگاوانەکەی پرسی ئایا ڕۆزینا لەوێیە؟ دەرگاوان سەری بەڵێی بۆ ڕاوەشاند و وتی بە ئاسانسەر (ئاسانسۆر)ەکە چووەتە سەرێ، تەنیا لە بەرزترین قاتدا، واتا قاتی چوارەم، دەوەستاو بۆچوونە قاتەکانی خوارەوە دەبوایە بە پلیکانەدا بوایە، بۆیە فرانتا دەیتوانی گەڕانەکەی تەنیا لە ڕاڕەوەکانی قاتی چوارەمدا کۆنترۆڵ بکات. لایەکی ڕاڕەوەکە عیادەکان و لاکەی تری شوێنی نەخۆشیی ژنان بوو، بە ڕاڕەوی یەکەمدا (کە تاقە کەسێکی تیا نەبوو) تێپەڕی، پاشان گەیشتە ڕارەوی دووەم و ئەوەیشی پێ ناخۆشبوو کە ڕێ بە پیاو نادەن بڕواتە ئەوێ، سستەرێکی بینی لە ناسیاو دەچوو پرسیاری ڕۆزینای لێکرد، سستەرەکە ئاماژەی بۆ دەرگایەك کە دەکەوتە کۆتایی ڕاڕەوەکەوە کرد. دەرگا کرابووەوە، چەند پیاوو ژنێك تیایدا کۆببوونەوە، فرانتا خۆی بە ژوورێکدا کردو چەند پیاو و ژنێکی تری بینی لەوێ دانیشتبوون، بەڵام ترومپیت ژەن و ڕۆزینای لێ نەبوو.

(ئایا کچێك، کچێکی قژ زەردتان نەدیوە؟)

ژنێك ئاماژەی بۆ دەرگای عیادەکە کردو وتی "لە ژوورەوەن"

فرانتا ئەوەی خوێندەوە، **دایکە، بۆ منــت نـاوێت؟** و پۆسـتەرەکانی تر وێنـەی تازە لە دایك بوو و، ئەو منداڵە کوڕانەی میزیان دەکرد بینی، هەموو شتێکی لا ڕوون بوەوە.

**-11-**

مـێزێکی درێـژ ناوەڕاسـتی ژوورەکـەی داگـیرکردبوو، کلیمـا و ڕۆزینـا لــە لایەکەوە دانیشتبوون، دکتۆر سکریتا بەرانبـەریان لـە بـەینی دوو ژنـی تەمـەن مام ناوەندو بە هەیکەلدا بوو.

دکتـۆر سـکریتا تەماشایەکی داواکـەرەکانی کـردو سـەری نـاڕەزایی لـەقاند "لە تەماشاکردنتان بە تەنگ دێم، ئایا ئەوە دەزانن بۆ سکپڕکردنی ئەو ژنانەی دەیانـەوێت منداڵیـان ببێـت چەنده زەحمــەت دەکێشـین؟ وا ئێسـتا ئێوەیـش - کەسانێکی گەنج، لەش ساغو پێگەیشتوو- هاتوونەتە ئێرەو تکا دەکەن و لـە بەنرخترین شتی ژیانی خۆتان چاو دەپۆشن.

دەمەوێت ئەم مەسەلەیە تەواو یـەکلایی بکەمـەوە کـە ئامـانجی ئـەم لیژنەیـە نەك هاندانی کورتاژ، بەڵکو نەهێشتنیەتی"

دوو سستەرە بەخۆوەکە ورتەورتێکیان بۆ پاڵپشتیی دکتـۆر کـردو سـکریتا کەوتـەوە ئامۆژگـاری کـردن. دڵـی کلیمـا کـەوتبووە تەپەتـەپ. وای بـۆ چـوو کـە قسـەکانی دکتـۆر سـکریتا نـەك بـۆ ئـەو، بـەڵکو بـۆ ئـەو دوو ئەندامـەی تـری لیژنەکەیە کە بە هەموو توانای شکۆمەندانەی سکی دایکانەیانـەوە نەفرەت بـۆ ئەو ژنە گەنجانە دەنێرن کە کورتاژ دەکەن. بەڵام کلیما دەترسا نەك ئـەم قسـانە

لە ورەی ڕۆزینا بێنێتە خوارێ، بۆ چەند دەقیقەیەك لەمەوپێش بە کینایە نەیوتبوو هێشتا بڕیاری نەداوە؟

دکتۆر سکریتا لەسەر قسەکانی ڕۆشت: "ئێوە بۆ دەژین. ژیانی بێ منداڵ وەك درەختی بێ گەڵا وایە، ئەگەر دەسەڵاتم ببوایە کورتاژم هەر قەدەغە دەکرد، ئایا ئێوە هەردووکتان بەوە نیگەران نین کە ساڵ لە دوای ساڵ ژمارەی دانیشتوانی کۆمەڵگاکەتان بەرەوخوار دێت؟ بەم حاڵەیشەوە، هیچ وڵاتێك لە دنیادا وەك ئێرە بایەخ بە دایك و منداڵەکەی نادات! هیچ یەکێك لە وڵاتانی جیهان ئایندەی منداڵیان بە ڕادەی لای خۆمان دڵنیاکەر نییە"

دیسانەوە دوو ئەندامی لیژنەکە لەبەرخۆیانەوە کەوتنەوە بەرگری لێکردنی و دکتۆر سکریتا بەردەوامبوو "ئەم هاوڕێیەمان کە لێرە دانیشتووە ژنی هێناوە، ئێستا لەو پێشهاتە پەشیمانە کە بەبێ ئەوەی هەست بە لێپرسینەوە بکات لە ئەنجامی کاری سێکسییەوە تووشی هاتووە، وەلێ هاوڕێ، دەبوایە پێشتر بیرتان لەم شتانە بکردایەتەوە"

دکتۆر بۆ چەند چرکەساتێك بێدەنگ بوو، دووبارە ڕووی لە کلیما کردەوە "تۆ منداڵت نییە، بەڕاستیی پێم بڵێ: ئایا بە ڕاستیی ناتوانیت تەنیا لەبەر خاتری ئەم منداڵەی هێشتا لە دایك نەبووە لە ژنەکەت جیاببیتەوە؟"

کلیما وەڵامی دایەوە "شتی وا هەرگیز نابێت"

دکتۆر سکریتا هەناسەی هەڵکێشا: "ئەزانم، لە ڕەچەتەی پزیشکی دەروونەوە وام هەست پێکردووە کە خانمی کلیما مەیلی خۆ کوشتنی هەیە، لەدایکبوونی ئەم منداڵە ژیانی مرۆڤێك دەخاتە مەترسییەوە، ژیانی ژن و مێردێك نابووت دەکات و، دایکێکی هێشتا شوو نەکردوو دێنێتە کایە، ئێمە دەتوانین چی بکەین؟"

جارێکی تر ئاهێکی هەڵکێشا، پاشان قەڵەمی هەڵگرت و بەڵێن نامەکەی مۆرکردو دای بە دوو سستەرەکەیش، ئەوانیش ئاهێکیان هەڵکێشاو لە خوارەوەی بەڵێننامەکەدا مۆریان کرد.

دکتۆر سکریتا پێی وتن: "سەعات هەشتی بەیانیی ڕۆژی دوو شەممەی ئاینده کارەکە بەجێ دێنین"

یەکێك لە خانمە بەخۆوەکان بە کلیمای وت: "تۆ کەمێك بمێنەرەوە" دوای ئەوەی ڕۆزینا ڕۆشت بەردەوامبوو: "کورتاژ ئەوەندە ئاسان نییە کە تۆ دەیزانیت، خوێنی زۆری پێویستە، تۆ بێ بەرپرسانە هاوڕێ ڕۆزینا لە خوێنی خۆی مەحروم دەکەیت و هەق وایە بە خوێنی خۆت قەیرانی ئەوە بکەیت" بەڵێن نامەکەی خستە بەردەمی کلیماو وتی: "لێرەدا مۆری بکە"

ترومپیت ژەنەکە گێژ و سەرسووڕماو خۆی بەدەستەوەدا.

"ئەمە بەڵێننامەی خوێن بەخشینە، دەتوانیت بڕۆیتە ژوورەکەی تەنیشتو سستەرەکە یەکسەر خوێنتان لێدەگرێت"

## —12—

ڕۆزینا چاوی بڕیبووە زەوییەکەو خێرا لە ژووری چاوەڕوانی تێپەڕی و فرانتای نەبینی تا ئەو بەسەریا قیژاندی.

"لەوێ چیت دەکرد؟"

ڕۆزینا لە تەماشاکردنە تووڕەکەی ترساو خێراتر هەنگاوی نا.

"لێم پرسیت: چیت دەکرد؟"

"پەیوەندی بە تۆوە نییە"

"ئەزانم خەریکی چی بوویت"

که دەیزانیت بۆ دەپرسیت"

لە پلیکانەکان دەهاتنە خوارێ و ڕۆزینا پەلەی بوو، دەیویست لە فرانتاو لە قسەکردن هەڵبێت.

"ئەوێ لیژنەی کورتاژە، ئەوە دەزانم، دەتەوێت مناڵەکە لەباربەریت!"

"هەر کارێکم پێ خۆش بێت دەیکەم"

"ناتوانیت هەرچیت پێ خۆش بێت بیکەیت، منیش لەناودام"

ڕۆزینا خێرا دەڕۆشت، وەك ڕابکات و فرانتایش لە پشتیەوە، کە گەیشتنە بەردەم گەرماوەکە، وتی: "مەکەوەرە دوام و بوێر مەبە، من کارم هەیە، خۆت لە کارم هەڵمەقورتێنە"

فرانتا تەواو هەڵچووبوو "بە من مەڵێ چی بکەم"

"بۆت نییە دەست لە کارم بخەیت"

"تۆیش بۆت نییە دەرم بکەیت"

ڕۆزینا بە پەلە چووە ساختمانەکەوە، فرانتا هەر بەدوایەوە بوو.

**-13-**

یاکوب بەوە خۆشحاڵ بوو کە هەموو شتەکان تەواو ببوو، تەنیا کارێکی مابوو: ماڵئاوایی کردن لە سکریتا. بە هێوری لەو لای پارکەکەوە بەرەو ساختمانەکەی مارکس چوو.

بەرانبەری، بە درێژایی ڕاڕەوە فراوانەکەی باخچەکە، تیپێکی نزیك بە بیست قوتابی کە مامۆستاکەیان سەرپەرشتی دەکردن، دەهاتن، مامۆستاژنەکە پەتێکی سووری بە دەستەوە بوو، منداڵەکان بەیەك ڕیز دەڕۆیشتن و پەتەکەیان گرتبوو، لە سەرخۆ دەڕۆیشتن و، مامۆستاکە درەخت و بنچکە جیاوازەکانی پیشان دەدان، یاکوب وەستا، چونکە هەرگیز زانستیی سروشتی نەخوێندبوو، هەرگیز نەیدەزانی دار کەوت کەوتەو ئالوش ئالوشە.

ماموستاکه درهختێکی چڕی پیشاندان که له زهردبووندا بوو، پێی وتن "ئهمه داری زهیزهفوونه"

یاکوب به وردی له منداڵهکانی ڕوانی، ههموو چاکهتی شین له بهرداو کڵاوی سووریان له سهردابوو، گشتیان له خوشك و برای یهکدی دهچوون. به وردی تهماشای دهموچاوی کردن و وای هاته بهرچاو که ئهمانه نهك تهنیا له جلوبهرگدا بهڵکو وهك یهکیش ههڵکهوتبوون. به لایهنی کهمهوه حهوتیان لووتیان زل و دهمیان کراوه بوو، تهواو له دکتۆر سکریتا دهچوون.

مناڵه لووت زلهکهی میوانخانهکهی هاتهوه بیر، تۆ بڵێی خهونی نهوه خستنهوهی سکریتا شتێکی له سهرووی خهیاڵهوه بێت؟ که ئهم ناوچهیه بهڕاستیی ببێته ئاوایی سکریتای بابه گهوره؟

ئهم بیرۆکهیه پووچ هاته بهرچاوی یاکوب، ههموو منداڵهکان له یهکتری دهچوون، چونکه تهواوی منداڵی دنیا لهیهك دهکهن.

جارێکی تریش ئهم بیرۆکهیهی هاتهوه بهر زهین: گریمان سکریتا بیره سهیرو سهمهرهکهی هێنایه دی، ئهوسا چۆن؟ چی ههیه بهرهنگاری له بهدی هاتنی شتێکی وا موجیزه ئاسا بکات؟

"ئهی ئهو درهختهی لهوێدایه، ناوی چییه؟"

یهکێك له سکریتا بچووکهکان وهڵامیدایهوه "ئهوه درهختی بهتولا"یه بهڵێ، ئهوه تهواو خودی سکریتا بوو، نهك تهنیا لووتی زل بوو، بهڵکو چاویلکهیشی له چاودا و دهنگیشی له کاتی قسهکردندا گڕو له دهنگی هاوڕێکهی یاکوب دهچوو.

ماموستاکه وتی: "ڕاسته، ئۆڵدا"[(1)]

یاکوب بیری بۆ ئهوه چوو تا ده بیست ساڵی تر ههزاران سکریتا لهو وڵاتهدا پهیدا دهبن، جارێکی تر ئهو ههسته سهیره دایگرت که ئهو له

وڵاتهکهی خۆیدا ژیاوهو کهچی هیچ له ڕابووردووی نازانێت، وهك دهڵێن، له سهنتهری ڕووداوهکاندا ژیا بوو، له ڕووداوی ڕۆژدا بهشداری کردبوو، بهشداریی سیاسهتی کردبوو تا ڕادهی گیان بهخشین له پێناویدا، تهنانهت دوای ئهوهیش که دهریان کرد، هێشتا پهیوهندی خۆی لهگهڵ گۆڕانه سیاسییهکاندا پاراست، ههمیشه وای بیردهکردهوه که گوێی له ترپهی دڵی وڵاتهکهیهتی، بهڵام بهڕاستیی گوێی له چی ببوو؟ لێدانی دڵی میللهت؟ ڕهنگه ئهوه تهنیا سهعاتێکی کۆنی قوڕمیش، سهعاتێکی سست و کۆن که به ههڵه وهختی پیشان دهدا، ئایا تهواوی ئهو ململانێ سیاسییانه تهنیا وێنایهکی بهتاڵ بوو که سهرنجی ئهوی له شته ههره گرنگهکانی ژیانی که لا خستبوو؟

ماموٚستاکه ئهمانهته جوانهکانی بهرهو ڕاڕهوی خوار باخچهکه بردو هێشتا یاکوب نهیدهتوانی وێنای ژنه جوانهکه له زهینی خۆی دهربکات. یادهوهری جوانی ئهو لهگهڵ پرسیاره دووبارهکراوهکاندا ئازاری دهدا: ئایا لهو دنیا تهواو جیاوازهدا که ئهو وێنای دهکرد ژیابوو؟ ئایا ههمووشتێکی به ئاوهژوو دیبوو؟ گریمان جوانیی له حهقیقهت گرنگتر بێت، گریمان بهڕاستیی جوانی فریشتهیهك بووبێت گوڵه کهوێی پێشکهش بارتلیف کردبێت.

گوێی له دهنگی ماموٚستاکه بوو "ئهی ئهمه چییه؟"

سکرێتایهکی چکۆلهی چاویلکه لهچاو وهڵامی دایهوه: "دارکهوت"ه.

**—14—**

ڕۆزینا له کاتێکدا ههوڵی ئهوهی بوو تهماشای دواوهی خۆی نهکات و به پهله به پلیکانهکاندا سهردهکهوت. دهرگای بهشهکهی بهتوندی لهدوای خۆیهوه پێوهداو چووه ژووری خۆگۆڕینهوه، بهروانکهی سستهرییهکهی پۆشی و، ههناسهیهکی قووڵی ئاسوودهییدا، دهم تێگیرانی لهگهڵ فرانتادا

بـێزاری کردبـوو، بەوەیشــەوە بــەجۆرێکی ســەیر لــە پەشـێوی و ناڕەحــەتی ڕزگاریکردبوو، ئێستا هـەردووکیان، فرانتـاو کلیمـا، وەك دوو کەسـی دوورو نەناس دەهاتنە بەرچاو.

چووە ئەو هۆڵەوە کە تەختی خەوەکان لە ڕیـزی یـەکدا دانرابوون و ژنانی نـەخۆش دوای حــەمام کـردن لــەوێدا دەحەوانــەوە. هاوکــارە تەمــەن مــام ناوەندییەکەی لە پشت مێزێکی نزیك بە دەرگاکەوە دانیشتبوو.

بە ساردییەکەوە پرسی "بڕیاریاندا؟"

ڕۆزینـا وتـی "بـەڵێ، سوپاسـت دەکــەم نۆبەتەکــەت بـۆ گـرتم" و کلیلـی دۆڵابەکەو متیلە پاکەکانی دایە نەخۆشێکی تازە.

هەر ئەوەندەی سستەرە تەمـەن مام ناوەندەکە ڕۆشت، دەرگاکە کرایـەوەو سەروچاوی فرانتا دەرکەوت.

(ئەوە ڕاست نییە کە مەسەلەکە پـەیوەندی بە منـەوە نـەبێت، پـەیوەندی بـە هەردووکمانەوەیە، منیش قسەیەکم بۆ وتن پێیە"

ڕۆزینا بە تووڕەییـەوە وتـی: "وێڵبـە، ئێرە بەشـی ژنانـە، زوو بـڕۆ ئـەگینا دەتکەمە دەرێ"

فرانتا لە ڕقا سوور ببوەوەو هەڕەشـەی ڕۆزینـایش ئـەوەندەی تـر تووڕەی کرد، لەناو ژوورەکەدا ڕاپەڕی و تونـد دەرگاکـەی بـە یـەکدادا: "ئەسڵەن گوێت پێ نادەم چی دەکەیت، هیچ گوێت نادەمێ"

ڕۆزینا وتی "پێم وتیت هەر ئێستا بڕۆ"

"فریوی تۆ ناخۆم، هەموو خەتای ئەو زۆڵەیە، ئەو بۆڕیە ژەنـە، بـە هـەرحاڵ هەموو مەسەلەکە لە گاڵتەجاڕی و فێڵبازی زیاتر شتێکی تـر نییـە، ئـەو لەگـەڵ دکتۆرەکەدا ئاڵتم و ساڵتمێکی کردووە، ئەوان هاوڕێی دڵسۆزی جازی هاوڕێ

گەورەیانن، بەڵام من ئەم کڵاوانەم ناچێتە سەر و ڕێگات پێنادەم کۆرپەکەم بکوژیت، من باوکم و قسەم هەیە، ناهێڵم کۆرپەکەم بکوژیت"

فرانتا دەینەڕاند و نەخۆشەکانی لەژێر پەتوکەیاندا دەجووڵاند و ملە قوتێیان بوو.

ڕۆزینایش ڕق گرتبووی، چونکە پێی دەچوو فرانتا کۆنترۆڵی خۆی بۆ نەکرێت و ڕۆزینا نەیدەزانی چۆن کێشەکە ئاسایی بکاتەوە.

ڕۆزینا وتی "هەرگیز ئەمە منداڵی تۆ نییە، نازانم چۆن بیرێکی وات بەسەردا هاتووە، هەرگیز منداڵی تۆ نییە"

فرانتا هاواری لێ هەستا: "چیی؟" و چووە پێشەوە، لە مێزەکە تێپەڕی و بەرانبەر بە ڕۆزینا دانیشت "منداڵی من نییە؟ ئەمە چ قسەیەکی قۆڕە ئەیکەیت؟ تەواو دڵنیام منداڵی خۆمە"

لەو کاتەدا ژنێك کە تازە لە حەوزی مەلەکە هاتبووە دەرێ، بە ڕووتی و لەشی تەڕەوە چووە ژوورەکە، دەبوو ڕۆزینا وشکی بکردایەتەوەو بیخستایەتە سەر تەختی خەوەکە. نەخۆشەکە لەو دیمەنە کتوپڕەی فرانتا کە چەند هەنگاوێك لەولاترەوە وەستابوو بەو دوو چاوەیەوە کە هیچی نەدەبینی خێسەی لەم دەکرد، ترسا.

ڕۆزینا بۆ ماوەیەکی کورت دەرفەتێکی پەیدا کرد، خێرا بەرەو لای ژنەکە چوو، متیلەکەی بەسەریاداو بەرەو تەختی نووستنەکەی برد.

نەخۆشەکە ئاوڕی دایەوە، تەماشایەکی فرانتای کرد. پرسی: "ئەم پیاوە لێرە چی دەکات؟"

ڕۆزینا هەر بەدەم پێچانەوەیەوە بە پەتو گەرمەکە وتی: "شێتە، لەخۆ بێ ئاگایەو نازانم چۆن لێرەی بەدەرنێم، بەڕاستیی نازانم چی لێبکەم؟"

ژنێکی تر که له حاڵی حەسانەوەدا بوو هاواری کرد "ئای، جەناب؟ تۆ لێرە چ کارێکت نییە، برۆ دەرەوە"

فرانتا سەرسەختانە وەڵامی دایەوە: "منیش لێرە کارم هەیە" و لە جێگاکەی نەجووڵا.

که ڕۆزینا گەڕایەوە ڕەنگی فرانتا نەك سوور بەڵکو پەڕیبوو، لەسەرخۆو بن بڕانە قسەی دەکرد: "با شتێکت پێ بڵێم؛ گەر بهێڵی منداڵەکەت دەربێنن، دەبێت هەر لەوێدا منیش لەناو بەرن، ئەگەر ئەم منداڵە بکوژیت خوێنی دوو کەست دەکەوێتە گەردن"

ڕۆزینا ئاهێکی هەڵکێشاو چەکمەجەی مێزەکەی کردەوە، جانتا دەستییەکەو شووشەی حەبە شین باوەکانی تیابوو، حەبێکیانی خستە سەر لەپی دەستی و هەڵیدایە ناو دەمی.

ئیدی فرانتا هاواری نەماو کەوتە پاڕانەوە و لاڵانەوە: "ڕۆزینا تکات لێدەکەم، تکا، ناتوانم بێ تۆ بژیم، خۆم دەکوژم"

لەو چرکە ساتەدا ڕۆزینا هەستی بە ئازارێکی زۆر و کتوپڕی گەدەی کردو، فرانتا لە دەموچاوی ڕۆزینا ڕاما کە چۆن لە تاو ژان و ئازار وا گۆڕابوو نەدەناسرایەوە، چاوی بێ ئەوەی ببینن، زەق دەچوونەوە، بینی چۆن گرمۆڵە بوو، دەستی بە سکیەوە گرت و کەوتە سەر زەوی ژوورەکە.

## –15–

ئۆلگا لە حەوزەکەدا مەلەی دەکرد کە لە پڕا بە ئاگا هاتەوە... بەڕاستیی لەچی بە ئاگاهات؟ وتنی سەختە. لە پڕا هۆڵەکە پڕببوو لە ژاوەژاو، ژنەکانی دەوروبەری لە حەوزەکە دەهاتنە دەرێو، لە ژوورەکەی تەنیشتا کە وەك گەرداوێکی لێهاتبوو کە هەموو ئەم لاوئەولای ڕاپێچێتە ناوخۆیەوە، تێ

ڕژابوون، ئۆلگایش زانی خۆی پێ ناگیرێت و، بێ بیرکردنەوە، تەنیا لە ژێر کاریگەریی خۆ تێ هەڵقورتاندنێکی ترسێنەردا کەوتە دوایان.

نزیك بە دەرگاکە کۆمەڵێك ژنی بینی، پشتیان لەم بوو، ڕووت و تەڕ، چەمابوونەوەو پشتیان دەرپەڕیبوو، کوڕێکی گەنجیشی دی لە سووچێکدا وەستابوو.

چەند ژنێکی ڕووتی تر ڕژانە ژوورەکەوەو، ئۆلگا کە بەرەو پێشتر دەچوو ڕۆزینای سستەری بێ جووڵە بە ڕاکشاوی لەسەر زەوی ژوورەکە بینی. کوڕە لاوەکە لە پڕا لە پاڵیا کەوتە سەر ئەژنۆو هاواری کرد: "من کوشتم، من، بکوژەکە منم"

ژنان ئاویان لێ دەچۆڕا، یەکێکیان بەسەر لاشەی لەسەر پشت کەوتووی ڕۆزینادا نوشتایەوە و ویستی بزانێت دڵی لێ دەدات، بەڵام کار لە کار ترازا بوو، چونکە سستەرەکە مردبوو، ئەوە چ گومانی هەڵنەدەگرت، لەشە تەڕو ڕووتەکانی ژنان بە پەرۆشەوە پاڵیان بۆ پێشەوە دەنا تا وەکو بەوردی تەماشای مەرگەکە بکەن، ئامادەگی مەرگ بەسەر ڕووی ناسیاوێکەوە.

هێشتا فرانتا هەر لەسەر چۆك کەوتبوو، ڕۆزینای لە باوەش گرت و دەموچاوی ماچ کرد.

ژنان بە سەرسامیەوە کۆیان گرتبوو، فرانتا سەری بەرزکردەوەو تەماشای کردن و دیسان وتیەوە: "من کوشتوومە، بمگرن"

ژنێکیان وتی "وەرن کارێك بکەین، ژنێکی دی ڕایکردە دالانەکەو بۆ یارمەتیدان کەوتە هاوارکردن، دوای کەمەکێك دوو هاوکاری ڕۆزینا لەگەڵ پزیشکێکدا بە بەروانکەیەکی سپییەوە، بە ڕاکردن هاتن.

ئۆلگا تازە بەوەی زانی ڕووتەو لە ناوەڕاستی ژنانی تری ڕووتدا، بە بەرچاوی دوو پیاوی بێگانەوە، لاوێك و پزیشکێك، پاڵ دەنێ و دەڕواتە

پێشێ. ئەمەی بەبێ هوودەیی دانا، وەلێ ئۆلگا لەوەیش گەیشت کە ئەم دەرك پێکردنەیش هیچ ناگۆڕێت و تا ماوەیەکی کورتی تر بە پاڵنان لە ناوەڕاستی کۆمەڵەکەوە ڕێگای خۆی بەرەو سەیرکردنی مەرگ، ئەو مەرگەی شەیدای بینینیەتی دەکاتەوە.

دکتۆر لە هەوڵێکی بێ هوودەدا مەچەکی ڕۆزینای گرتبوو تا لە نەبزەکەی بگات و، هەر لە هەمان حاڵیشدا فرانتا بەردەوام دووبارەی دەکردەوە: "من کوشتوومە، پۆلیس ئاگاداربکەنەوە، بمگرن"

—16—

یاکوب هەر لەو کاتەدا کە هاوڕێکەی لە شوێنی نەخۆشەکانەوە بەرەو عیادە دەگەڕایەوە تووشی بوو، دەست خۆشی لە تەپڵ لێدانەکەی کردو داوای لێ بوردنیشی لێکرد کە دوای کۆنسێرتەکە چاوەڕێی نەکردووە.

دکتۆر سکریتا وتی: "پێم ناخۆشبوو وا زوو ڕۆشتی، دوێنێ دوا ڕۆژی تەواوت بوو کە لێرە بوویت و خوا دەیزانێت لە کوێ بوویت. شت زۆر بوو گفتوگۆیان لەسەر بکەین، لە هەموو خراپتر ئەوەیە ڕەنگە لەگەڵ ئەو کچە لەڕو لاوازەدا کاتت بەسەر بردبێت، منەتباری هەستێکی پڕ لە مەترسیە"

"مەبەستت لە منەتباری چییە؟ چ منەتێکی بە سەرمەوەیە؟"

"خۆت بۆت نووسیوم کە باوکی لەگەڵتا میهرەبان بووە"

ئەو ڕۆژە دکتۆر سکریتا کاری عیادەی نەبوو، تەختی تەماشاکردنی ژنان لەناو ژوورەکەدا چۆڵ بوو، هەردوو هاوڕێکە بە هێوری لەسەر دوو کورسی دانیشتنن.

یاکوب لەسەر قسەکەی ڕۆشت: "نا، منەتباری چ پەیوەندییەکی بەسەر ئەوەوە نییە، دەمویست تۆ ئەو بخەیتە ژێر باڵی خۆتەوەو سادەترین شتێك کە

بە بیرمدا هاتبێت ئەوە بووە کە بڵێم من منەتباری باوکت بووم، بەڵام لە ڕاستیا حەقیقەتەکە تەواو شتێکی ترە، ئێستا دەمەوێت پەردە لەسەر بەشێکی ئەو ژیانەم هەڵدەمەوە. بۆیە دەتوانم حەقیقەتی ڕووداوەکەت بۆ باس بکەم، منیان لەسەربڕیاری تەواوی باوکی ئەو خستە زیندانەوە، لە ڕاستیا، باوکی وای دانا بوو ئێمە بەرەو مردن بنێرێت، شەش مانگ دوای ئەوە خۆیان لە سێدارەدا، لە کاتێکدا کە من بەختم هێنای و بە سەلامەتی دەرچووم"

دکتۆر سکریتا وتی: "بە وتەیەکی دی، ئەو کچی پیاوێکی ڕسوایە"

یاکوب شانی هەڵتەکاند "ئەو بڕوای وابوو من دوژمنی شۆڕشم، هەموو لە بارەی منەوە وایان دەوت، ئەویش باوەڕی کردبوو"

"ئەی بۆ پێت وتم ئەو هاوڕێت بووە؟"

"ماوەیەك هاوڕێ بووین، بۆیە زۆری شانازی بەوەوە دەکرد کە ڕای لەسەر حوکمدانم داوە، ئەمە ئەوەی دەسەلماند کە بیرو باوەڕ لە سەرووی هاوڕێیەتیەوەیە، کاتێك تاوانی ناپاکی دایە پاڵم، وای بیر دەکردەوە کە بەرژەوەندی و پەیوەندی تایبەتی خۆی لە خوار شتێکی مەزنترەوەیەو، ئەوەیشی بە گەورەترین کاری ژیانی خۆی دادەنا"

"هەر لەبەر ئەوە ئەو کچە دزێوەت خۆش دەوێت؟"

"ئەمە پەیوەندی بەوەوە نییە، ئەو بێ تاوانە"

"هەزاران کچی تری بێ تاوان هەن، ئەگەر تۆ بەتایبەتی ئەم کچەت هەڵبژاردووە لەبەر ئەوەیە کە کچی باوکیەتی"

یاکوب شانی هەڵتەکاندو، دکتۆر سکریتا بەردەوام بوو: "هەمان ئەو خەسڵەتە ناپەسەندەی کە لەودا هەبوو لە تۆشدا هەیە، من وادەزانم کە تۆیش، هاوڕێیەتی ئەم کچە بە مەزنترین کاری ژیانی خۆت دەزانیت، تۆ نکوڵیت لە نەفرەتە سروشتییەکەت کرد، بێزارییە سروشتیەکەت سەرکوت کرد، تەنیا بۆ

ئەوەی بە خۆتی بسەلمێنێت کە پیاوێکی شەریفیت، ئەمە چاکە، بەلاّم ناسروشتییەو هیچ پێویست ناکات)

یاکوب وەلاّمی دایەوە "تۆ هەڵەیت، من نەمویستووە هیچ شتێك سەرکوت بکەم و هیچ وەهمێکیشم نەبووە بۆ ئەوەی ببم بە شەریف، تەنیا ئەوە بوو هەر ئەوەندەی چاوم پێی کەوت بەزەییم پیایدا هاتەوە، هێشتا مندالّ بوو کە لە شوێنی لەدایکبوونی بەدەریان نا، لەگەڵ دایکیا لە گوندێکی ناوچیادا دەژیا کە خەڵکەکەی دەترسان پەیوەندییان لەگەڵدا ببەستن؛ لەگەڵ ئەوەیشدا کە کچێکی بە توانایە ماوەیەکی زۆر خوێندنیان لیٚ قەدەغە کرد، ئازاردانی مندالّ لەسەر بیروباوەڕی سیاسی باوك و دایکیان کارێکی سامناکە، ئایا دەبوو منیش لەبەر باوکی ڕقم لێی بوایە؟ دڵم پێی سووتا، چونکە باوکیان کوشتبوو، دڵم پێی سووتا، چونکە باوکی ناردنی هاوڕێیەکی بەرەو مەرگ بە پێویست زانی بوو"

تەلەفۆنەکە لێیدا، سکریتا هەڵی گرت و گوێی گرت، تووڕە دیاربوو، وتی: "ئێستا زۆر سەرقاڵم، ئایا بەڕاستیی پێویستتان بە منە؟" دوای کەمێکی دی وتی: "ئاه، زۆر باشە، وادێم"

تەلەفۆنەکەی داناو لە ژێر لێوەوە کەوتە جوێن دان.

یاکوب لە کاتێکدا لەسەر کورسییەکەی هەڵدەستا وتی: "ئەگەر کارت هەیە سەرقاڵت ناکەم، بە هەرحالّ دەبێت بڕۆم"

سکریتا وتی: "ناڕۆیت، لەبارەی هیچ شتێکەوە بواری قسەکردنمان بۆ نەڕەخسا، شتێك هەبوو دەمویست ئەمڕۆ لەگەڵ تۆدا قسەی تیا بکەین، وا قسەکەم لە یاد کرد، بابەتێکی زۆر گرنگ بوو، لە بەیانییەوە تا ئێستا بیرم لێکردۆتەوە، دەتوانیت بزانیت باسی چی بووە؟"

یاکوب وتی "نەخێر"

"نەفرەت، وا ئێستایش منیان لە گەرماوەکە دەوێت.."

یاکوب وتی: "ئەمە چاکترین شێوەی ماڵئاواییە، ڕێك لە ناوەڕاستی قسەکردندا"و دەستی هاوڕێکەی گوشی.

—17—

جەستەی ڕۆزینا لە ژوورێکی بچووکدا، کە زیاتر بۆ پزیشکە نۆبەت گرەکانی شەو تەرخان بوو، کەوتبوو، چەند کەسێك دەوری ژوورەکەیان گرتبوو، لێکۆڵەرەوەی پۆلیسیش پێشان هاتبوو، لێکۆڵینەوەی لەگەڵ فرانتادا کردو ڕاپۆرتی خۆی نووسی، فرانتا جارێکی تر پاڕایەوە کە دەستگیری بکەن.

لێکۆڵەرەوە پرسی: "ئایا ئێوە حەبەکەتان داوەتێ؟"

"نەخێر"

"کەواتە ئیتر مەڵێ تۆ کوشتووتە"

فرانتا وتی: "هەمیشە هەڕەشەی خۆ کوشتنی دەکرد"

"بۆچی؟"

"دەیوت ئەگەر سەر ئێشەی بۆ پێش بێنم خۆی دەکوژێت. دەیوت منداڵی ناوێت و، خۆ کوشتنی لە منداڵداری پێ چاکترە"

دکتۆر سکریتا هاتە ژوورەوە، لەگەڵ لێکۆڵەرەوەدا چاك و چۆنی گەرمی کردو، بەرەو لای کچە مردووەکە چوو، پێڵوی بەرزکردەوەو تەماشای ناوچاوی کرد.

لێکۆڵەرەوە پرسی: "دکتۆر، تۆ لێپرسراوی ئەم سستەرە بوویت؟"

"بەڵێ"

"تۆ بڵێی لە ژەهرێکی ناو عیادەکەی تۆ کەڵکی وەرگرتبێت؟"

سکریتا لەبارەی چۆنیەتی مەرگی ڕۆزیناوە پرسیاری کرد، پاشان وتی: "لەوە ناکات لە هیچ یەك لەو دەرمانانە بچێت کە لە عیادەکەی مندا هەیە. ئەم ژارە بێگومان دەبێت جۆرێك لە تفتەکان بێت، بەلام جۆرەکەی تەنیا بەهۆی توێکارییەوە دەردەکەوێت"

"چۆن توانیویەتی دەرمانێکی وا دەست بخات؟"

"تفتەکان مادە گەلێکن لەگیای تایبەتی بەدەست دێن، نازانم چۆن توانیویەتی دەرمانی تفت بەدەست بێنێت"

لێکۆڵەرەوە وتی: "شتەکان زۆر ئاڵۆز و گوماناوین، تەنانەت هۆکارەکەیش. ئەم کوڕە لاوە باسی ئەوەی کرد کە کۆرپەیەکی ئەویی لە سکدا بووەو، ویستوویەتی لەبار خۆی بەرێت"

فرانتا هاواری لێ هەستا "ئەو خستیە سەر ئەو کەڵکەڵەیە"

لێکۆڵەرەوەکە پرسی "کێ؟"

"ترومپیت ژەنەکە! دەیویست لێم بسێنێت و، ناچاری کرد منداڵەکەمی پێ فڕێدات، دوای هەمووی کەوتووم، داوایان لە لیژنەی منداڵ لەباربردن کردبوو"

دکتۆر سکریتا وتی "دەتوانم بڵێم ئەمە ڕاستە، بەڕاستیی ئەمڕۆ لە بارەی داواکاریی منداڵ لەباربردنی ئەم سستەرەوە قسەمان کرد"

لێکۆڵەرەوە پرسی: "ترومپیت ژەنەکەیشی لەگەڵدا بوو؟"

سکریتا وتی: "بەڵێ، سستەرەکە وەك باوکی منداڵەکەی ناوهێنا بوو"

فرانتا قیژاندی "درۆیە، منداڵی خۆمە"

دکتۆر سکریتا وتی "کەس لەم بارەیەوە گومانی نییە، بەلام ڕۆزینای سستەر ناچار بوو ناوی پیاوێکی ژندار بهێنێت وەك باوکی منداڵەکە، بۆ ئەوەی لیژنەکە بڕیار لەسەر لەبار بردنەکە بدات"

فرانتا بەسەر دکتۆر سکریتادا نەڕاندی "کەواتە هەر لە ئەوەڵەوە زانیوتە ئەمە درۆیەکی قێزەونە!"

"بەپێی یاسا قسەی ژن دەخوات و سێ و دووی لەگەڵدا ناکرێت، ڕۆزینا بە ئێمەی وت کۆرپەی کلیمای لە سکدایە، کلیمایش هەر بڕوای وابوو، لەبەرئەوە کەسمان بۆمان نەبوو ڕێ بە قسەکەی بگرین"

لێکۆڵەرەوە پرسی: "بەڵام بڕوات بە باوکایەتی کلیما نەبوو"

"نەخێر"

"چ هۆیەك ئەو بڕوایەی دایتێ؟"

"جەنابی کلیما بە هەمووی دووجار هاتۆتە ناوچەی ئاوەکانزاییەکان و، هەموو سەفەرێکی زۆر کورت بووە، هەر زۆر دوورە پەیوەندییەکی هێند نزیك لەنێوان ئەوو ڕۆزینادا دروست بووبێت، گەڕاوەکانی ئێمە هێند بچووکە هەواڵێکی لەو بابەتە زۆر ناشاردرێتەوە، گەلێك شیمانەی ئەوە هەیە، باوکایەتیەك کە دراوەتە پاڵ جەنابی کلیما تەنیا بۆ شاردنەوە بێت، ڕۆزینای سستەر تەنیا لەبەر ئەوە کلیمای قایل بە هاوکاری خۆی کرد تا کۆمسیۆن ڕازی بێت بە لەباربردنەکە، دەتوانیت ئەوە بزانیت ئەم پیاوەی ئێستا لێرەیە ئامادەی ئەو هاوکاری کردنە نەبووە"

ئیتر فرانتا گوێی لە قسەی سکریتا نەدەگرت، بیری لاڵ ببوو، بەردەوام تەنیا گوێی لە وتەکانی ڕۆزینا بوو: "تۆ ناچارم دەکەیت خۆم بکوژم، دڵنیام ئەم کارەم پێ دەکەیت" ئەو لەوە دڵنیا بوو کە هۆی مردنیەتی، بەڵام بەڕاستیی نەیدەزانی چۆن و، نەیشیدەتوانی مانای ئەم هەمووە دەرك بکات، وەك مرۆڤێکی کێویی ڕووبەڕووی موجیزەیەك، وەك کەسێکی سیحر لێکراو وەستابوو، کەڕولاڵ، چونکە هەستی توانای ئەوەی نەبوو هەرچییەك قابیلی تێگەیشتن نەبوو دەرکی بکات.

"فرانتای هەژار، تۆ هەتا ماویت هەنگاوی نەزانانە دەنێیت، تەنیا ئەوەت لە بیر دەمێنێت خۆشەویستیت ژنێکی کوشتووە کە تۆ عاشقی بوویت، پیاوی نەزان، شووم، مۆرێکی نەگبەتی بە ناوچاوتەوە نراوەو ڕێگا دەبڕیت"

ڕەنگی پەڕیبوو، وەك پەیکەرێکی خوێ بێ جووڵە بوو، ئاگای لێ نەبوو پیاوێك بە شڵەژاوی هاتبووە ژوورەکەوە، پیاوە بەرەو لای کچە مردووەکە چوو، ماوەیەکی زۆر تێی ڕاما، دەستی بە قژیا هێنا.

دکتۆر سکریتا لەسەرخۆ وتی "خۆی کوشتووە، ژەهری خواردووە"

پیاوە تازە هاتووەکە لە پڕێکا سەری وەرگێڕا "خۆ کوشتن، بێگومانم ئەم ژنە خۆی نەکوشتووە، مادام ژەهر خواردنە کوشتنی ئەنقەستە"

لێکۆڵەرەوەکە تەماشایەکی سەیری پیاوەکەی کرد، بارتلیف بوو، لە داخا چاوی وەك ئاگر دەسووتا.

## -18-

یاکوب ئۆتۆمبیلەکەی خستە گەڕو بەڕێکەوت، پاش کەمێك دوا ڤیلاکانی ئاوەکانزاییەکانی جێ هێشت و خۆی لە دەشتێکی فراواندا دیتەوە، تا سەر سنوور چوار سەعات ڕێگابوو، حەزی لە پەلەکردن نەبوو، ئەو کە دەیزانی ئیدی وڵاتەکەی نابینێتەوە، سەرزەمینەکەی بەهاو نرخێکی تایبەتی پەیداکردبوو، وای دەهاتە بەرچاو کە ئەو وڵاتە ناناسێت، بە پێچەوانەی ئەوەی دەهاتە بەرچاو کە بیری لێ کردبوەوە، بە داخیش بوو کە ناتوانێت لەوە زیاتر بمێنێتەوە.

لەگەڵ ئەمانەیشدا هەستی کرد دواخستنی بڕیارەکەی، چ ڕۆژێك و چ ساڵێك، لەڕاستیا هیچ شتێك ناگۆڕێت، چەندیش بمایەتەوە زانیاریی زۆرتری لەسەر نیشتمانەکەی زیادی نەدەکرد، لەگەڵ ئەو حەقیقەتە غەماوییەدا

یەکانگیر دەبوو لە کاتێکدا شوێنی لەدایکبوونی بەجێ دەهێڵێت کە نەیناسیبوو، بەهەرەی لە هیچی نەبردبوو، قەرزارێك بوو قەرزەکانی نەدابووەوەو، داواکارێکیش بوو نەیتوانیبوو داواکانی بگەیەنێت.

پاشان بیری لەو کچە کردەوە کە ژەهرێکی ساختەی دابوویەو، بەخۆی وت سەردەمی مرۆڤ کوژییەکەم کەمترین دەورەی تەمەنم بووە، زەردەخەنەیەکی کرد: بۆ ماوەی هەژدە سەعات بکوژ بووم.

وەلێ دوایی بە ڕقەوە وەلامی خۆی دایەوە: نا، ئەمە ڕاست نییە کە بۆ ماوەیەکی کەم بکوژ بووە. لە ئێستاوە تا کۆتایی تەمەنی هەر تاوانبارو بکوژە. چونکە ئەوە گرنگ نییە کە حەبە شین باوەکە ژەهراوی بووە یان نا، بەڵکو گرنگی لە دڵنیاییەکەی ئەودا بوو کە حەبەکە ژەهرەو دەکوژێت و کەچی دابوویە غەریبەیەك بێ ئەوەی هەوڵێکی ڕزگاربوونی بدات.

وەك هێوریی پیاوێك بڕوای وا بێت کارەکەی بێجگە لە ئەزموونگەرییەکی ڕووت چیتر نەبووەو لە دنیای واقیعدا بێ بایەخ و بێ ئەنجامە، لەو بارەیەوە کەوتە بیرکردنەوە.

دەستپێشکەری بۆ بەئەنقەست کوژییەکەی کارێکی سەیر بوو: بێ هۆ کوشتن، بێ ئەوەی هیچی لەو کارە دەست بکەوێت، ئەی ئەمە چ مانایەکی هەیە؟ تاقە مانایەك کە لەو کارەوە بەدەست بێت ئەوە بوو تێ بگات کە ئەو بکوژە.

مرۆڤ کوشتن چون کارێکی ئەزموونگەریی وەك کارێك بۆ تاقیکردنەوەی ڕۆحی مرۆڤ، چیرۆکێك بوو دەیزانی: چیرۆکی ڕاسکولینکۆف[2]. ئەو بۆ ئەوەی وەلامی ئەم پرسیارە بە خۆی بداتەوە مرۆڤێکی کوشت: ئایا مرۆڤ مافی ئەوەی هەیە مرۆڤی ژێر دەستەی خۆی بکوژێت و ئایا توانای ئەوەی هەیە بەرگەی ئەنجامەکەی بگرێت؟

کوشتن بە دەستی ئەنقەست پرسیارێك بوو دەبوو بکرایە.

بەڵێ، کارەکەی یاکوب لەوەی ڕاسکولینکۆف دەچوو: بێ مانایی تاوان، تایبەتمەندییە تیۆریەکەی، بەڵام جیاوازیشیان هەبوو: ڕاسکولینکۆف پرسیاری ئەوەی دەکرد کە ئاخۆ مرۆڤێکی لێهاتوو هەقی ئەوەی هەیە لەبەر قازانجی خۆی یەکێکی ژێر دەستی خۆی بکاتە قوربانی؟ بەڵام یاکوب کە شووشە دەرمانەکەی دایە دەستی سستەرەکە شتێکی لەم بابەتەی لە خەیاڵدا نەبوو، یاکوب پەیوەندی بەوەوە نەبوو لەو پرسیارە بکۆڵێتەوە کە ئایا مرۆڤ هەقی ئەوەی هەیە ژیانی یەکێکی تر نابووت بکات. بە پێچەوانەوە، یاکوب بڕوای وابوو هیچ کەسێك ئەو جۆرە هەقەی نییە، لە ڕاستیا، بێ باکیی گەلێك ژن و پیاو کە لە خۆوە بانگەشەی ئەو هەقەیان بۆ خۆیان دەکرد ئەمی سەرسام کردبوو. یاکوب لە دنیایەکدا دەژیا تیایدا ژیانی مرۆڤ بۆ بیروباوەڕێکی ڕووت بە ئاسانی بەخت دەکرا.

دەموچاوی ئەو پیاوو ژنە لووت بەرزانەی دەناسی: نەك دەموچاوی شەڕاوی، بەڵکو دەموچاوی شەریف، کە جۆش و خرۆشی هەق و عەدالەت شەوقی دابێتێ و هاوڕێیەتی و خۆشەویستی بیدرەوشێنێتەوە. ئەو دەموچاوانەی کە پاکیەتیەکی زبرو ڕەق ڕەنگیان تیا ئەداتەوە، ئەوانەی کە پاساوێکی ترسنۆکانەیان دەخوارد، لە ژێر لێوەوە داوای لێبوردنیان دەکرد، بەڵام ئەو فەرمانانەیان دەردەکرد کە هەموو دەیانزانی زاڵمانەو ناعەدالەتن و بەزۆر ئەنجام دەدرێن. یاکوب ئەو دەموچاوانەی دەناسی و نەفرەتی لێدەکردن. بێجگە لەمانە، یاکوب دەیزانی هەموو مرۆڤێك لە ناخیا ئارەزووی مەرگی مرۆڤێك دەکات و تەنیا دوو شت ڕێگای لێ دەگرێت: ترس لە سزادان و ئەو کێشە مادییەی کە لە ئەنجامی کوشتنەکەوە تووشی دێت، یاکوب دەیزانی ئەگەر هەرکەسێکی سەر ئەم زەوییە بیتوانیایە بە شێوەیەکی نهێنی و فراوان

مرۆڤ بکوژێت، لە ماوەی چەند دەقیقەیەکدا مرۆڤایەتی قەلاچۆ دەکرا، لەبەر ئەمانە بە لایەوە ئەزموونی ڕاسکولینکۆف هیچ پێویست نەبوو.

ئەی کەواتە بۆ ژەهری بە سستەرەکەدا؟ ئایا هەر تەنیا ڕێکەوت بوو؟ هیچ نەبێت ڕاسکولینکۆف بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بیری لە نەخشەکەی کردبوەوەو خۆی بۆ ئامادە کردبوو، لە کاتێکدا کە ئەو لەسەر بنەمای تەنیا دڵەڕاوکێیەکی یەك چرکەیی کارەکەی ئەنجام دابوو، لەگەڵ ئەوەیشدا یاکوب هەستی بەوە کرد ئەویش بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت لە ساڵانێکی زووەوە خۆی بۆ ئەم کارە ئامادە کردووەو، ئەو کاتەی ژەهرەکەی دایە دەست ڕۆزیناوە بوو بە درزێك کە دەیتوانی تەواوی ڕابووردووی، تەواوی نەفرەتی لە خەڵکی بخاتە ناویەوەو دەسەڵات بەدەست بێنێت.

ڕاسکولینکۆف کە پیرەژنە سەلەمخۆرەکەی بە تەور کوشت زانی لە بەردەم کارێکی ترسناکدایە، زانی سنووری فەرمانی خوای بەزاندووە، ئەگەرچی پیرەژنەکە بوونەوەرێکی چرووك بوو، بەڵام خوا دروستی کردبوو، یاکوب هەستی بەو جۆرە ترسەی ڕاسکولینکۆف نەدەکرد. لە دیدی ئەودا خەڵك دروستکراوی خوا نەبوون، یاکوب شەیدای ڕەسەنایەتی و شکۆمەندی بوو، بەڵام پەی بەوە بردبوو کە ئەوانە ئاکاری مرۆڤایەتی نین. ئەو مرۆڤی باش دەناسی و بۆیە حەزی پێ نەدەکردن، یاکوب شەریف و ڕەسەن بوو بۆیە ژەهری بەوان دەدا.

بە خۆی وت: من لەبەر ڕەسەنایەتی و شەرافەتی ڕۆحم پیاوکوژم، ئەمەیش هەر بۆ پێکەنین و گریان چاکە.

ڕاسکولینکۆف دوای کوشتنی سەلەمخۆرە پیرەکە نەیتوانی جڵەو لە شەپۆلی ترسناکی سەرکۆنە کردنە کتوپڕەکەی ویژدانی بگرێت.

یاكوب كە بڕوای تەواوی بەوە هەبوو هیچ كەسێك هەقی ئەوەی نییە ژیانی كەسانی تر بكاتە قوربانی، هەرگیز هەستی بە ئازارێك نەدەكرد كە سەرچاوەكەی پەشیمانی بێت. بەمەیشەوە، ئەو سستەرەی كە ژەهری پێدا بوو بێگومان بوونەوەرێك بوو لە پیرە سەلەمخۆرەكەی ڕاسكولینكۆف شیاوو خۆشەویستتر.

یاكوب ویستی وای بداتە قەڵەم كە بەڕاستیی مردنی سستەرەكە بۆ تاقیكردنەوەی ئەم و هەستكردنی بە ئازاری ویژدان بووە، بەلام نا، ئەم بیرۆكەیە نەیتوانی گیانی پڕبكات لە هەستی تاوانباریو، لەسەرخۆو ئارام لە فەزایەكی سەوزی دڵگیردا لە دەرەوەی شار دەیئاژوو ماڵئاوایی لەو دیمەنانە دەكرد.

ڕاسكۆلینكۆف پیاوكوژییەكەی خۆی وەك كارەساتێك تاقیكردەوەو لەژێر باری گرانی كارەكەیدا سەرسام بوو، یاكوب لە پەی بردن بەوەی كە كارەكەی سووكەو، بەرگەگرتن لە بەریا ئاسانەو، وەك هەوا سووكەڵەیە سەرسام بوو، لە خۆیشی پرسی ئایا ئەم سووكییە ترس و وەحشەتی لە هەموو ئەو ئازارە سەختانە زیاتر نییە كە لە قارەمانە ڕووسیەكەدا هەبوو؟

لەسەرخۆ دەیاژووت، تەماشاكردنی دیمەنە سروشتیەكان شیرازەی بیركردنەوەكانی دەبڕی، بەخۆی وت مەسەلەی سستەرەكە تەنیا گەمەیەك، گەمەیەكی بێ بایەخ بوو، وەك هەموو ژیانی كە هیچ ئاسەوارێك، هیچ ڕیشەیەك، هیچ نیشانەیەكی لەم سەر زەمینە -ئەو سەرزەمینەی كە ئێستا وەك كزەبایەك بەجێی دێڵێت- دانانێت.

-19-

کلیما کە چارەکە لیترێك خوێنی دابوو، لە ژووری چاوەڕوانی دکتۆر سکریتادا بە پەرۆشەوە چاوەڕێی ئەوی دەکرد، نەیدەویست بێ ماڵئاوایی کردن لە دکتۆر و ڕاسپاردەی چاودێری کردنی ڕۆزینا ئاوەکانزاییەکان بەجێ بهێڵێت. **تا ئەو کاتەی کە منداڵەکەیان دەرنەهێناوە، هێشتا دەتوانم لە بڕیارەکەم پەشیمان ببمەوە.**

ئەم وشانەی ڕۆزینا لە گوێیدا دەزرنگایەوەو ترسی وەبەردەنا، لەوە دەترسا کە ئەم لێرە بڕوات ئیدی ڕۆزینا کاریگەری ئەمی لەسەر نەمێنێت و دەشێت لە دوا دەقیقەدا لە بڕیارەکەی پەشیمان ببێتەوە.

لە پڕا دکتۆر سکریتا دەرکەوت، کلیما بە پەلە ڕۆشت تا تەوقەی لەگەڵدا بکات، ماڵئاوایی لێ بکات و سوپاسی ئەوەی بکات کە تەپڵی لێ دەدا.

دکتۆر سکریتا وتی: "شەوێکی خۆش بوو، کارەکەت ناوازە بوو، هیچ شتێکم لە سازدانی کۆنسێرتێك پێ چاکتر نییە، بەڵکو بتوانین لە ئاوەکانزاییەکانی تریشدا سازی بکەین"

ترومپێت ژەنەکە بە پەرۆشەوە وتی "منیش پێم خۆشە، لەو پشتگیرییەی کردمت بەڕاستی سوپاسگوزارم" لە سەر قسەکانی ڕۆشت "هیوادارم کارێکم بۆ بکەیت، چاوت لە ڕۆزینا بێت، دەترسم دەبەنگی بکات و شتێك بخاتە مێشکییەوە، ژن شتی سەیری لەدەست دێت"

دکتۆر سکریتا وتی: "ئیدی هیچ بیرێکی بە مێشکا نایەت، مەترسە، ڕۆزینا مرد"

کلیما تەواو لە مەبەستەکەی سکریتا نەگەیشت و، دکتۆر ناچار بوو باسەکەی بۆ بگێڕێتەوە. پاشان وتی: "خۆی کوشتووە، بەڵام هەندێك نهێنی تیایە، ڕەنگە خەڵکی بیری جۆراوجۆر و سەیری لێ بکەنەوە، دەزانیت،

خۆکوژی دوای سەعاتێك لە ئامادەبوونی لەبەردەم لیژنەی منداڵ لەباربردندا، بەڵام تکات لێدەکەم نیگەران مەبە"

کە بینی ڕەنگی ترومپیت ژەنەکە پەڕیوە، توند دەستی گرت: "خۆشبەختانە ئەم سستەرەمان لەگەڵ فیتەرێکی لاودا کە دڵنیایە منداڵەکە لەوە پەیوەندی هەبووە، من پێم وتن تۆ هەرگیز هیچ جۆرە پەیوەندییەکی نزیکت لەگەڵ ڕۆزینادا نەبووەو، لەبەر ئەوەیش کە ئەگەر هەردوولا ڕەبەن بوونایە لیژنەکە ڕێگای بە لە باربردنی منداڵەکەی نەدەدا، تۆی وا لێکردبوو دەوری باوك ببینیت. تەنیا ئەوەم لە تۆ دەوێت ئەگەر پرسیاریان لێ کردیت ئاگات لە خۆت بێت. دەتبینم تەواو پەشۆکاویت بەداخەوە دەبێت خۆت بگریت، کۆنسێرتی زۆرمان لە پێشدایە"

کلیما کە بە تەواوی زمانی چوبووە کلیلە، هەر دەستی سکریتای دەگوشی.

کامیلا لە ژوورەکەیدا لە ساختمانەکەی ریچموند چاوەڕێی بوو، کلیما توند لە ئامێزی گرت و پاشان بە تاسەوە کەوتە ماچ کردنی، لە پێشدا هەموو دەموچاوی ماچ کرد، دوایی لەبەردەمیا لەسەر ئەژنۆ کەوت و لەسەرەوە تا داوێنی جلەکەی ماچ کرد.

"چیتە؟"

"هیچ، هەر لەبەر ئەوەی لەگەڵتام زۆر بەختەوەرم، بە بوونت گەلێك خۆشحاڵم"

جانتاکانیان هەڵگرت و خستیاننە ناو ئۆتۆمبیلەکەوە.

کلیما وتی ماندووەو داوای لەو کرد ماشێنەکە لێ بخوڕێت.

هێدی هێدی دەیانئاژووت، کلیما زۆر ماندوو بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا گەلێك ئاسوودە بوو، بیرکردنەوە لەوەی کە ڕەنگە بەرەو ڕووی پرسیارو لێکۆڵینەوە

بێتەوە تووشی دوو دڵی کردبوو، لەوە دەترسا کامیلا بەو شتە بزانێت، بەڵام قسەکانی دکتۆر سکریتای بۆخۆی دووبارە دەکردەوە. خۆ ئەگەر لێکۆڵینەوەیشی لەگەڵدا بکرێت، دەوری کەسێکی بێ تاوان و شەریف دەبینێت (ئەمە لە وڵاتەکەیدا کارێکی نائاسایی نییە) کە تەنیا بەزەیی بە ژنێکی گەنج و جواندا هاتۆتەوەو خۆی کردۆتە باوك. هیچ کەسێك، تەنانەت کامیلاش لەسەر کارێکی وا جوامێرانە سەرکۆنەی نەدەکرد.

تەماشای کامیلای کرد. جوانییەکەی وەك عەترێکی مەستکەر فەزای چکۆڵەی ئۆتۆمبیلەکەی پڕکردبوو، هەستی کرد لە هەڵمژینی ئەو عەترەدا هەتا ماوە خۆشحاڵ و شاد دەبێت. لە خۆیدا گوێی لە دەنگی هێورو ئارام بەخشی ترومپیت بوو، بڕیاریدا هەتا ماوە تەنیا بۆ دڵخۆش کردنی ئەم ژنە، ئەم ژنە خۆشەویست و ئازیزەی، کە یەکەم و دوا عەشقی ئەوە ترومپیت لێ بدات.

−20−

هەر کاتێك لە پشت ستێرنەوە دادەنیشت، بەردەوام هەستی وابوو کە بەهێزترو سەربەخۆترە. بەڵام ئەمجارەیان تەنیا لێخوڕین ئەو پشت بە خۆبەستنەی نەدەدایە، بەڵکو ئەو قسانەیش کە پیاوە نەناسەکە لە ڕاڕەوی ساختمانەکەی ریچموندا پێی وتبوو، نەیدەتوانی ئەو قسانە لە بیرخۆی بەرێتەوە، دەموچاویشی هەر لە بیرنەدەچووەوە کە زۆر لە ڕوومەتی ناسکی مێردەکەی پیاوانەتر بوو. ئەوە بە بیر کامیلادا هات کە هەرگیز لەگەڵ پیاوێکی وادا ئاشنا نەبووە.

بە لایەکی چاو تەماشای دەموچاوی ماندووی ترومپیت ژەنەکەی کرد کە لەو کاتەدا دەستی خستبووە سەرملی و پێ دەچوو نوقمی زەردەخەنەیەکی قایل بوون بێت.

ئەم زیادە ڕەویی خۆشویستنە نە خۆشیی پێداو نە کاری تێکرد، بەڵکو زیاتر گومانی لا دروست کرد کە ترومپیت ژەنەکە نهێنیەکی لیٚ دەشارێتەوە، کلیما ژیانێکی زۆر تایبەتی خۆی هەیە کە ئەمی تیا جیٚ ناکاتەوە. بە هەر حاڵ ئەمجارەیان نەك بە هەڵچوون و دوودڵیەوە بەڵکو بیٚ دەربەستانە ڕەفتارەکانی وەرگرت.

ئەو پیاوە چیی وتبوو؟ وتبووی دەیەوێت بۆ هەتا هەتایە بڕوات، دڵی کامیلا پڕ بوو لە تاسەیەکی شیرین و بە ئازار، نەك تەنیا تاسەی ئەو پیاوە، بەڵکو تاسەی دەرفەتە لە دەستچووەکان، نەك تەنیا یەکێك، بەڵکو تێکڕای دەرفەتەکان، ئەو دەرفەتانەی بە هەدەری دابوون، لە دەستی دابوون، گوێی پیٚ نەدابوون، تەنانەت ئەو دەرفەتانەیش کە هەر پێیان نەگەیشتبوو.

پیاوە نەناسەکە وتبووی کە هەموو ژیانی وەك کوێرێك بەسەر بردووەو هەرگیز بەوەی نەزانیوە شتێکی وەك جوانیی هەیە، کامیلا لەو دەگەیشت، ئایا مەسەلەکە لە بارەی خۆیشیەوە هەر وا نەبوو؟ ئەویش هەر بە کوێریی ژیانی بەسەربردبوو، چاوی کە گڕی ئیرەیی پیٚ بردنی تیا دەدرەوشایەوە تایبەت بوو بە یەکێکەوە، ئەگەر لە پڕا ئەو گڕە کوژایەوە چی؟ هەزاران کەسی تر لە ڕووناکی ڕۆژدا دەردەکەون و، ئەو پیاوەی وای دەهاتە بەرچاو کە دەگمەنە زۆر ئاسایی دەبێت بە یەکێك لەو هەموو پیاوانەی تر.

ستێرنەکەی گرتبوو، پشتی بە خۆی و جوانییەکەی قایم بوو، کەوتە بیرکردنەوە: ئایا بەڕاستیی خۆشەویستی ئەوی بە کلیماوە گرێدابوو، یان تەنیا ترسی لە دەستدانی ئەو؟ تەنانەت ئەگەر لە سەرەتاوە، ئەو ترسە شێوەو قاڵبێکی پڕ لە نائارامیی عەشق بووبێت، ئایا عەشق (بەم ماندوویەتییەوە) وردە وردە لەناونەچوو بوو، بێجگە لە قاڵبێکی بەتاڵ هیچی لیٚ مابوەوە؟ ڕەنگە

تاقە شتێك كە بۆی مابێتەوە تەنیا خودی ترس بێت، ترسی بێ عەشق، خۆ ئەگەر ئەو ترسەی لە دەست بدایە، چی بۆ دەمایەوە؟

لە پاڵیا، ترومپیت ژەنەكە دیسان بێ هیچ بۆنەیەكی ئاشكرا دەخنایەوە، كامیلا تەماشایەكی كرد و بە خۆی وت: كاتێك كە ئێرەییەكەی لە دەست ئەدات، ئیدی هیچ شتێك نامێنێتەوە، خێراتر ئاژووتی و، لە پڕا لەوە بە ئاگا هات كە شوێنێك، لە بەرانبەردا ڕێگاكە دەكاتە دوو كەرتەوە. لەو كاتەوەی شووی بە ترومپیت ژەنەكە كردووە، ئەمە یەكەمین جارییەتی بیری لێ جیابوونەوەی هیچ جۆرە نائارامیەكی تیا دروست نەكات.

−21−

ئۆلگا چووە ئاپارتمانەكەی بارتلیفەوە و داوای لێبوردنی لێكرد. "داوای لێبوردن ئەكەم كە بەم شێوەیەی هاتوومەتە ژوورەكەتانەوە تووڕە نەبن، لە حاڵ و بارێكی وا بێزراودا كە منی تیام ناتوانم تەنیا بم، ئایا نابمە هۆی بێزاریتان؟"

لێكۆڵەرەوەی پۆلیسیش لەگەڵ بارتلیف و سكریتا لە ژوورەكەدا بوو، ئەو وەڵامی دایەوە: "نەخێر، بێزارنابین، كاری ڕەسمیمان تەواوكردووەو وا خەریكی دەمەتەقێین"

دكتۆر سكریتا ڕوونكردنەوەیەكی دایە ئۆلگا "لێكۆڵەرەوە یەكێكە لە هاوڕێ كۆنەكانم"

"ئاخر ئەو كچە بۆ ئەوكارەی كرد؟"

"لەگەڵ لاوێكی هاوڕێیدا دەمەقاڵێ بووە، لەو بێنەو بەردەیەدا لە ناكاو شتێك لە جانتا دەستییەكەی دەردێنێت و دەیخاتە دەمیەوە، تاقە شتێك كە بیزانین ئەمەیە، بە داخەوە ئەمە تەنیا شتێكە كە لەبەر دەستماندا بێت"

بـارتلیف شـێلگیرانه وتـی: "لێکۆڵـەرەوەی بـەڕێز، داوای پـۆزش ئەکـەم، دەمەوێت چیم پێ وتوون لەبەرچاوی بگرن، ڕۆزینا دوا شەوی تەمەنی لەم ژوورەدا و لەگـەڵ منـدا بەسـەر بـردووە، ڕەنگـە نـەمتوانیبێت بـە تـەواوی مەسەلەکەتان بۆ ڕوون بکەمەوە: شەوێکی تەواو خۆش و بێ ئەندازە ڕۆزینا شادمان بوو، ئەو کچە سادەو ئاساییە تەنیا دەبوو لە کۆت و بەندی ساردو دڵـەڕاوکێی دەوروبەرەکـەی ڕزگـاری بێـت و ببێتـە مرۆڤێکـی تـەواو جیـاواز، مرۆڤێکی شاد، پڕ لە خۆشەویستی، میهرەبانی و ڕەسەنایەتی.

ئێوە نازانن چ مرۆڤێکی دلۆڤان لە ناوەوەی ئەودا خـۆی حەشـار دابـوو، دووبارەی دەکەمەوە: دوێ شەو دەرگایەکی تازەم لەسەر ژیانی کردەوەو، ئەو بە پەرۆشەوە کەوتە کەڵکەڵەی نێو ئەو ژیانەوە، بەڵام یەکێك ڕێگاکەی لێگرتم" بارتلیف وەستا، پاشان لەسەرخۆ وتی: "دەبێت هێزێکی دۆزەخی بووبێت"

لێکۆڵەرەوە وتی: "بە داخەوە کـە پێـی هـێزە دۆزەخیـەکان دێتـە نـاوەوە پۆلیس هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی نامێنێت"

بـارتلیف گوێـی بـە توانجەکـە نـەدا " لـەم بارەیـەوە ڕا لەسـەر خۆکوشـتن قسەیەکی بێ مانایە، تکایە بە هەند وەری بگرن، هەرگیز ناشێت لە کاتێکدا ئەو بڕیاری ژیانێکی تری دابێت خۆی بکوژێت! جارێکیتر دووبارەی دەکەمەوە ڕێگا بەکەس نادەم تاوانی خۆکوژی بداتە پاڵ ئەو کچە"

لێکۆڵەرەوەکە وەڵامی دایەوە: "بـەڕێز، کـەس ئـەوی بـە خۆکـوژ تاوانبـار نـەکردووە، چونکـە، خۆکوشـتن تـاوان نییـە، چ پەیوەندییەکیشـی بـە سـزای جینایەتەوە نییەو، پەیوەندی بە ئێمەیشەوە نییە"

بارتلیف وتی: "بەڵێ، ئێوە خۆکوشتن بە گوناه و تاوان نازانن، چونکە لە ڕوانگەی ئێوەوە ژیان هیچ نرخێکی نییە، بـەڵام جـەنابی لێکۆڵـەرەوە بـەلای منەوە چ گوناهێك لە خۆکوژی گەورەتر نییە، لە پیاوکوشتن خراپترە، ڕەنگە

هۆی پیاوکوژی تۆڵە یان تەماع بێت، بەڵام تەنانەت تەماعیش جۆرێکە لە خۆشەویستییەکی ناپەسەندی ژیان، وەلێ ئەو کەسەی خۆی دەکوژێت بە زەردەخەنەیەکی تەوساوییەوە توانای خوا لەگۆڕ دەهاوێت، خۆ کوژی تف هەڵدانە بە ڕووی یەزداندا، پێتان دەڵێم بۆ سەلماندنی بێ گوناهی ئەو کچە چ کارێکم پێ بکرێت دەیکەم، تۆ دەڵێیت ئەو خۆی کوشتووە، وەلێ پێم بڵێن بە کامە بەڵگە، شیمانەی چ ئەنگێزەیەك لە ئارادایە؟

لێکۆڵەرەوە وتی: "هۆکاری خۆکوژی هەمیشە نهێنین، بێ لەوەیش، گەڕان بەدوای ئەو هۆیانەدا کاری من نییە، نابێت لەبەر ئەوەی کە من بە وردی پابەندی ئەرکی خۆمم تۆ بێزاربیت، کارم زۆرەو هەر هێندەیش کاتم بە دەستەوەیە، فایلەکە دانەخراوە، بەڵام دەتوانم لە ئێستاوە ئەوەت پێ بڵێم کە گومان ناکەم هیچ گۆڕانێکی تازە و هەژێنەر ڕووبدات"

بارتلیف زۆر بە ساردییەوە وتی: "جەنابی لێکۆڵەرەوە، زۆرم بەلاوە سەیرە، هەر ئاوا بەم خێراییە خاڵێك لە کۆتایی ژیانی مرۆڤێك دادەنێیت!"

ئۆلگا لە دەموچاوی لێکۆڵەرەوەکەی ڕوانی کە چۆن لە داخا داگیرسا بوو، بەڵام دوایی خۆی کۆنترۆڵ کرد و، پاش کەمێك بێدەنگی بە دەنگێکی تاڕادەیەك زۆر ئاساییەوە وتی: "زۆر چاکە، با گریمانەی ئەوە بکەین کە ئێوە ڕاست دەکەن و تاوانێکی کوشتن ڕوویداوە، با وێنای ڕوودانی ئەو شیمانەیە بکەین. لە جانتای دەستیی مردووەکەدا شووشەیەك دەرمانی ئازار شکێنمان دۆزیوەتەوە، با وای دابنێین کە ڕۆزینا ویستبێتی لە حەبی ناو شووشەکە یەکێك بخوات، بەڵام کەسێك حەبێکی تری لەو شێوەیە، بەڵام ژەهراوی خستۆتە جێگای ئەو حەبەوە"

دکتۆر سکریتا وتی: "تۆ لەو بڕوایەدایت ئەو حەبەی ڕۆزینا خواردوویەتی لە ناو ئەو شووشەیەدا بووبێت کە حەبی ئازار شکێنی تیابووە؟"

"هەڵبەتە دەشێت ژەهرەکە بە تەنیا لە جانتا دەستیەکەیدا بووبێت، ئەمە لە کاتێکدایە کە مەسەلەکە خۆکوژی بێت، بەڵام کە ئەگەری تاوان لەبەرچاو بگرین، لەو حاڵەتەدا تاقە شیمانەیەك هەیە: یەکێك حەبێکی ژەهراوی، بە هەمان ڕەنگ و شێوەی حەبە ئازارشکێنەکان خستۆتە ناو شووشەکەوە"

دکتۆر سکریتا وتی: "داوای لێبوردن ئەکەم کە من بە پێچەوانەی ئێوەوە بیردەکەمەوە، گۆڕینی تفتی بە حەبێکی ڕێکوپێك کارێکی هەروا ئاسان نییە، تەنیا کەسێك ئەتوانێت ئەوە دروست بکات کە لە کارگەی حەب دروستکردندا دەستی هەبێت، لەم دەوروبەرەیشدا هیچ کەسێکی لەو بابەتە نییە"

"دەتەوێت بڵێیت نابێت کەسێك لەم ناوەدا هەبێت کە حەبێکی لەوجۆرە دروست بکات؟"

"ناڵێم هەر نابێت. بەڵام تا بڵێی کارێکی گرانە"

لێکۆڵەرەوە وتی: "بۆ مەبەستی من، ئەوە بەسە کە شیمانەیەکی وا هەبێت" و لەسەری ڕۆشت "ئێستا لێگەڕێن مەسەلەکە وا شەن و کەو بکەین کە دەبێت کێ بەرژەوەندیی لە مردنی ئەم کچەدا هەبێت. ئەو کچە دەوڵەمەند نەبووە، کەواتە دەتوانین هۆکاری چاوچنۆکی و تەماع بخەینە ئەولاوە، ئەنگێزەی سیاسی و سیخوڕییش هەر بخەنە لاوە، ئەوەی دەمێنێتەوە هۆکاری شەخسی و تایبەتین. ئێستا ئەوەی ئێمە گومانی لێ بکەین دەبێت کێ بێت؟ لە پێش هەموو کەسێکدا عاشقەکەی، کە ڕێك لە پێش مردنیدا، مشتومڕێکی زۆر تیژیان لە بەینا بووە، ئایا تۆ بۆ ئەوە دەچیت کە ئەو ژەهری دەرخواردی ڕۆزینا دابێت؟"

کەس وەڵامی لێکۆڵەرەوەکەی نەدایەوە، ئەو لەسەر قسەکانی ڕۆشت "من وای بۆ ناچم، ئەو کوڕە هێشتا شەڕی مانەوەی کچەکەی دەکرد، دەیویست بیخوازێت، ڕۆزینا کۆرپەی ئەوی لە سکدا بوو، تەنانەت ئەگەر منداڵەکە هی

یەکێکی تریش بوو‌بێت، گرنگ ئەوە بوو ئەو کوڕە لەوە دڵنیابوو کە منداڵی خۆیەتی، لەو چرکە ساتەدا کە زانی ڕۆزینا دەیەوێت منداڵەکە لەباربەرێت تەواو نائومێد بوو، بەڵام حەز ئەکەم ئەوەتان لەبەرچاو بێت کە ڕۆزینا لەدوای کورتاژ کردنەوە نەگەڕابوەوە بەڵکو لە کۆبوونەوەی لیژنەی بەرپرسیارەوە گەڕابووەوە. بە نیسبەت کەسە نائومێدەکەوە هێشتا هەمووشتێکی لە دەست نەچووبوو، هێشتا منداڵەکە زیندوو بوو، لاوەکە ئامادە بوو بۆ هێشتنەوەی هەرکارێك بکات، گەوجییە وا بیربکەینەوە ئەو کوڕە کە ئەمەندە شەیدای خواستنی ڕۆزیناو بە باوك بوونی منداڵەکە بووبێت، ژەهری دابێتێ، بێجگە لەمە، دکتۆر سکریتا ئەوەی بۆ ڕوونکردینەوە بۆ یەکێکی ئاسایی بە دەستهێنانی ژەهرێك کە شێوەی حەبێکی ڕاستیی هەبێت کارێکی ئاسان نییە، ئەم کەسە، ئەم کوڕە سادەو بێ ئەزموونە کە هیچ پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی نییە، چۆن دەتوانێت شتێکی وا دەست بخات، کەس دەتوانێت ئەمەم بۆ ڕوون بکاتەوە؟"

بارتلیف کە لێکۆڵەرەوەکە هەمیشە دەگەڕایەوە سەر ئەو شانی هەڵتەکاند.

"زۆرچاکە، ڕێگام بدەن باس لە گومانەکانی تریش بکەم، ترومپیت ژەنەکەی شاریش لە ئارادایە، ئەو چەندمانگێك پێشتر دۆستایەتی لەگەڵ کۆچ کردوودا هەبووە، ئێمە نازانین چەندە پەیوەندییەکەیان کۆك بووەو هەرگیزیش نایزانین. بەهەرحاڵ، ئەوەندە لەگەڵ خوالێخۆشبوودا دۆستایەتیان پەیداکردبوو کە ئەو هەست بە دڵنیایی بکات و داوای لێبکات خۆی بە باوکی منداڵەکەی دابنێت و، لەگەڵیا ئامادەی لای لیژنەی منداڵ لەباربردن بێت. بۆ ئەوی پەسەندکرد بۆ ئەو مەبەستەو پیاوێکی خەڵکی ئێرەی دانەنا؟ دەرکی ئەمە ئاسانە، هەموو پیاوە ژندارەکانی ئەم ناوچەیە لەوە دەترسان بەهۆی پروپاگەندەیەکی لەو جۆرەوە خۆیان تووشی سەرئێشەی لای ژنەکانیان بکەن،

تەنیا کەسێك دەتوانێت ئەمە بکات لە ناوچەیەکی دوورەوە هاتبێت. بێجگە لەمە، سستەرەکەیش ئەوەی پێ خۆشبووە کە منداڵەکەی سکی وەك منداڵی هونەرمەندێکی بەناوبانگ ناوزەد بکرێت، پێ ناچێت ئەوەیش ببێتە پەڵەیەك بەسەر ناوبانگی ترومپیت ژەنەکەوە، بۆیە دەتوانین ئەگەری ئەوە بکەین کە جەنابی کلیما لە ئەنجامدا دوودڵی لەو هاوکارییە نەکردووە، کەواتە چۆن دەبێت ئەو سستەرەکەی کوشتبێت؟ هەر بەوجۆرەیش کە لە پێشدا دکتۆر سکریتا پێی وتین، ئەوە زۆر دوورە جەنابی کلیما باوکی ڕاستەقینەی منداڵەکە بێت، بەڵام هەر تەنیا بۆ باسکردن با لەم شیمانەیەیش بکۆڵینەوە. با ئێمە گریمانەی ئەوە بکەین کە کلیما باوکی منداڵەکەیەو ئەمەی زۆر پێ ناخۆشبووە، باشە پێم بڵێن ئەوێك کە قایل بە فرێدانی منداڵەکە بووەو بەڕەسمیی کاری بۆ کردووە بۆ بیەوێت ئەو کچە بکوژێت؟ جەنابی بارتلیف، چ بەڵگەیەکمان بە دەستەوە هەیە کە کلیما بە پیاوکوژ دابنێین؟"

بارتلیف لەسەرخۆ پێی وت: "تۆ لە مەبەستەکەم تێ ناگەیت، من نامەوێت کەس بەرمە پای سێدارە، تەنیا ئەمەوێت ڕۆژینا لەو تۆمەتە بەدوورخەم، چونکە خۆکوشتن لە تەواوی گوناهەکانی گەورەترە، تەنانەت ناخۆشترین ژیان دەشێت بەهایەکی شاراوەی خۆی هەبێت و، تەنانەت ژیان لەسەرە مەرگیشدا بۆی هەیە جوان بێت. ئەو کەسەی ڕووی مەرگی نەدیوە بەمە نازانێت، بەڵام من جەنابی لێکۆڵەرەوە، ئەمە دەزانم، بۆیە جەخت لەسەر ئەوە دەکەم کە تەواوی هێزو توانام بۆ سەلماندنی بێ تاوانیی ئەو کچە بەخت دەکەم"

لێکۆڵەرەوەکە وتی: "منیش لەگەڵتام، بڕوابکە، تێکڕا، گومانێکی سێیەمیش هەیە کە شایانی لێکۆڵینەوەیە: جەنابی بارتلیف، بازرگانە ئەمریکاییەکە، وەك خۆی دانی پیاناوە، خوالێخۆشبوو دواشەوی ژیانی لەگەڵ ئەودا گوزەراندووە، ڕەنگە بڵێن هەرگیز پیاوکوژ لەخۆیەوە زانیارییەکی وا

نادرکێنێت، وەلێ ئەم قسەیە ڕاست نییە، جەنابی بارتلیف لە کۆنسێرتێکی زۆر ئاپوورەدا لەپاڵ ڕۆزینادا دانیشت و هەموویش ئاشکرا بینییان کە پێکەوە لەوێ چوونە دەرێ، جەنابی بارتلیف لەوە دەگات لە حاڵودۆخێکی وادا چاکترە خۆی دان بەڕاستیەکاندا بنێت، جەنابی بارتلیف پێی وتین ئەوشەوە خۆشترین شەوی ڕۆزینا بوو، جا بۆ وا نەبوبێت؟ جەنابی بارتلیف نەك تەنیا پیاوێکی سەرنج ڕاکێشە، بەڵکو لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە بازرگانێکی ئەمەریکاییە بە دنیایەك دۆلارو گوزەرنامەیەکی ئەمریکییەوە کە هەموو دنیای پێدەگەڕێت. ڕۆزینا لێرە، لەم شوێنە بچووکەدا بەتەنگ هاتووەو بەلەقاژەی هەلاتنیەتی، کوڕێکی هاوڕێی هەیە دەیەوێت بیخوازێت، وەلێ کوڕەکە میکانیکیەکی خەڵکی ئێرەو بێ ئەزموونە، ئەگەر شووی پێبکات دەبێت تاماوە لێرە زیندانی بێت و ئومێدی دەربازبوونی هەرگیز نابێت، کەسیشی لێرە نییە، بۆیە دۆستایەتی لەگەڵ میکانیکیەکەدا هێشتەوە، بەلام بەڵێنی تەواوی نەدابوویە، چونکە نەیدەویست ڕێگا لە هەموو ئومێدەکانی خۆی بگرێت، کەچی لە پڕێکدا پیاوێکی عاقڵ و مەزنی بۆ پەیدا دەبێت کە هەستوهۆشی دەبات، دەکەوێتە نێو ئەو خەونوخەیاڵەوە کە ئەو پیاوە دەیخوازێت و دەیباتە ولاتێکی دوورتر، ئەو کە لە سەرەتادا دڵدارێکی ئاسایی بوو وردە وردە پێی داگرت، پێی وت کە هەرگیز دەستبەرداری نابێت و کەوتە هەڕەشە لێکردنی، بارتلیف ژنی هەیەو دەزانم سبەی لە ئەمریکاوە دەگاتە ئێرە. ئەوەی تا ئێرە بیزانم، هاوسەرەکەی خۆی، واتا دایکی کوڕە منداڵەکەی، زۆر خۆش دەوێت، بارتلیف بۆ ئەوەی ئابڕووی نەچێت ئامادەی کردنی هەموو کارێك بوو، ئەو دەیزانی ڕۆزینا ئاسایی شووشەیەك حەبی ئازار شکێنی هەیەو دەیشیزانی شێوەی حەبەکان چۆنە، ئەو پیاوێکی دەوڵەمەندەو پەیوەندییەکی فراوانی لەگەڵ دەرەوەی ولاتدا هەیە، بۆ ئەو زۆر ئاسانە

یەکێکی هەبێت حەبێکی ژەهرینی لەوشێوە حەبە ئازار شکێنەی ڕۆزینای بۆدروست بکات، لەوشەوە قەشەنگەدا، کاتێك کە دڵدارەکەی لە شیرین خەودایە، زۆر بە هێوری حەبە ژەهراوییەکەی بۆ دەخاتە ناو شووشەی دەرمانەکەیەوە"

لێکۆڵەرەوەکە بەجۆرێکی سەرنج ڕاکێش دەنگی هەڵبڕی: "جەنابی بارتلیف، من بڕوام وایە تۆ تاقە کەسێکیت کە هۆیەکت بە دەستەوە بێت بۆ کوشتنی ڕۆزینای سستەرو هەر تۆیشی کە بتوانیت کارێکی وا ئەنجام بدەیت. داوات لێدەکەم دانی پێدا بنێیت"

ژوورەکە بێدەنگ بوو، لێکۆڵەرەوەکە ڕێك چاوی لە چاوی بارتلیف بڕیو، ئەویش بە هێوری و لەسەرخۆ وەڵامی تێڕامانەکەی ئەوی دایەوە، دەموچاوی نە شڵەژانی پێوە دیاربوو نە تووڕەیی، پاشان وتی:

"سەیرم لە ئەنجامگیریەکەت نایەت، تۆ کە نەتوانیت بکوژەکە بدۆزیتەوە، دەبێت یەکێك پەیدابکەیت تاوانەکەی لە ئەستۆ نێیت، ئەمەیش یەکێك لەڕازونیازەکانی ژیانە کە بێتاوانەکان گوناهی تاوانبارانیان لە گەردن دەنرێت، ئەگەر ناچاریت، بمگرە"

—22—

بەیانییەکی خۆش و ئاسوودە دنیا سەوزەکەی دەرەوەی شاری لە ئامێز گرتبوو. یاکوب لە گوندێکدا کە تەنیا چەند کیلۆمەترێك لە سنوورەوە دووربوو وەستا، حەزی کرد تامی مانەوەی دواچرکە ساتەکانی لە وڵاتەکەیدا بچێژێت، لە ئۆتۆمبیلەکەی دابەزی و بە شەقامە درێژەکەی گوندەکەدا کەوتە گەڕان.

شەقامەکە نە جوان و نە سەرنج ڕاکێش بوو، خرتکەوپرتکەی ژەنگاوی و تایە کۆنی تراکتۆر لەو ناوەدا کەوتبوو، گوندێکی فەرامۆشکراوو بێزراو بوو، یاکوب بیری کردەوە ئەو کەرەسە ژەنگاویانە لەو وشە ناشیرین و دزێوانە دەچێت کە شوێنی لە دایکبوونەکەی وەك ماڵئاوایی لێکردن لێی باردەکات. شەقامەکە بە مێرگێك کۆتایی دەهات، لە ناوەڕاستیا گۆماوێکی بچووکی فەرامۆشکراوی بەقەوزە داپۆشراو هەبوو، چەند قازێکی نزیك بە کەناری گۆماوەکە شڵپەشڵپیان دەکردو، منداڵێك بە شووڵێکەوە دەیویست لە ئاوەکەیان وەدەرنێت.

یاکوب لە گەڕانەوەیدا بەرەولای ئۆتۆمبیلەکە چاوی بە منداڵێك کەوت لە پشت پەنجەرەی ماڵێکەوە وەستابوو، منداڵەکە کە هێشتا پێنج ساڵی پڕ نەکردبووەوە لە شووشەی پەنجەرەکەوە لە گۆماوەکەی دەڕوانی، ڕەنگە تەماشای قازەکانی کردبێت. یان تەماشای ئەوکوڕەی کردبێت کە بە شووڵەکەی دەستی بە قازەکانیا دەکێشا. یاکوب چاوی لێ نەتروکاند، دەموچاوێکی تەواو منداڵانەی پێوەبوو، وەلێ ئەوەی سەرنجی یاکوبی ڕاکێشا چاویلکەکەی بوو، منداڵەکە چاویلکەیەکی گەورەی لەچاودابوو کە بێگومان زەرەبینەکانی ئەستووربوون، سەری منداڵەکە بچووك و چاویلکەکەی زۆر گەورە بوو، وەك شیشی زیندان، وەك چارەنووس بارێکی گرانی پێهەڵگرتبێت وابوو، لەنێوان شووشەکانەوە تەماشای دەکرد، دەتوت لەنێوان شیشی بەندیخانەیەکەوە کە حوکمی ئەبەدی تیادراوە تەماشای دەرەوە دەکات، یاکوب تەماشای چاوی منداڵەکەی کرد و هەستی کرد هەموو گیانی پڕبووە لە خەمێکی گەورە.

ئەم هەستە وەك پەلامارێکی لەناکاوی ئاوبوو لە شکاندنی بەستێکدا، ساڵانێك بوو یاکوب بەم ڕادەیەی ئێستای هەستی خەمخواردنی نەجووڵابوو،

ئەو تاڵی و نائومێدیی چەشتبوو، بەڵام خەم نا، کەچی وا لە پڕا هێرشی هێناوەو ئەمیش توانای هیچ بەرگرییەکی نییە.

منداڵەکەی بینی لە زیندانەکەیدا ماندووە، دڵی بۆ منداڵەکەو بۆ هەموو وڵاتەکەی سووتا، هەستی کرد نکووڵیەکی بەرانبەر بە وڵاتەکەی هەیە، خۆشەویستیەکی وای بۆ نەبووەو، هەر ئەو کەم خۆشەویستیەیشە وا ئازاری دەگەیەنێتێ.

پاشان وای بە بیردا هات ئەوە فیزو لەخۆبایی بوون بووە نەیهێشتووە وڵاتەکەی خۆش بوێت، لەخۆبایی بوونێك هۆیەکەی ڕەسەنایەتیو جوانی بووە، لە خۆبایی بوونێکی دەبەنگانە ببووە هۆی ئەوەی هاوجۆرەکانی خۆی خۆش نەوێت و نەفرەتیان لێ بکات، چونکە وەك بکوژێك لێی دەڕوانین، جارێکی تر ئەوەی بیرهاتەوە کە ژەهری بە کەسێکی غەریب داوەو خۆیشی هەر مرۆڤ کوژە، ئەو بکوژەو لەخۆبایی بوونەکەیشی لە گۆڕدایە، ئەو ببووە یەکێك لەوان، برای هەموو ئەو بکوژانەی کە پەشیمانن.

منداڵە چاویلکە لە چاوەکە وەك پەیکەرێکی بەردین هەر لەپاڵ پەنجەرەکەدا وەستابوو، هێشتا لە گۆماوەکەی دەڕوانی، یاکوب وای بە بیردا هات کە ئەم منداڵە چ ڕەنج و ئازارێکی بە کەس نەگەیاندووەو کەچی هەتا ماوە باری گرانی چاوکزییەکەی خراوەتە ئەستۆ، بیری کردەوە کەسانێك لەبەرشتێك کە دەستی خۆیانی تیا نییە، شتێکیان بە زگماکی بۆماوەتەوەو وەك فەرمانێکی قورس بەسەریاندا سەپێنراوە، ڕق و کینەیان لا دروست دەبێت. هەروەها خۆیشی بۆی نییە بانگەوازی ڕەسەنایەتی بۆخۆی بکات، **چونکە گەورەترین ڕەسەنایەتی لە خۆشویستنی خەڵکیدایە، تەنانەت ئەگەر پیاوکوژیش بن.**

بیری لە حەبە شین باوەکە کردەوەو وای هاتە بەرچاو کە ئەو حەبەی دای بەو سستەرە پەیامێك، داواو خوازیارێك بووە داویەتە کەسانێکی ئاسایی تا بچێتە ڕیزیانەوەو ئەوانیش وەری بگرن، ئەگەرچی هەمیشە ئەوەی ڕەت کردۆتەوە کە ببێتە یەکێك لەوان.

خێرا بەرەو لای ماشێنەکەی گەڕایەوە، دەرگای کردەوە، لەپشت سوکانەوە دانیشت و بەرەو مەرزی ئاژووت. ڕۆژی پێشتر وای بیرکردەوە کە ئەمە چرکەساتی ڕزگاربوونیەتی، لە بەجێهێشتنی ئێرەدا شادمان دەبێت، ئەو جێگایەی بە هەڵە تیا لەدایکبووەو وڵاتی ئەونییە بەجێیدێڵێ. بەڵام ئێستا دەزانێت کە ئەمە تاقە نیشتمانی ئەوەو، بێجگە لێرە هیچ وڵاتێکی تری نییە.

—23—

لێکۆڵەرەوەکە وتی: "ئومێد مەبرە، بەندیخانە نابێتە خاچی پیا هەڵواسینت. دەرگا مەزنەکانی لەسەر تۆ ناکرێنەوە، من تەنانەت بۆ چرکە ساتێکیش بیرم لەوە نەکردۆتەوە تۆ کچەکەت کوشتبێت، تەنیا لەبەرئەوە تۆمەتبارم کردیت بۆچوونەکەت بە نادروست بزانیت کە گوایا ئەو کچە کوژراوە"

بارتلیف بە دەنگێکی ئاشتیخوازانەوە وتی: "شادمانم کە تۆمەت بارکردنەکەمت بەڕاستیی نەبوو، تۆیش لەسەر هەقیت، من دەبەنگ بووم کە دەمویست بڕیاری بێ تاوانیی ڕۆزینا لە تۆ وەربگرم"

دکتۆر سکریتا وتی: "خۆشحاڵم بە پێکهاتنەکەتان، هیچ نەبێت ماتەمینیەکمان لەپێشدایە: مەرگی ڕۆزینا هەر چۆنێك بووبێت، دوا شەوی شەوێکی قەشەنگ بووە"

بارتلیف وتی: "لە مانگ بڕوانن، هەروەك دوێنێ شەو لە ترپفەدایە، ئەم ژوورەی کردۆتە باخچەیەك، پێش کەمتر لە بیست و چوار سەعات، هێشتا ڕۆزینا وەك شای پەریان لەم باخەدا حوکمی دەکرد"

دکتۆر سکریتا وتی: "بەڕاستیی با ئەوەندەیش جەخت لەسەر دادپەروەری نەکەین، دادپەروەری شتێکی مرۆڤایەتیانە نییە، دادپەروەری یاسای کوێر و زاڵمانەی هەیە، دەشێت دادپەروەریەکی مەزنتر هەبێت، بەڵام من پێی نازانم، بەردەوام وام هەست کردووە کە لە دەرەوەی دادپەروەرییەوە ژیاوم"

ئۆلگا بەسەرسووڕماوییەوە پرسی: "مەبەستت چییە؟"

دکتۆر سکریتا وەڵامی دایەوە "دادپەروەری میانەی لەگەڵ مندا نییە، دادپەروەری شتێکە لە دەرەوەی من و لە منیش باڵاترە، هەر چۆنێك بێت، شتێکی نائینسانییە، هەرگیز لەگەڵ ئەو هێزە قێزەونەدا هاوکاری ناکەم"

ئۆلگا بایدایەوە "دەتەوێت بڵێیت هیچ نرخێکی دنیای شموولیت قبووڵ نییە؟"

"ئەوانەی نرخیان بۆ دادەنێم چ پەیوەندییەکیان بە دادپەروەرییەوە نییە"

ئۆلگا پرسی: "وەکو چیی؟"

دکتۆر سکریتا بە هێوری وتی "بۆ نموونە، هاوڕێیەتی"

هەموو بێدەنگ بوون و لێکۆڵەرەوە هەستا بڕوات، لەو کاتەدا بیرێك بە زەینی ئۆلگادا تێپەڕی، پرسی "بەڕاست حەبەکەی ڕۆزینا ڕەنگی چۆن بوو؟"

لێکۆڵەرەوە وەڵامی دایەوە "شینێکی کاڵ" پاشان وەك بایەخەکەی زیندوو بووبێتەوە، لەسەری ڕۆشت "بەڵام بۆ دەپرسیت؟"

ئۆلگا لەوە ترسا لێکۆڵەرەوەکە بۆچوونەکەی خوێندبێتەوە، بۆیە هەوڵیدا پرسیارەکەی بێ بایەخ پیشان بدات "ئاه، بەڕێکەوت شووشەیەك حەبم لە جانتاکەیدا بینی، ئیتر نازانم ئەوە هەمان ئەو شووشەیە بێت..."

لێكۆڵەرەوە بیری نەخوێندبووەوە، شەكەت بوو ماڵئاوایی لەوان كرد. دوای ڕۆشتنی لێكۆڵەرەوە، بارتلیف بە سكریتای وت: "ژنەكانمان زوودەگەنە بەرەوە، نایەیت بچینە وێستگەكە بۆلایان؟"

دكتۆر سكریتا بە نیگەرانیەوە وتی: "بابچین، دەبێت ئەمشەو لە دەرمانەكەت دووقات بخۆیت"

بارتلیف لە ژوورەكەی تەنیشتا ونبوو، ئۆلگا بە سكریتای وت: "تۆ حەبێكی ژەهراویت دابوو بە یاكوب، حەبێكی شین باو بوو، هەمیشەیش لە گیرفانیا بوو، ئەمە دەزانم"

دكتۆر سكریتا زوو بنبڕی كردو وتی: "قسەیەكی بێ مانایە، هیچ كاتێك شتی وام پێ نەداوە"

لەوساتەدا بارتلیف لە ژوورەكەی ترەوە گەڕایەوە، بۆینباخێكی تازەی بەستبوو، ئۆلگایش ماڵئاوایی لە هەردوو پیاوەكە كرد"

—24—

بارتلیف و دكتۆر سكریتا بە درێژایی گەشتگا بە سپیدار ڕازاوەكە هەنگاویان بەرەو وێستگەی شەمەندەفەر دەنا.

بارتلیف وتی "تەماشای مانگ كە، باوەڕت بێت عەسرو دوێ شەو كە پێكەوە بەسەرمان برد بەڕاستیی سەرسووڕمێن بوو"

"بڕوات پێدەكەم، وەلێ نابێت ڕوو لە مەترسی وا بكەیت، كاری وا سامناك گەلێك مەترسیی گەورەی بۆ تۆ لەدواوەیە"

بارتلیف وەڵامی نەدایەوە، بە ڕوویەوە هەواو فیزێكی شادی بەخش دەدرەوشایەوە.

دكتۆر سكریتا وتی: "پێدەچێت زۆر دڵ خۆش بیت"

"ڕاست ئەڵێیت، ئەگەر توانیبێتم دوا شەوی ژیانم خۆش کردبێت هەقی خۆمە خۆشحاڵ بم"

لەپڕا دکتۆر سکریتا وتی "دەزانیت، دەمێکە دەمەوێت داواکارییەکم هەیە لێتی بکەم و تا ئێستا پێم نەوتویت، چونکە نەموێراوە، بەلاّم لەوە دەچێت ئەمڕۆ شتێکی زۆر سەیر ڕوویدابێت کە بوێرم بیڵێم"

"دکتۆر سکریتا، تکایە بەردەوامبە"

"حەز ئەکەم بمکەیتە کوڕی خۆت"

بارتلیف بەسەرسامییەوە وەستاو دکتۆر سکریتا کەوتە باسکردنی پاساوی داواکەی.

بارتلیف وتی "دەزانیت من هەموو شتێك بۆ تۆ دەکەم، وەلیٚ نازانم ژنەکەم چی دەڵێت، ڕەنگە بە کارێکی گەوجانەی بداتە قەڵەم، ئەو پانزە ساڵ لە کوڕەکەی بچووکتر دەبێت، ئایا ئەمە گرفتێکی یاسایی لیٚ ناکەوێتەوە؟"

"هیچ برگەو مەرجێکی یاسایی ئەوەی نەوتووە کە دەبێت منداڵی هەڵگیراوە لەدایك و باوکی بچووکتربێت، هەر چۆنێك بێت، کوڕی هەڵگیراوە کوڕی ڕاستەقینە نییە، بەڵکو ناوی خۆی بە خۆیەوەیەتی، منداڵی هەڵگیراوە"

"تەواو دڵنیایت؟"

دکتۆر سکریتا بە کەمێك شەرم و بێ دەسەلاّتییەوە وتی "دەمێکە ئەم مەسەلەیەم لەگەڵ کەسانی یاساناسدا باسکردووە"

بارتلیف وتی "بڕوانە، ئەم تا ڕادەیەك نائاساییەو کەمێك منی وەستاندووە، بەلاّم من ئەمڕۆ لێوان لێوم لە شادیو، حەز ئەکەم هەموو کەسێکی ئەم جیهانە خۆشحاڵ بکەم، جا ئەگەر ئەم کارە بەڕاستی شادمانت دەکات.. کوڕم..."

هەردووکیان لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا یەکتریان لە باوەش گرت.

## -25-

ئۆلگا لەسەر جێگاکەی ڕاکشابوو "ڕادیۆی ژوورەکەی تەنیشتی دەنگی لێوە نەدەهات" لەوە دڵنیابوو کە یاکوب ڕۆزینای کوشتووەو تەنیا خۆی و دکتۆر سکریتا ئەمە دەزانن، هەرگیز لەوە نەدەگەیشت کە یاکوب بۆ ئەمەی کردووە. لە تاوا موچڕك بە گیانیا دەهات، پاشان لەوە گەیشت (وەك ئەزانین ئەو زۆر چاك ئاگاداری خۆی دەکرد) کە ئەو مووچڕکە بەتامەو، ئەو ترسەیش پڕە لە لووت بەرزی.

شەوی پێشوو، کاتێك بە خۆشیەوە لەگەڵ یاکوبدا جووت بووە، زەینی پیاوەکە ئاسایی پڕبووە لە بیری زۆر سەیر، بۆیە، ئەو بیرانە ببوون بە بەشێك لە بوونی.

لەخۆی پرسی بۆ ئەم مەسەلەیە ناڕەحەتم ناکات؟ بۆ نەیدەمە دەست پۆلیس (هەرگیز ئەوە ناکەم)؟ ئایا منیش لە دەرەوەی دادپەروەرییەوە ژیان بەسەردەبەم؟

بەڵام هەر لەو کاتەدا کە بەردەوامیی بەخۆناسینەکەی دەدا، هەستێکی زۆری بەو فیزو لووت بەرزییە بەتامە دەکرد.

## -26-

شەمەندەفەرەکە گەیشتە وێستگەکە و دوو ژنی لێ دابەزین. تەمەنی یەکەمیان لە دەوروبەری سی و پێنج ساڵیا بوو، دکتۆر سکریتا ماچی کرد، دووەمیان کە گەنجتر بوو، بەرگێکی شیك لەبەردا و منداڵێکی بە باوەشەوە بوو، بارتلیف ماچی کرد.

دکتۆر سکریتا وتی "لێگەڕێ کۆرپە چکۆلەکەتان ببینم، ئەمە یەکەم بینینی ڕاستیمە"

خانمی سکریتا پێکەنی: "ئەگەر باش نەمناسیتایە تۆمەتی ناپاکیم دەدایە پاڵت، ئێرەی تەماشا بکە، سەرلێوی، خاڵەکەی تەواو لەو شوێنەدایە کە تۆ هەتە"

خانمی بارتلیف بە وردی لە سەروچاوی سکریتا ڕاماو هاواری کرد "ڕاستە، لە هەموو ئەم ماوەیەدا کە لە ئاوەکانزاییەکاندا بووم، هەرگیز سەرنجی ئەوەم نەداوە"

بارتلیف وتی: "ئەمە ڕووداوێکی هێند ئاوارتەیە کە دەتوانم ناوی موجیزەی لێ بنێم دکتۆر سکریتا کە تەندروستی بە ژنان دەبەخشێت فریشتەیەکە بۆخۆی، نیشانەی فریشتایەتی خۆی لەسەر ئەو منداڵانە دادەنێت کە هاوکاریی هێنانە دنیایان دەکات، بۆیە ئەوە نیشانەیەکی ئاسایی نییە، بەڵکو نیشانەی فریشتایەتییە"

ڕوونکردنەوەکانی بارتلیف هەموویانی دڵخۆشکردو کەوتنە پێکەنین.

بارتلیف ڕووی لە هاوسەرە جوانەکەی کرد: "بێجگە لەمە، وا هەرلێرەدا بە ڕەسمی بانگەشەی ئەوە دەکەم کە دکتۆر سکریتا لە چەند دەقیقەیەك لەمەوپێشەوە بوو بە برای جۆنی چکۆلەمان، لەبەر ئەوە تەواو هەقی خۆیەتی کە وەك دووبرا نیشانەیەکی هاوبەشیان هەبێت"

خانمی سکریتا هەناسەیەکی شادمانیی هەڵکێشاو ڕووی لە مێردەکەی کرد:

"ئاخری هەر کارەکەت کرد..."

خانمی بارتلیف وتی: ""من هیچ سەری لێدەرناکەم، تکایە زیاتر بۆم ڕوون بکەنەوە"

بارتلیف بەدەم دەستگرتنی ژنەکەیەوە وتی: "هەموو شتێکت بۆ ڕوون دەکەمەوە، ئەمڕۆ زۆرمان قسە هەیە پێکەوە بیکەین، زۆرشتمان هەیە ئاهەنگی

بۆ بگێڕین، پشوویەکی گەلێك قەشەنگی کۆتایی هەفتەمان لە پێشدایە" ئەوسا هەرچواریان بەرەو کۆتایی شۆستە چراخانەکە چوون و زوو وێستگەکەیان بەجێهێشت.

*     *     *

1-Olda.

2 –راسکولینکوف: قارەمانی ڕۆمانی "تاوان و سزا"ی فیودور دوستۆیفسکییە. –و.

**سەرنج:**

***ناونیشـــانە فارســـییەکەی ڕۆمـــانی ئاهـــەنگی ماڵئـــاوایی (مـــهمانی خداحافظی)یە، فروغ پوریاوەری لە دەقی ئینگلـیزی** The Fairwell Party **وە کردوویەتی بە فارسی، بنکەی بڵاوکردنەوەی گیل لە تاران چاپی سێیەمی لە ساڵی** (2000) **دا بڵاوکردۆتەوە.**

**سوپاس**

***سـوپاس بـۆ هـاوڕێی ئـازیز و دوورە وڵاتم مامۆسـتا م. ئـارام کـە لـە ئەڵمانیاوە فاکسێکی بۆ ناردم و چەند زانیارییەکی تازەی لەسـەر ڕۆمانەکە دامێ.**

***سـوپاس بـۆ هـاوڕێی خۆشەویسـتم کـاك ئـاوات ئەحمـەد کـە لـە ئینسکلۆپیدیای بەریتانییەوە چـەند زانیارییـەکی دەربـارەی ژیـانی تایبـەتی کۆندێـرا بـۆ وەرگـێڕام. هاوکـاریی ئـەو دوو هاوڕێیـەم کـەڵکی بـۆ نووسـینی پێشەکییەکەم هەبوو.**